# سەردەم

کۆڤاریکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

ژمارە (6) ك1. 1999 – ساڵی یەکەم





ناونیشان:

سلێمانی فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 00873 761 477 268 – 00873 682 040 391

Fax: 00873 682 040 392 -- 00873 761 477 269



بەرگ: ئۆفسێتی دلێر

سەرەوە

ژمارە (6) ک1. 1999 ساڵی یەکەم

# مۆمێك لەگەڵ بادا

بەدەرچوونی ژمارە (6)، گۆڤاری سەردەم کۆتایی بەساڵێك لەتەمەنی خۆی دێنێت، ئەگەرچی ساڵێکی تەمەن لەوە زووترە بکرێتە بنە بۆ ئومێد لەسەر بنیات نانو ئاواتو خەونی گەورەی ئاینده، بەتایبەت لەوڵاتێکی وەك ئێستای خۆمانداو بەگشتی لەخۆرهەڵاتدا، ئەمەیش بەهۆی ئەو ناسەقامگیریەی لەبیردا هەیە کە کاریگەریەکی راستەوخۆی لەسەر پلانو نەخشەو پرۆژەی هەموو بوارەکانی ژیان هەیەو، خۆرهەڵاتیش وەك ئەدوارد سەعید دەڵێت: ناوچەی بێ بەرنامەی ژیانو نەخشەی ئاییندەیە. بۆیە مانەوەی زۆربەی هەرەزۆری ئەو کارانەو ئەنجامدانیان پەیوەندی بە ئارەزووی تایبەتی کەسێك، لایەنێكو بۆ قۆناغێکە نەك ستراتیژێك بن کە لەسەربنەمای دروست کردنی ئاییندەو وابەستەیی بەنەریتێکی دەوڵەمەندی دێرینەوە. بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە باس لەو دیاردانە نەکەینو رێگای ئەوەیشمان لێ ناگرێت بەساڵێك تەمەنی خۆماندا نەچینەوەو، کارەکانمان نەکەینە مەحەکی ئەزموونەکان (ئەگەرچی هەر لەم خۆرهەڵاتەداو بەتایبەت لای گەلێکی وەك کورد هەمیشە ئەزموونەکان لەیادکراونو ئەم بەخۆدا چوونەوەیەیش لەپەراوێزدا بووە، بۆیە کاریگەریان لەسەر ئاینده نەبووە) بەداخەوە ئەم راستیە هەمیشە لەکۆیادی ئێمەدا ئامادەو بەرجەستەیە.

رەنگە ئێستا لەکوردستانی لای ئێمەدا دەرکردنی گۆڤارێك لەوە ئاسانتر بێت کە نووسەرێك دوو ژووری هاکەزایی بەکرێ دەستکەوێت. بەتایبەت کە مەسەلەکە هاتبێتە سەر ئەوەی چەند شیعرو چیرۆكو وتارێکی کاڵو کرچ قلپ کەیتە ناو بەرگێکی قەشەنگەوەو بێهەست بەلێپرسینەوەو بەراوردو تاووتوێ کردن بانگەوازی گۆڤاری بۆ بکەیت. بێگومان ئەم زۆریە لەبەر ئەوە نیە کە هەندێك لەو کەسانەی باڵادەستی بەجێ هێنانی ئەم کارەنو چرای سەوز بۆ هەرناشیو پەراوێزێك دادەگیرسێنن بەتەنگ گەورەیی پرۆسەکەوەن، لەئەرکە گرنگو سامناکەکەی تێ گەیشتوونو، دەیانەوێت بەئاسان کردنی ئەم رێگا سەختە هەموو کونو قوژبنێکی ئەم وڵاتە پڕ بکرێت لەچاپەمەنیو هەموو کەسێك بەدوای کلتووری خۆیەوە بێت. بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیانە کە لە نائاگایی ئەو باڵادەستانەدا راستیەك رەنگی داوەتەوە کە ئەوەی بەدرێژایی چەند ساڵێك لێی تەریك بووینو زمانی پێچەوانەکەیمان پیادە دەکرد ئێستا کاتی ئامادەبوونیەتی، بەزاراوەکەی فرۆید: دابین کردنی ئارەزووی لەبری دانانە. بۆ ئەمە دەبێت هەرکەس لای خۆیەوە —وەك کەسایەتی- ئامادەگی هەبێت، ئامادەگی جاران لەنەبەردی چیادابوو، یان لەو تاك گەراییەی کەناوبانگی پێ دەردەکرد، ئێستا لەپەیڕەوکردنی عەقڵی شاردایە، عەقڵی شاریش واتا ژیاریو بەشێکی

ژیاریش رووناکبیریە. لای ئێمەوە ئەگەر ئەمە پرۆژەیەکی کردەیی بێتو لەقەناعەتەوە سەرچاوەی گرتبێت، یان گرێی ئەو لایەنە دەروونیە بێت کە ئاشکرا نیە دەست خۆشی لێ دەکەین، چونکە بەهەردوو بارەکەدا هەر زمان بالادەستەو زمانیش سیستمێکی بالایە لەکاریگەری کلتووردا، کە دەولەمەندی زمان لەقۆناغی دابو نەریتو دیاردەی کۆمەلایەتیەکانەوە سەری کێشایە ناو ئامرازەکانی کلتوور ئیتر پێکهاتە زبریەکەی لەدەست دەداتو دەبێتە زمانی سەردەمو بەجێ هێنانی ئەرکە شارستانیەکان. بۆیە ئەوەی ئێستا گرنگە مانەوەو بەردەوام بوونی پرۆژە روناکبیریەکانە نەك بەسترانەوەیان بەئارەزووی تاقەکەسو کرژیو خاوبوونەوەی بارە سیاسیەکان. دەبێت پرۆژەی روناکبیری وا قالب گیر بکرێت ببێتە بەشێك لەقەوارەی مانەوەو ستراتیژێکی نەگۆڕی کلتووری.

هەر لە ئەنجام گیری ئەم چەند پەیڤەوە دەمەوێت شتێك دەربارەی گۆڤاری سەردەم بلێم.

دەرچوونی گۆڤاری سەردەم ئەنجامی هەست کردن بوو بە بۆشاییەکی دیاری کلتووری کە دەبوو زووتر پێشوازی لە و نیازە بکرایە، بەتایبەت لەلایەن رووناکبیرو نووسەرانەوە کە پێش هەرچینو کۆمەلێك ئەو هەستەیان لا رسکاوە، کەچی لەگەل دەست خۆشی لێ کردنی هەندێکدا گرەوی مەرگێکی زوویشی لەسەر کرا، گرەوی ئەوەی گۆڤارێکی تایبەت بەکلتووری بێگانە وەرزی نەڕەخسیوەو، لەم حالو بارەی کوردستاندا، کە سیاسەت قەلەمڕەوەکانی تەنگ کردۆتەوە، دەنگەکان لەباتی ولاتێك بوونە شارێك، کەسانی بەتواناو زمان زانو رووناکبیر کۆچی هەندەرانیان کردووە، بۆ گۆڤارێکی لەم بابەتە پێوانەی رووناکبیری فراوان مەرجە نەك ئەم بەرتەسکیە، گرەوی ئەوەیش کرا کە ئەم دەزگا روناکبیریە (دەزگای چاپو پەخشی سەردەم) بەرهەمی بڕیارێکی کاتیەو عەقلی کورد لەگەل رەوتی کلتوردا رانەهاتووەو وەك گەلێك پرۆژەی دی لەگەل چاوهەلهێنانیا دەمرێت. خاوەنی ئەم رایانە ئەگەرچی لەسەر هەندێك نموونەی عەینی قسەیان دەکرد، بەلام ئەمە چەند راستی تیابێت ئەوەندەیش بێهوودەییو بڕوا بەخۆنەبوونو تەنگژەی ئیرادەی لەخۆگرتوە، خاوەنی ئەم رایانە چ جیاوازیەکیان لەگەل رای ئەوانەدا نەبوو کە دەیان وت: کورد ناتوانێت حوکمڕانی خۆی بکات. هەموو ئەم گرەوو گریمانانە لەئارادا بوونو کەچی دەزگای سەردەم لەماوەی سالێکی تەمەنیدا ئەوەی بەهەموو کەس سەلماند –تەنانەت ئەوانەیش کە گرەوەکانیان دەکرد- کە تا ئێستا هیچ دەزگایەکی رووناکبیری لەکوردستاندا نەی توانیوە بەو ماوە کەمە سامانێکی دیارو فراوان- لەکتێب، گۆڤار، نامیلکە-ی جۆراوجۆر لەبواری فیکرو ئەدەبو زمانو لێکۆلینەوەو مێژوو رەخنەدا چاپ بکاتو لەرووی چەندایەتیەوە چەند دەولەمەند بێت ئەوەندەیش لەرووی چۆنایەتیەوە نەکەوێت. گۆڤاری سەردەمیش بەری ئەم پرۆژەیەیە کە لەگەل هەموو ئەو رەگەزە نێگەتیڤانەی لەمەرگیان نزیك دەکردەوە ئەو خۆی گرتو راست لەسەر پێ وەستا. من نالێم ستافە خاکیەکەی "سەردەم" لەم ماوەیەدا ماندوو نەبووە، نەوروژاوە، تووڕە نەبووە، هەندێك جار دوودلی نەیویستووە پەی بەئیرادەی بەرێت، بەلام بەراستی خۆشەویست ترین بەرهەم ئەوەیە کە بەزەحمەت بەدەست دێت، کە ئارەقەی گەرماو سەرمای بۆ دەرێژێت، کە شەونخونیت پێ دەکاتو شەرێشت پێ دەکات. من نالێم ئێمە لەمەیدانەکەدا تەنیا بووین، نەء، چونکە هەر لەسەرەتاوە بڕوامان بەدەرەوەی خۆمان هێنابوو، وایشمان دانەناوە ئەوەی وەك ئێمە بیرنەکاتەوە، نەنووسێت، یان وەك ئێمە نەبێت بەوتەکەی "تودوروڤ" ئیتر ئەوە بەربەرە، ئەوانە لەیەکەم ژمارەوە دەست خۆشیان کرد، تازەیش بۆنو بەرامەی خۆشی سەردەم دەگاتە دنیای دوور، تازە پیرۆزبایمان لێ دەکەنو بەلێنی گەورەمان دەدەنێ. ئێمەش ئەزموونی سالێکمان زۆر گەندولەندی لەمەودوای بۆ ئاسان کردین، گەلێك ترسی رەواندینەوە، لەو دەرسەیش گەیشتووین: کە دەشێ مرۆڤ شکست بخوات بەلام نابەزێت.

-سەرنووسەر-

کانوونی یەکی 1999

# فیکرو فەلسەفە



- دارمان و بووژانەوەی کەلتوور
- ستەمکاری: خوێندنەوەیەکی کتێبی نوێیەمی کۆماری ئەفلاتوون



- هاوسەرێتیی ناشادی مارکسیزم و فێمینیزم.



- ئایین لەنێو سیاسەتدا.
- دەوڵەت.



- وتووێژی مۆدێرنیتی و پۆست مۆدێرنیتی.

# دارمان‌و بوژانه‌وه‌ی که‌لتور

## - فه‌لسه‌فه‌ی که‌لتوری ئه‌لبێرت شڤایتزه‌ر -


- نوسینی: پرۆفیسۆر. د. جۆهان. ب. هایگن
- له ئینگلیزیه‌وه: ئه‌نوه‌ر حه‌مه سالح


## I

نیچه له‌یه‌کێك له کاره‌کانیدا ده‌ڵێت: "ئه‌وه به‌دبه‌ختی ئه‌و که‌سانه‌یه که چالاکن که چالاکیه‌که‌یان هه‌میشه‌و به‌شێوه‌یه‌کی نه‌گۆڕ نائه‌قڵانی‌یه" بۆ ئه‌مه که‌سێك ده‌توانێت ئه‌مه زیاد بکات: ئه‌وه به‌دبه‌ختی ئه‌وانه‌یه که بیرده‌که‌نه‌وه که بیرکردنه‌وه‌که‌یان به‌بێ هیچ گومانێك هه‌میشه ناکاریگه‌ره. به‌ڵام کاتێك بیرکردنه‌وه‌ی ئه‌قڵانی‌و چالاکی کاریگه‌ر هاوڕێی یه‌کتر ده‌بن، هه‌ردوو له‌دووره‌وه ده‌زرنگێنه‌وه ئه‌وکاته هیوایه‌ك ده‌ست به‌دره‌وشانه‌وه ده‌کات. ئه‌لبێرت شڤایتزه‌ر (Albert Schweitzer)


شڤایتزه‌ر

یەكێكە لەوانەی كە هیوا بۆ كلتوری خۆرئاوا بەئاگادێنێتەوە.

لەماوەی جەنگی جیهانی یەكەمدا بوو كە بیركردنەوەیەكی كلتوری نوێ بواری بڵاوبونەوەی بۆ كرایەوە بەتایبەتی لە ئەوروپادا. بەڵام نەوەیەك پێشتر فرێدریك نیچە پێشبینییەكانی خۆی بۆ داڕوخانی روخساری جیهانە هاوچەرخە هێشتا گومان لێنەكراوەكەی خۆی دەرخستن. بێگومان دەنگی نیچە بیسترا بەڵام سەرەڕای ئەوەش مەزاجە رەشبینەكان لەدوابەدوای سەدەكەدا نەناسراو نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە گەشبینی بوو كە خەسڵەتی سەرەكی ماوەیەكی چالاكی بێ وچانی تا ساڵی 1914 دابین كردبوو. لەڕاستیدا ئەوە سەردەمی پۆزەتیڤیزم (Positivism- الوضعیة) بوو- دیرۆكی زێڕینی ویستی بەدیهێنانی پێشكەوتنو بڕوا بە پێشكەوتن بوو.

نوسینەكانی شڤایتزەر لەسەر فەلسەفەی كلتوری بەشێوەیەكی رێژەیی جێگەیەكی لەدوا دەگرن لەكارە بڵاوكراوەكانیدا. دوو بەرگی یەكەمی كارەكەی لەسەر فەلسەفەی كلتوری لەساڵی 1923دا دەركەوتن بەناونیشانی (Verfall und Wiederaufbeau der Kultur) و (Kultur und Ethik) بوون، شڤایتزەر دەنوسێت كە لە دەوروبەری ساڵی 1899دا بیرۆكەی كارەكەی بەبیردا هاتووەو ئەوە جەنگی جیهانی یەكەم بوو كە بۆ یەكەمجار پاڵی پێوەنا پەرە بەكارەكەی بدات. ئەم كارە لەدارستانە كەمەرەییەكانی ئەفریقادا لە 1914- 1917 بەئەنجام گەیشت.

لەكتێبەكەیدا (Aus meinem Leben und Denken)[i] شڤایتزەر دەگێڕێتەوە كە لە ئێوارەیەكی 1899دا كاتێك لەگفتو گۆیەكدا لە بەرلین بەشداریكردبوو یەكێك لەئامادەبوان وتبوی:

"نەخێر بەهیچ كلۆجێك! راستی ئەوەیە كە ئێمە هەموومان لاسایی كەرەوەین epigones"

شڤایتزەر لەسەری دەڕوات: "ئەمە وەكو رووناكی هەورە بروسكە لەلاوە لێیدام چونكە گوزارشتی لەوە دەكرد كەخۆم هەستم پێكردبوو"

لێرە بەدواوە، هەرگیز نەیدەتوانی ئەم بیرە لەمێشكی خۆی دەربهێنێت. بەڵام كاتێك هەوڵیدا گوزارشتێكی بداتێ بەشێوەیەكی سەرەكی وەكو ناكۆك Paradox و رەنگدانەوەی رەشبینی كۆتایی سەدە وابوو. شڤایتزەر لەتوانایدا نەبوو ئەو گەشبینییە قبوڵ بكات كە مەزاجی باوی پێدەناسرایەوە لە وەرچەرخانی گەشەسەندنێكی بەردەوامی پێشكەوتن بەلای ئەمەوە بناغەیەكی لاوازی هەبوو. لەهەموو جێگەیەكدا نیشانەكانی لاوازی ناوەكیو گەندەڵی ناوەكی دەدۆزیەوە. نەیدەتوانی خۆی رزگار بكات لەیادەوەری بەئازاری ئەوەی كە بڕێكی گەورەی ئەو میراتە روحیەی لەلایەن نەوەكانی پێشووەوە بنیات نرابوو بەهێواشی بەڵام بەدڵنیاییەوە دەستیكردبوو بەژاكانو مردن.

كەواتە ئەمە بوو سەرچاوەی بیركردنەوەی ئەلبێرت شڤایتزەر لەسەر كلتور. بەرگی یەكەمی كارەكەی لەسەر فەلسەفەی كلتوری بەم جۆرەی خوارەوە دەست پێدەكات: "بارودۆخەكانی ئێستەمان ئاماژەن بۆدارمانی كلتور" و لەكۆتایی كتێبی "ژیانمو هزرم- Aus meinern Leben und Denken"دا دەڵێت: "دوو تێگەیشتن باڵیان بەسەر بووونمدا كێشاوە. یەكەمیان لەو دركپێكردنەدایە كە جیهان بەشێوەیەكی راڤەنەكراو نهێنییەو پڕە لەئازارو ئەشكەنجە، و

ئەویتریان لەو راستیەدایە کە من لەزەمەنی دارمانی رۆحی مرۆڤایەتیدا لەدایك بووم."

بەگوێرەی بۆچوونی شڤایتزەر داڕوخانی کلتورێك کاتێك روودەدات کە هێزە ئەفرێنەرەکانی لەکەلك بکەون. کلتور لەراستیدا هەر بەتەنها بریتی نیە لە سەرەنجامە دەرەکیەکانی بوارە زانستیو تەکنیکیو ئابوریەکان، ئەم شتانە تەنانەت گرنگیەکی لاوەکیشیان نیە. دەسەلاتی کلتورێك بەهۆی هێزە ناوەکیەکانەوە دیاریدەکرێت، "توانای تێگەیشتنو قەناعەت کە دەبنە هۆی ویستی کلتورو توانای ئەفراندنی" (Aus meinem Leben und Denken", p, 128 et seq)، ئەوە لێرەشدایە کە داڕزان دروست دەبێت. ئەوە ئەوجێگایەیە کە لێوەی داڕزان دزەی کردۆتە کلتوری ئەوروپیەوەو تیایدا کاریگەریەکەی هەستی پێدەکرێت.

گەر روناکی کلتور چیتر بەپرشنگداری نەدرەوشێتەوە هۆکاری سەرەکی ئەمە بەگوێرەی بۆچونی شڤایتزەر ئەوەیە کە هزر رەونەقی خۆی لەدەست داوە. هزر ئەو دەسەلاتەی لەدەستدا کە ئەرکی راستەقینەی خۆی بەجێ بگەیەنێت لەناو کایەی کلتوریدا. هزر نەرۆشنگەریو رێنمایی‌و نە هێزی پالنەری داوە بەکلتور کە دەبوو بیبەخشایەتێ. لەبەر ئەمەیە کە شڤایتزەر ئەم جۆرە فەلسەفەیە دەکاتە دەستپێکی رەخنە کلتوریەکەی.

شڤایتزەر جەختێکی تایبەتی دەکاتەسەر هزرو بیرکردنەوەی دروست وەکو فاکتەرە سەرەکیەکانی کلتور "من خۆم لەرێکنەکەوتنێکی تەواودا دەبینمەوە لەگەل رۆحی سەردەمەکەدا چونکە پڕ بووە لە کینە بۆ هزر" "لەسەردەمێکدا کەهەر شتێك بەهەر رێگەیەك وا دەربکەوێت ئەقلانی‌و رۆشنگەرە بە سوکو نزمو پەککەوتوو و کۆن سەیربکرێتو تەنانەت تیایدا بانگەشەی دەستبەردار نەبوون لەو مافانەی مرۆڤ کە لەسەدەی هەژدەهەمدا پیادەکران گالتەی پێدەکرێت، من خۆم بەکەسێك دادەنێم کە متمانەی خۆی دەداتە هزری ئەقلانی. من سەرکێشی دەکەم بەنەوەی خۆمان بلێم دەبێت بروانەکات کە چی تر کاری بە ئەقلانیەت نەماوە بەتەنها لەبەر ئەوەی ئەقلانیەتی رابردوو دەبوو یەکەم جێگە بدات بە رۆمانتیسیزمو پاشان بەریالیزمی رامیاری کە دەستی کردووە بە کۆنترۆلکردنی بواری رۆحی‌و هەروەك بواری مادیش کاتێك هەموو گەمژییەکانی ئەم رامیاریە ریالیزمیە گەردونیە ئەزمون کردو بەوجۆرە دابەزیە ئاستێکی قولی هەرگیز بەرزنەبوەوەی نەهامەتی رۆحی‌و مادی، لەکۆتاییدا هیچ ئەلتەرناتیڤێکی نیە متمانەی خۆی بداتە پالو تیایدا بەدوای رزگاربوونی خۆیدا بگەرێت جگە لە ئەقلانیەتێکی نوێی قولترو سروشت بەتواناتر لەکۆنەکە. (Aus meinem Leben und Denken P. 191 et seq.)

لەم چەمکەوە بۆ گرنگی کلتوری بنەرەتی هزرو بیرکردنەوە، رەفتاری شڤایتزەر بەتوندی هاودژە لەگەل ئەوەی ئوسوالد شپنگلەردا Oswald Spengler کە لەهەمان ماوەدا لە "Untergang des Abendlandes"دا "دارمانی خۆرئاوا" "شپنگلەر ئاور لە هزری کۆنی قۆناغە جۆراو جۆرەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دەداتەوەو دەیگێرێتەوە بۆ کلتورەکانی تاك کە خۆی پێیەوە سەرقالە: کلتورێك لەدایك دەبێت، گەشەدەکات، گول دەکات، دەچێتە تەمەنەوەو دەمرێت وەکو بونەوەرێکی زیندوو. کلتورەکان پابەندی یاسایەکی نەگۆڕی هاوتەبان. لەزۆربەی

کلتوره جیاوازەکاندا نیشانەکانی نزیکبونەوە لە پیرێتی بەشێوەیەکی بنەڕەتی هاوشێوە دەبنو پلەیەکی بەرزی هەنوکەیی دەگەیەنن. هیچ کلتورێك، تەنانەت کلتوری خۆرئاواش ناتوانێت خۆی لەم چارەنوسە ببوێرێت. گەر لە ساتەکانی ئێستاماندا نیشانەکانی هەڵوەشانەوە لەکلتورەکەماندا بەدی بکەین، پێویستە نەدرێنە پاڵ هیچ کام لەو هەڵانەی کە لەوانەیە رویاندابێتو نەدرێنە پاڵ هیچ داروخانێك بەڵکو بەسانایی‌و بەتەنها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە کلتوری خۆرئاوا پیر بووەو بەپێی یاساکانی سروشت لەگۆڕ نزیك دەبێتەوە.

شوێنگەی وەستانی شڤایتزەر تا خەیاڵ برکات دووره لەهەر جۆرێك لەو جەبریەتەوە Fatalism.*

گەر کلتورەکان دەست بکەن بەدارمان ئەوا دەتوانرێت ئەوە بدرێتە پاڵ چەند هۆکارێکی دیاریکراو کە دەتوانرێت بسەلمێندرێن، بێگومان ناتوانرێت بدرێنە پاڵ هیچ یاسایەکی سروشتی. قبولکردنی هەر گریمانەیەکی پێچەوانە قوربانیدانێکی کلتورو خۆبەدەستەوەدانێك بۆ پێویستیە فیزیکیە نابیناکان دەگەیەنێت.

هەرچۆنێك بێت شڤایتزەر رازی نییە بە ئاشکرا کردنی پەیوەندی پچڕان لەگەشەسەندنی کلتوردا. ئەو پەنجە دەخاتە سەر زنجیرەیەك بارودۆخی دەرەکی کە وەکو کۆسپو تەگەرە بۆ کلتوری ئەم سەردەمە کاردەکەن.

لێرەدا ئەو گرفتانە دەهێنێتە ئاراوە کە ئێمە ئەمرۆ پێیان ئاشناین بەڵام رەنگە بۆ نەوەیەکی پێشتر مەترسیان ئاشکرا نەبوبێت. شڤایتزەر جەخت لەسەر ئەو راستیە دەکات کە لەیەك ترازانێك لەنێوان لایەنە رۆحی‌و مادیەکانی کلتوردا گەشەی کردووە.

مۆدەکانی ژیان کە بەسەر مرۆڤی مۆدێرندا سەپێندراون نەك تەنها هەر کاریگەریەکی نائومێدکەرو سایکۆلۆژی زیانبەخشیان هەیە بەسەریەوە بەڵکو واشی لێدەکەن کە کەسێکی شیاو نەبێت بۆ کاری کلتوری ئەفرێنەر.

ئەو وێنەیەی ئەلبێرت شڤایتزەر بۆ باری ئێستای کلتوری دەکێشێت وێنەیەکی تاریکە. تا ئەم رادەیە ئەو لەسەر یەك هێڵ دەوەستێت لەگەڵ رەخنەگرە رەشبینە گەورەکانی کلتوردا شۆپنهاوەرو نیچە. هێشتا گەر تەنانەت وشەکانی کتو مت وەکو وشەکانی ئەوان نێگەتیف بن، هەرچۆنێك بێت جیاوازی هەیە لەنێوان ئەمو ئەواندا کە وەکو جیاوازی نێوان شەوو رۆژ گەورەیە. کاتێك شڤایتزەر هێرشێکی ئاوەها توند دەکات بۆ ئەوەیە پێویستی هەنوکەیی سەرهەڵدانێکی رادیکاڵو ئاکاری کلتوری گرێدراوبە نەریتی گەورەی گەشەسەندنی کلتوری خۆرئاواوە رونبکاتەوە. رەخنە کلتوریەکەی گوزارشت نیە لە پەرێشانیەکی کلتوری یان نائومێدیەکی کلتوری، لەراستی‌دا بەرەنجامی متمانەیەکی چالاکی ئاشکراو ئارەزووە بۆ کلتور.

نەخۆشی سەردەمی ئێمە زیادەڕۆییەکی کلتور نی‌یە ناچارمان بکات بۆ سەربەستی لەقوڵایی‌یە پیس نەبوەکانی سروشتدا بگەڕێین. بەپێچەوانەوە سەردەمەکەمان کلتورێکی زۆر کەمی هەیە؛ خیانەتی لەکلتور کردووەو بەهۆی گرنگی نەدان بەکلتور توشی لەپەلو پۆکەوتن بووە. ئەلبێرت شڤایتزەر پەیامێکی کلتوری هەیە بۆ سەردەمێك کە لە پەیوەندی‌دا بەکلتورەوە هێندە توشی پەشۆکان بووە کە تەنانەت رەخنە کلتوریەکەی وەکو دەستبەرداربونێکی ناکاریگەر دەردەکەوێت وەك لەیەکاڵاکردنەوەیەکی خود-ئەزمونی.

ئەوە لەم خاڵەدایە کە ئێمە ڕووبەڕووی کەسێك دەبینەوە هەرچەندە زۆر بەڕوونی درك بەداڕزانی کلتوردەکاتو زۆر بەتوندی مەحکومی دەکاتو لەگەڵ ئەوەش پڕبووە بەبڕوایەکی چالاكو شاگەشکە لە دۆزی کلتوردا.

ئەو ڕێگەیەی کە تیایدا کەسێك بارودۆخی کلتورێکی تایبەتی هەڵدەسەنگێنێت، بێگومان پشت دەبەستێت بەو شتەی کە ئەو کەسە بەمەبەستی سەرەکی کلتوری دادەنێت. گەر ڕەخنە کلتوریەکەی شڤایتزەر زۆر توندبێت، هۆکاری ئەمە دەتوانرێت لەو گرنگی پێدانەدا ببینرێت کە دەیداتە پاڵ لایەنە ناوەکیەکانی کلتور- بەتایبەتی مرۆڤو کەسیەکان- هەروەکو هەردوکیان مەرجومەبەستی کلتورن.

بەگشتی شڤایتزەر دەڵێت کلتور پێشکەوتن دەگەیەنێت، پێشکەوتنی ماددیو کلتوری هەریەك لەتاکەکەسو کۆمەڵگە. لەکاتی گەنجێتیدا سەراپای بێمتمانەیی بوو بەرامبەر بیروڕای شاگەشگەیی کە لەلایەن هاوچەرخەکانیەوە گیرابووەبەر.

سەرەڕای ئەوەش سوربوو لەسەر ئەوەی کە کلتور واتا پێشکەوتن. بەڵام گەشەسەندنەکانی بەشێوەیەکی جیاواز لەهەموو ئەوانی تر هەڵدەسەنگاند. لەو جێگەیەدا کە ئەوان پێشکەوتنیان دەبینی ئەم دارمانی دەبینی.

کلتور دەسەڵاتی هزر دەنوێنێت بەسەر هێزەکانی سروشتدا هەروەهاش فەرمانڕەوایەتی هزر بەسەر سروشتی مرۆڤ خۆیدا. لەو دووانە، ئەوی دواییان زۆر گرنگترەو دوو هۆکاریش بۆ ئەمە هەن.

یەکەم، ڕکێف کردنی سروشت پێشکەوتنی پەتی نانوێنێت چونکە هەروەها سەرەنجامێکی زیانبەخشیش دەسەپێنێت کە دەتوانرێت بەسەر خودی کلتوردا پیادەبکرێت. هەموو فۆرمێکی دەرەکی پێشکەوتن نرخی خۆی داوادەکات تەنها گەشەی ناوەکی کلتور پێشکەوتنێکی پەتیو ڕەهایە.

دووەم، ئەوە تەنها کلتورە کە دەسەڵاتی ئەقڵ دەنوێنێت بەسەر سروشتی مرۆڤ خۆیدا کە دەتوانێت ڕێگری مرۆڤایەتی بکات لەخراپ بەکارهێنانی هێزە ڕکێف کراوەکانی سروشتو چونە ناو ململانێیەکی هاڵوگۆرکاری نێوان هەردوکیان. ئەمەش زۆر ترسناکترە بۆ مرۆڤایەتی لەهەریەکێکی تر کە لەلایەن سروشتێکی لغاونەکراوەوە سەپێندراوە.

لەبەر ئەوە فەرمانڕەوایی ئەقڵ بەسەر سروشتی مرۆڤدا گرنگترین لایەنی کلتورە. بەڵام کرۆکی ئەم لایەنە تایبەتەی کلتور ئەوەیە کە تاکەکانو کۆمەڵگە بەهەمان شێوە ڕێگە دەدەن ئارەزوەکانیان دیاری بکرێت لەدیدی هەموانەوە بەسودی زۆربە. بەدەربڕینێکی تر، ناوەرۆکی کلتور ئاکارییە "پێشکەوتنی ئاکاریانە خەسڵەتی بنەڕەتیو پەتی گەشەسەندنی کلتورە، لەکاتێکدا پێشکەوتنی ماددی کەمتر بنەڕەتییەو جێگەی گومانیشە"

پێویستە هەمیشە ئەم تێگەیشتنە لەمانای کلتور لەبەرچاو بگرین گەر بمانەوێت لەهەڵسەنگاندنی ئەلبێرت شڤایتزەر بۆ گەشەسەندنی کلتورو باری ئێستای بگەین. ئەو ستانداردێکی بۆ دابیندەکات کە بێگومان بەشێوەیەکی بەرچاو جیاوازە لە ستانداردە ئاساییەکان.

بەکارهێنانی ئاسایی وشەکە دەیشارێتەوە کە خاڵی سەرەکی بەلای شڤایتزەرەوە چییە: گرفتی سەرەکی ئاکاری کلیلی سەرەکییە بۆ کلتور. بەڵام سەردەمی ئێمە ڕێگەی بەخۆی داوە

قایل بێت بەوەی کە پێشکەوتنی ماددی خۆی لەخۆیدا کلتور دادەمەزرێنێت.

شڤایتزەر گاڵتەی دێت بە تێگەیشتنێکی ئاوها بەرز نرخێنداو بۆ واقیع کە لەلایەن مرۆڤی مۆدێرنەوە لافی پێوە لێدەدرێت دەمانەوێت پرنسیپێکی رێپیشاندەر بە دەستبهێنین بۆ رەفتارکردنمان کەچی تر لەئایدیا ئەبستراکەکانەوە نییە بەڵکو لەواقیع خۆیەوە، لە ئەزمونەوە. شڤایتزەر دەڵێت گەر واقیع بکەینە مەحەکی خۆمان لەجیاتی ئاکارو ئایدیا ئەقڵانیەکان ئەوکاتە وەکو منداڵە نابەرپرسیارەکان رەفتاردەکەین بەوپەڕی خێرایی دەست دەکەینە گەشت بەڵام ئاگادارنین بەرەو کوێ دەڕۆین رێگە دەدەین بەخۆمان لەلایەن راستیەکانەوە دنەبدرێین‌و بەگەمژەییەکی باوەڕپێنەکراوەوە وەڵامیان بدەینەوە، لەبەر ئەوەی خۆمان بێبەری کردووە لەبیرۆکە ئەقڵانیەکانمان بەقازانجی ئەزموون. دواجار زەویەکی پتەومان هەیە لەژێر پێکانمان‌داو هاواردەکەین‌و ئەوکاتەش لەلافاوی رووداوەکان نقوم دەبین.

نەویستانە وەبیر مرۆڤ دەهێنێتەوە کە کیرکگارد Kierkegard چی وتووە لەبارەی ئەزمونەوە: "لەناو هەموو ناماقوڵیەکان‌دا، ناماقوڵترینە، و هێندە دوورە لەوەی بتوانێت مرۆڤ زیرەك بکات کە زۆر شیاوترە شێتی بکات گەر هیچ نەزانێت لەبارەی سروشتێکی باڵاترەوە لەم سروشتە"

بۆ شڤایتزەر ئاکار شتێکی تەواو جیاواز ترە لەسامانێکی بچوکی تایبەتی بۆ دەرونە چاکەخوازەکان. ئاراستەکەری کلتورو مەرجی ئازادی‌و رەفتارێکی میتۆدی گرنگە. تەنها بەیارمەتی ئایدیا ئاکاری‌و ئەقڵانیەکانە کە ئێمە لەپێگەیەکدا دەبین بۆ ئاراستەکردنی گەشەسەندنی بەڕێرەوی راستدا لەوەش زیاتر هەروەکو چۆن خێرای بەرزتر داوای ئاراستەکردنێکی چاکتر دەکات، بەهەمان شێوە پێشکەوتنی ماددی گەورەش داوای وزەی ئاکاری گەورەتر دەکات بەپێچەوانەوە، هەروەکو دەردەکەوێت، حەقیقەت ئەوەیە کە تا زانیاری‌و شارەزاییەکانمان گەورەترین ئەفراندنی کلتوری راستەقینە دژوارتر دەبێت. پێشکەوتن بەخێرایی دەبێتە هێزێکی سروشتی وەها کە ئاراستەکردنی بەئاراستەی داواکراودا تا ئەوپەڕی دژواری دژوارە.

بەم جۆرە، روبەڕو لەگەڵ بارودۆخێکدا کە تیایدا شێوە بیرکردنەوەیەکی ئاکاری کلتوری بەهێز داواکاری هەنوکەیی بوو، رێگەمان‌دا سەرچاوە ئاکاریەکانی کلتور هەڵبوەرن‌و بڕوامان وابوو دەتوانین بەبێ ئاکار خۆمان بگرین.

لەئەنجامی ئەمەش‌دا بێگومان بێبەش نەبوین لەکاریگەری ئەوەی کە رویدا. بەڵام کاتێك ئایدیاکانی کلتور وەلاوە نران، راستەوخۆ روبەڕو دەبینەوە لەگەڵ هێزەکانی تردا کە ئامادەن جێگەیان بگرنەوە. پاشان لەوێدا ئەو هاندەرانە دەردەپەڕن کە لەلایەن ئایدیاکانەوە سەرکوتکرابوون‌و خراپترین شتیشن تیامان‌دا.

مەزاجی خودی خۆمان بەردەوام دەبێت لەسەر کارکردن وەکو گۆڕەرێك (المحول - Trans former) کەدەبێت روداوەکان بەودا تێپەڕن. بەڵام لەبەر ئەوەی گۆڕەرەکە چیتر لەتێڕوانینی ئاکاری پێك نەهاتووە بەڵکو لەلایەن سۆزە کورتبین‌و دیدە پراکتیکیەکانەوە کۆنترۆڵکراوە، سەرەنجامی نوێ خراپتر دەبێت‌و باشتر نابێت لەسەرەنجامی پێشوو.

باشترین نمونە بۆ ئەوەی چیمان بەسەردێت کاتێك بنەما ئاکاریەکانی کلتور لاوازبن دەتوانرێت لە ناسیونالیزمی ئەمڕۆدا ببینرێت. کاتێك بیری نەتەوایەتی لەکۆتایی سەدەی رابردودا بەرزبووەوە پشتی بەست بوو بەهزری کلتوری –ئاکاری: دەوڵەتی نەتەوە وەکو ئۆرگانیزمێکی سروشتی پێویستە بە باشترین شێوە تەیاربکرێت بۆ ناسینەوەی کلتوری دەوڵەت. بۆ نمونە، ئەوە لەوتارە بەناوبانگەکەی فیختەدا ئاشکرایە کە لەزستانی 1807– 1808دا ئاراستەی نەتەوەی ئەڵمانی کرد.

ئەوە خۆشەویستیەکی نزم نەبوو بۆ نیشتمان کەتەنها بەهای بۆ هێزی دەرەکی دادەنا فیختەش هەولیدا لەهاونیشتمانیەکانی‌دا دایگیرسێنێ، بەڵکو خۆشەویستیەکی بەرزتر بوو کە رەنگە خزمەتی ئاشکرای هەتاهەتایی‌و خواوەندی بکات لەجیهاندا".

بەمجۆرە بیری نەتەوەیی وەکو ئایدیایەکی کلتوری پایە بلند دەستپێکرد، بەلام لەگەڵ دارمانی کلتوردا خەسڵەتی خۆی گۆڕی. چیتر خۆی نەخستە خزمەتی ئایدیای کلتور بەڵکو خۆی وەکو ئایدیایەك لەخۆیدا بەرزکردەوە، وەکو ئایدیایەکی بالا، یان وردتر بڵێین وەکو بتێك. گەشەی کرد بۆ ناسیۆنالیزم، ناسیونالیزمیش هیچ نی‌یە جگە لە کاریکاتیوری هەستی نەتەوایەتی.

پاشان هەستی نەتەوایەتی خۆی فرۆشت بەرامیاری ریالیزم یان ئەوەی پێی دەوترێت رامیاری ریالیزم، هەرچەندە وەهاش نیە چونکە تەنانەت بەراستی ریالیستیك نی‌یە.

بەناو رامیاری ریالیزمی ناسیونالیزم لەلایەن دۆگماتیزم dogmatism و ریالیزمی هەڵەو سۆزەکانی جەماوەرەوە فەرمانڕەوایی کرا.

جەخت لەسەر داواکانی دەکات بەبێ ئەوەی پشکنینێکی ئەقلانی راستەقینەی شایستەیان بکات: "رامیاری ریالیزم بەم جۆرە لەراستی‌دا رامیاری ناریالیزم بوو چونکە بەتێوەگلانی لەگەڵ سۆزەکانی جەماوەردا گرفتە هەرە سادەکانی کردۆتە گرفتی زۆر ئاڵۆز.

بەرژەوەندیە ئابووریەکانی لەجامخانەی پێشەوەی پێشانگادا داناوە لەکاتێکدا بیرۆکەکانی ناسیۆنالیزمی بۆ دەسەلات لەپشتەوەی کۆگادا هێشتۆتەوەو تەنگی پێهەڵچنیون.

'Verfall und Wiederaufbau der"
"kultur' P. 32.

خەڵکی سەردەمی ئێمە دەیانەوێت ریالیستی بن‌و وابەستەبن بەواقیعەوە. لەبارێکی وەهادا، هەرچۆنێك بێت ئەوە گونجاوترین کاتە بۆئەوەی تێبگەین کە چارەنوسی مرۆڤایەتی لەکوێ‌دا لەبەردەم مەترسی‌دایەو حەقیقەت لەسروشتی مرۆڤدایە نەك لەراستیە دەرەکیەکاندا. زەوی پتەوی ژێر پێکانمان بەراستیە راگوزەرەکان بنیات نەنراوە بەڵکو بەهۆی بیروڕا ئاکاریەکانی هزرەوە دروست بووە. تەنها بەهۆی ئەوانیشەوەیە کە دەتوانین بگەینە پەیوەندیەکی ئاسایی لەگەڵ واقیعدا. بەتەنها ئەوان دەسەلاتمان پێدەبەخشن بەسەر رێرەوی رووداوەکاندا. گرفتەکان، لەناویاندا گرفتە ماددیەتی‌و ئابوریەکان، تەنها کاتێك دەتوانرێت چارەسەر بکرێن گەر کلتوری سەرقاڵ بەشێوازی بیرکردنەوەی مرۆڤەوە رادیکالانە ببوژێتەوە.

لەپێش‌دا پێویستە ببینە کەسی نوێ پاشان دەتوانین باروودۆخە نوێکان بخولقێنین.

## Π

بەلای شڤایتزەرەوە کلتور بەبێ ئاکار لە داڕزاندایە. ئێمە لەناوەڕاستی ئەو داڕزانەدا ڕاوەستاوین. داڕزان نیشانەیەکی پیربوون نییە بەڵکو ئەنجامی هۆکارە تەواو دەستنیشان کراو و سەلمێندراوەکانە. قەیرانی کلتور دەرکەوتەی یاسایەکی سروشتی نییە کە بە شێوەیەکی حەتمی کلتوری دراوەتە پاڵ، بەڵکو سەرەنجامی گەشەسەندن بوو لەچەرخی ڕۆشنگەریەوە. هەروەها شڤایتزەر چاك دەیزانی چۆن قسە لەسەر پێکەوەهاتنەوەی سروشتی بکات، بەڵام بەمانایەکی تەواو جیاواز لەوەی لەلایەن شپنگلەرەوە بەکارهات.

یاسای هەماهەنگی لەو ڕاستیەدایە کە گەشەسەندنو بەجێگەیاندنی کلتور پشت دەبەستێت بەو کەشە ڕۆحیەی کە لێوەی دێتەدەر. بۆ ئەوەی کلتور نەشونما بکات پێویستی بە مەرجە ڕۆحیەکان هەیە. لەجێگەیەکدا کە ئەمانە بڵاونەبن گەشەسەندن لەسەر هێڵە هەڵەکان شتێکی حەتمیە.

بەلای شڤایتزەرەوە فاکتەری یەکلاکەرەوە لەم کەشە ڕۆحیەدا جیهان بینیو مانای ژیانە. ئارەزووی کلتور بەشێوەیەکی بەرفراوان بەهۆی ئەو جیهان بینییەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت کە پشتی پێبەستووە.

شڤایتزەر دەڵێت: "لەنێوان کلتورو جیهان بینیدا پەیوەندی سەیرو ڕەقهەڵاتوو هەن" (Kultur und Ethic, p. VII) قەیرانی کلتور سەرچاوەدەگرێت لەقەیرانێکی هاوشێوەوە لەجیهان بینیدا. بەم جۆرە، لەکاروانی هزری شڤایتزەردا پەیوەندیەکی نزیكو ڕاستەوخۆ هەیە لەنێوان وشەکانی بەرگی یەکەمو دووەمی کارەکەی لەسەر فەلسەفەی کلتوری. لەبەرگی یەکەمدا "ئێمە شاهیدی داڕمانی کلتورین".

لەبەرگی دووەمدا "من نوسینی تراژیدیای جیهان بینی خۆرئاوام لەئەستۆ گرتووە"

لەحاڵەتی نیچەدا ویستی ژیان بەشێوەیەکی پەرەسەندو لەسەر هێڵە بایەلۆژیەکاندا ڕاڤە دەکرێت. ئەو ویستی ئەو هێزە گرنگانەی ژیان خاوبکاتەوە کەلە هەڵچونی سۆپەرماندا ڕکێف نەکران. لێرەدا ئێمە لەبەناو ڤیتالیزم* دەکۆڵینەوە یان ڤیتالیزمی نوێ Neo-Vitalism هەروەکو وەهاشی پێدەوترێت بۆ دوورکەوتنەوە لەگرژی لەگەڵ هەندێك لەو ڤیتالیستە نوێیانە هەڕەمەکیانە گەشەسەندنی ژیانیان لە هاودژیەکی توندا داناوە لەگەڵ هزری بەئاگاو توانستدا. یەکێك لەوانە (Ludwig Klages) لەساڵانی 1929 تا 1932 کارێکی سێ بەرگی لەژێر ناونیشانی "Der Geist als Widersacher der seele"[4] دا بڵاوکردەوە.

ڕۆح دژایەتی ژیانە بۆ بنەمای دەست بەسەرداگرتنو دابەشکردن کە ڕۆدەچێتە سەراپای ژیانو وردوخاشی دەکات. دەروون لەلایەکی ترەوە خودی ژیانە، ڕەوتی نائاگایی ژیانە، گونجاوو تێك نەشکاو تەبا لەگەڵ خۆیدا. ئایدیال ژیانێکی سستە نەك ژیانێکی چالاك. "من دەژیم" بەڵام ناکاریگەر "لەوێدا لەمندا دەژی". هەروەها چاك دەزانێت کە چۆن شیکردنەوەی دەروونی بەکارهاتووە بۆ هێنانەکایەی دابڕینێکی سەراپایی هاندەرو واڕسکەکان "الغرائز" کە لە قوڵایی نائاگاییدا دروست دەبن.

بەلای شڤایتزەرەوە ئەوە ناپاکی کردنە لەگەڵ ویستی ژیاندا. ئەوە ڕەشبینیە کە زاڵدەبێت بە سەرماندا "وەکو چێژی حەوانەوەیەك کە ئەزمون دەکرێت لەلایەن ئەوانەوە کە لەناو بەفردا دادەنیشن لەکاتی ماندوییدا، چیتر ناچاری هیوا بۆ خواستنو ویستن نابین کە پێشکەشمان کراون لەلایەن ئەو ئایدیالانەوە کە بەسەرماندا سەپێندراون لەلایەن

ویستی بەهێزبومان بۆ ژیان! چیتر ئەزموونی فشار ناکەین لەجێگەیەکدا کە کەمکردنەوەی هەوڵەکانمان پشومان بداتێ. ("Kultur und Ethik", P. 213) ئەوە خیانەتە. فەرمانی ویستی قوڵتری ژیان دژی خۆبەدەستەوەدانی کەسێکە بۆ هاندەرەی تاریکەکان بەبێ بەکارهێنانی ئەقڵی ئەوکەسە؛ داوای لێکۆڵینەوەیەکی هزریانەی ویستی ژیان دەکات بۆ مەبەستی دەست گیرکردن لەبیرۆکە رێنیشاندەرەکان کە تیایدا بەدەست هاتوون. شڤایتزەر هیچ دژایەتیەك نابینێت لەنێوان رۆحو ژیاندا یان لەنێوان هزرو ویستی ژیاندا. بەپێچەوانەوە ویستی ژیان تەنها ئەوکاتە بەروونی لەسروشتی خۆی دەگات کە دەبێتە بیرکردنەوەیەکی ویستی ژیانو ئەوەش بە شێوەیەکی روکەشانە نابێت بەڵکو بەتێگەیشتنێکی قوڵ.

راکێشانی ویستی ژیان بۆ ژێر تاقیکردنەوەی ئەقڵ رێگە یە بۆ بەرزترین پلەی زانین. دڵسۆزی بۆ ویستی ژیان لە لە خۆگرتنی هەڵوێستێکی پۆزەتیڤانەدایە بەرامبەر ژیانو لەئارەزووماندایە بۆ هێنانەکایەی گەشەسەندنێکی تەواوەتی راستەقینەتر.

کەواتە ئەمە ئەو شتەیە کە بەلای شڤایتزەرەوەو جەختکردنی چڕبوەوەی جیهانو ژیان دەنوێنێت، هەروەکو ئەو گەشبینیە راستەقینەش دەنوێنێت کە لە هەریەك لە هزرو کلتور داواکراوە بۆ ئارەزوکردنی ژیان لەبەرزترین ئەگەرەکانیدا. "جەختکردنی چڕبووەوەی جیهانو ژیان بریتیە لە ئارەزوکردنمان بۆ بەزیندوو هێشتنەوەی ژیانمانو– هەروەکو هەموو جۆرەکانی تری بوون کە بەهەر رێگەیەك بێت لەژێر کاریگەری ئێمەدان– بەرزکردنەوەی بۆ بەرزترین شوێنی شایستە. ئەوە داوامان لێدەکات کە ئایدیاکانی ماددەو کامڵ بونە رۆحیەکانی تاکو کۆمەڵگەو مرۆڤایەتی وێنابکەینو کە ئێمە رێگە بە خۆمان دەدەین لەلایەن ئەوانەوە هانبدرێین بۆ کاری بەردەوامو هیوای بەردەوام. رێگەمان نادات پاشەکشە بکەین بۆناو خۆمان بەڵکو بانگمان دەکات بۆ وەرگرتنی حەزێکی چوستو چالاك لەهەموو ئەوەی روودەدات لەدەورو بەرماندا.

چەشتنی پەرێشانی وەکو سەرەنجامێك بۆ هەبوونی پەیوەندی پۆزەتیڤ لەگەڵ جیهاندا لەکاتێکدا دەتوانین لەدڵنیای دابین بە کشانەوە بۆ ناوخۆمان؛ ئەمە ئەو شتەیە کە جیهانی ناودوەو دیدی ژیان داوای دەکات لێمان (Kultur und Ethic, p, 206) جیهانی ناوەوەو جەختکردنی ژیان داوای شادمانیو پێشکەوتنیش دەکات. لەو کاتەوە ئەوە ویستی ژیانە کە بەهەمان شێوە ویستی ناسینەوەی ئایدیاکانە. بەلام لەسەر شادمانیو پێشکەوتن ناژی.

شڤایتزەر دەڵێت: "بیرۆکەی شکۆمەندی بۆ ژیان وەکو وەلامێکی پەیوەندیدار خۆی پێشکەش دەکات بۆ پرسیاری چەقیوی پەیوەندیداری چۆن مرۆڤو جیهان یەك بۆ یەکتری دەگەڕێنەوە." "تەنها شتێك کە مرۆڤ لەبارەی جیهانەوە دەیزانێت ئەوەیە کە هەروەکو خۆی هەموو ئەوەی بوونی هەیە مانیفێستی ویستی ژیانە. لەگەڵ ئەم جیهانەدا بەهەردوو شێوەی سستو چالاك پەیوەندی دەگرێت لەلایەکەوە ئەو پاشکۆی رەوتی روداوەکانە کە لەسەراپاگیری ژیاندا بەخشراوە؛ لەلاکەی ترەوە دەتوانێت کاریگەری لەژیان بکات کە دێتە بەردەستی بەهۆی کۆسپ دروستکردن یان بەرزکردنەوەی، وێرانکردن یان هێشتنەوەی (Aus meinem Leben und Denken, p. 199)

دەستکردن بە بیرکردنەوە لەبارەی ژیانو جیهان راستەوخۆو بەگوڕ مرۆڤ بەرەو شکۆمەندی بۆ ژیان دەبات. ئەو چەشنە

بیرکردنەوەیە ناگاتە ئەو سەرەنجامانەی کە لە هەر ئاراستەیەکی ترەوە دەست نیشان بکرێن. گەر مرۆڤێك رۆژێك لەرۆژان دەستی بەتێرامان کردبێت ئارەزوبکات دیسان بگەڕێتەوە سەر شێوازی پێشووی گوزەرانی تەنها دەتوانێت لەرێگەی دەستبەرداربوون بۆ بێ هزریو جارێکی تر گەمژەکردنەوەی خۆی ئەوە بکات هەرکاتێك رێگەبدات لەسەر بیرکردنەوەی دەتوانێت نەگاتە هیچ سەرەنجامێکی تر جگە لە شکۆمەندی بۆ ژیان.

هەر بیرکردنەوەیەك کە بەهۆیەوە مرۆڤەکان بانگەشەی چوون بەرەو گومانگەرایی Scepticism بکەن یان بۆ ژیانێکی بەدەر لە ئایدیا ئاکاریەکان بیرکردنەوەیەکی راست نیە بەڵکو بێ هزریە کە وەکو بیرکردنەوە خۆی پیشان دەداتو، بەو چەشنە خۆی نیشان دەدات بەهۆی ئەو راستیە کە پەیوەندی نیە بە نهێنی ژیانو جیهانەوە.

(Aus meinem Leben und Denken, p. 200)

کەواتە بەرەنجامەکانی شڤایتزەر تاچ رادەیەك جیاوازن لەوانەی لەلایەن شۆپنهاوەرو نیچەوە گیرابونە بەر، سەرەڕای ئەوەی لەخاڵی دەستپێکدا بەگشتی لەیەك دەچن.

شۆپنهاوەر بوونی وابینی کە پربێت لەئازاری بێماناو لەدەست بەرداربونێکی تاڵداو بەقێزەوە رووی لێ وەرچەرخاند.

هەروەها شڤایتزەریش بوون وادەبینێت کە پربێت لەئازاری بێماناوجەخت لەسەر پێویستی دەستبەرداربون دەکات. بەڵام بۆ ئەو دەست بەردابوون خۆکوشتنی سیمبۆلیانەی ویستی ژیان ناگەیەنێت، بەپێچەوانەوە مانای رۆچونی ویستی ژیان دەگەیەنێت بۆ ناو سەربەستی ناوەکی، بۆ ناو هێزو توان بۆ بوژانەوە لەژێر باری ئاڵۆزیەکانداو بۆ سوربوون لەسەر چالاکی.

"تەنها ئەو کەسەی بە ئەزموونی دەست بەردار بووندا رۆشتووە سەلماندنی جیهانی لەتوانادایە" Aus meinem Leben und Denken p. 199) هەموو ئەمەش کەلێنێکی بەرفراوان دەکاتەوە لەشکۆمەندی بۆ ژیانداو لەو بڕوایەدا کە ژیان پڕە لەمانا.

نیچە خۆی کردە پارێزەری ویستی ژیانوداوای کرد بەپتەویو سەرفرازانە گەشەی پێبدرێتو بووە بەرهەمهێنەرێکی گەورەی مرۆڤە ئاژەڵە نێچیریەکانی ئەم سەدە خوێناویەی ئێمە.

هەروەها شڤایتزەریش خۆی دەکاتە پارێزەری ویستی ژیانو بەهەمان شێوەش داوا دەکات بە بەهێزیو سەربەرزانە گەشە بکات. هەروەها بوو بە نیشاندەری رێگەیەکی راستەوخۆ بۆ بوژانەوەی کلتور بۆ مرۆڤایەتیو سۆز بەخۆبەخشین.

شڤایتزەرو فەیلەسوفە بونگەراکان لەم شتەدا هاوبەشن:

هەردوو تێدەکۆشن بۆ تێرامان لەمرۆڤو ژیانێکی شایستە بە مرۆڤ لەسەربەخۆییەکی تەواوەتیدا لەبارودۆخە دەرەکیەکانو رودوەکان.

هیواکانیان لەجیهانی دەرەوەدا لەشێوەی ژمارە سفردا دەنوسن. ئەمە ئەو شتەیە کە شڤایتزەر پێی دەڵێت دەستبەرداربونو بونگەراکان پێی دەڵێن نائومێدی. بەڵام لەحاڵەتی هایدگەرو ئەو فەرەنسیانەدا کە ناویانرابوو "سوارچاکەکانی بێ هودەی" ئەم یەکالاکردنەوەیە بەشێوەیەکی زۆر توندو ناهاوتایانە کاریلێکراوە کە زۆر دژوار دەبێت بۆ ئەوان پەیوەندیەکی پۆزەتیڤ بەرامبەر بەمرۆڤو شتەکانو رودوەکان بەدەستبهێننەوە.

بەمجۆرە ئاکارەکەیان ساردو سڕو بێ هیوا و بێ ئومێدو بێ وەهم بووە. ئەو وشانەی لەلایەن مێلڤیل Melville لەساڵی 1851دا نوسرا،

دەتوانرێت بەهەمان شێوە لەرۆمانێکی سارتەر کامۆ یان مارلۆدا ببینرێن: "باشە، باشە، — وامدەزانی نەویستانە سەردەستی چاکەتەکەمم هەڵکردووە— ئێستا کاتی نوقم بونێکی لەسەرخۆو هێمنە بۆناو مردنو تێك شکان"

ئەمە ئەو جێگەیەیە کە جیاوازی نێوان دەستبەرداربوونو نائومێدی تیادا روندەبێتەوە. شڤایتزەر هێزی رزگارکەری دەستبەرداربوون دەناسێتەوە بەڵام داننانێت بە هێزی تێکشکێنەری نائومێدیدا. دەیسەلمێنێت کە هەمان کرداری دەستبەرداربوون دەچێت بەرەو بەیەکەوەبونێکی قوڵی نهێنی ئامێزو ئاکاری لەگەڵ هەموو شتێکی زیندوودا.

"دەستبەرداربوون ئەو ڕاڕەوەیە کە پیایدا دەچێتە ناو مەملەکەتی ئاکارەوە. تەنها ئەو کەسەی لەرێگەی بڕیاردانەوە خۆی دەداتە دەست ویستی ژیانی خودی خۆی، سەربەستی ناوەکی بەدەست دەهێنێت لەهەموو روداوە دەرەکیەکان دەتوانێت بەجۆشو سوربونەوە خۆی تەرخان بکات بۆ ژیانی ئەوانی تر" (Kultur und Ethik p,244) تێبینی جیاوازی دەکەین لەگەڵ سارتەردا کە لە "مێشەکان"دا رێگەدەدات ئۆرێستیس بەزیوس بڵێت: "لەناکاو سەربەستی لەمنەوە هەڵرژا؛ جیهانەکەی تۆ پاشەکشەی لێکردم، لەهەڵلەرزینو سەرمادا وەکو سەهۆڵ بەجێیهێشتم، چیتر هیچ تەمەنێکم نەبوو، خۆشم لەناوەندی جیهانێکی بچوکی چاکەخوازدا دۆزیەوە، وەکو کەسێك سێبەری خۆی ونکردبێت، و هیچ شتێکی تر لەژێر خۆردا نەبوو، نەچاکەو نەخراپە، هیچ کەسێك کە فەرمانم بەسەرا بکات (Act 3, Scene 2)

کەواتە ئاشکرایە کە جیاوازی نێوان فەلسەفەی بوونگەراکانو فەلسەفەکەی شڤایتزەر لێرەدایە: نائومێدی فەلسەفەی بوونگەرایی تەریکی لەدوای خۆی دەهێنێت، دەستبەرداربوونی شڤایتزەر دەچێت بەرەو کۆبوون لەگەڵ هەموو زیندواندا.

هەرچۆنێك بێت چۆن ئەوە رودەدات کە بەرەنجامەکان هێندە جیاوازن لەکاتێك خاڵەکانی سەرەتا زۆر بەنزیکی بەیەکەوە گرێدراون؟ ئایا هۆکاری ئەمە بەسانای ئەوەیە کە ئەوەی بەرێکەوت روودەدات سارتەر بێت لەکاتێکدا ئەویتر کە بەهەمان شێوە بەرێکەوت روودەدات شڤایتزەر بێت؟ ئەمە ئەوەیە کە شڤایتزەر بەهیچ کلۆجێك بڕوای پێی نیە. بەپێچەوانەوە، ئەوپەڕی گرنگی دەداتە ئەو راستیەی کە ئەو بەرەنجامانەی ئەو پێیان دەگات لەروی هزریەوە حەتمین. جەخت دەکات کە هیچ کەسێك کە بەدروستی بیربکاتەوە ناتوانێت بگاتە بەرەنجامێکی تر جگە لەوەی کە چەمکی ژیانو ئاکار پشتیان بەستووە بە شکۆمەندی بۆ ژیان.

لەبەر ئەوەی کانت شتێکی وەکو (ئاوەز) ئەبستراك وەردەگرێت هەروەکو خاڵی دەستپێکردنەکەی بەدوای‌دا دێت ئەنجام دەبێتە یاسایەکی ئەبستراکتی گومانلێکراو کە باسی ناکات مرۆڤ چی بکات بەڵکو خۆی قایل دەکات بەداواکردنی ئەوەی کە کەسێك هەرچیەك بکات پێویستە جۆرە سروشتێکی هەبێت بەهەموانەوە گرێدرابێت. بەرەوپێش چوون لەوێوە بۆ ئاکارێکی خاوەن مانایەکی دیاریکراو گەورەترین دژواری دوچاری کانت کرد. بەپێی رای گشتیش ئەو بەتایبەتی لەمەدا سەرکەوتوو نەبوو.

لەلایەکی ترەوە فەلسەفەی بوونگەرایی هەڵبژاردنی وەکو خاڵی دەستپێکی خۆی وەرگرت. مرۆڤ وەکو بونەوەری هەڵبژاردن پێناسە کراوە. سارتەر دەڵێت مرۆڤ هەڵبژاردنەکەیەتی واتا کردارەکەی.

بەڵام مرۆڤ چی هەڵبژێرێت"

چ کردارێك کردارە راستەکەیە لەبارێکی دراودا؟ بەگوێرەی بۆچوونی سارتەر بۆ ئەو

مەبەستە یاسای گشتی نین. کرداری دروست لە هەڵبژاردنەوە سەرچاوە دەگرێت، هەڵبژاردن خۆی ناتوانرێت وەکو کاڵایەکی ئامادەکراو داوابکرێت. تەنها شتێك کە کەسێك دەتوانێت لەو بارەیەوە بیڵێت ئەوەیە کە چونکە مرۆڤێك شتێك نییە لەدەرەوەی ئەوەی هەڵیدەبژێرێت، دەکەوێتە سەرخۆمان بڕیار بدەین چی پێویست دەکات لەبوونی مرۆڤێکدا. ئەو شتەی کە هەڵیدەبژێرم دەبێتە کەسێتی من، تا ئەو رادەیەی کە هەر قسەیەکم هەبێ لەگرفتەکەدا. لەبەر ئەوەیە کە دەبێت وا لەخۆم بڕوانم کە لەژێر ملکەچیەکی سەراپای مرۆڤایەتی دابم بەم چەشنە پێویستە هەڵبژاردنەکەم کاریگەری بۆ مرۆڤ، هەموو مرۆڤێكو بۆ سەراپای مرۆڤایەتی هەبێت.

شڤایتزەر دەیەوێت بچێتە ئەودیو ئەم تێگەیشتنە ئەبستراکتو هزریەوە. لە کردنی ئەم کارەشدا سەرکەوتوو دەبێت چونکە وەکو خاڵی دەستپێکی گوزارشتێکی گرنگی کۆنکرێتو قووڵ هەڵدەبژێرێت بۆ (مرۆڤ چییە؟). مرۆڤ ژیانە، مرۆڤ ویستی ژیانە یان بەبەکارهێنانی وشەکانی خۆی: "من ژیانم کە دەیەوێت بژی لەناوەڕاستی ژیانێکدا کە دەیەوێت بژی" (Kultur und Ethik, P 239) دەبێت کەسێك بێگومان هاوڕابێت لەگەڵیدا کە ئەم گوزارشتە بەشێوەیەکی بنەڕەتیو سەرەتایی وەکو (ئاوەز– العقل)ی کانتو (هەڵبژاردن– اختیار)ی فەلسەفەی بونگەرایی وەهایە. لەسەر ئەم بناغەیەش پێناسەی ئاکار دەکات:

"بەبۆچوونی من ئاکار بریتییە لە هەڵپەیەك بۆ پیشاندانی هەموو ویستێك بۆ ژیانو هەمان شکۆمەندی بۆ ژیان هەروەکو بۆ خۆم هەمە. لەم ویستەدا پرەنسیپی بناغەیی پێویست بۆ رەوشت دەدۆزرێتەوە. چاکە پاراستنو پایەدارکردنی ژیانە؛ خراپەش وێرانکردنو رێگیری کردنی ژیانە. (Kultur und Ethik, P. 239)

## III

بیرۆکە بنەڕەتیەکانی شڤایتزەر لەسەر ئاکار لەلایەن لۆجیکێکی پتەوەوە بەڕێوە دەبرێت. بێگومان کەسێك دەتوانێت ناڕەزایی ئەوە بەرزبکاتەوە کە خۆی لەخۆیدا لەڕوی لۆجیکیەوە یەکسان دەبێت بوترێت:

من ژیانم کە دەیەوێت بژی لەنێوانو لەناو ژیانی تردا کە ئەویش دەیەوێت بژی. ئەمە واتا ژیانی من یان ژیانی تر. خەبات لەپێناو بوون ویستی دەسەڵاتدا لەوانەیە سەرەنجامی فۆرمەلەیەکی وەهای روبەڕوبونەوەی ئاکاری بێت. ئەمە ئەو بەرەنجامەیە کە لەلایەن نیچەشەوە وێنەی کێشراوە. شڤایتزەر بەهەمان شێوە وەکو پرسیارێکی شێلگیرانە سەیری ئەمە دەکات پێی دەڵێت گرفتی خود–ناموبوونی (Selbstentzweiung) ویستی ژیانو هەولدەدات چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە.

سەبارەت بە خودناموبونی ویستی ژیان شڤایتزەر مەبەستی ئەوەیە کە تاکێك دەسەڵاتی خۆی دادەمەزرێنێت لەسەر حسابی یەکێکی ترو کەسێك یەکێکی تر تێکدەشکێنێت. هەمان ویستی ژیان بەشێوەیەکی گەردونی universally کاردەکات. بەڵام بەدەر لەحاڵەتی مرۆڤ، وادەردەکەوێت بەتەنها پەیوەندی بەخود–گەشەسەندنەوە هەبێتو پەیوەندی نەبێت بە یەکانگیربوون لەگەڵ ویستی ژیانی ئەوانی تردا تەنها بەرێکەوت بێئاگا لەبوونی ئەوەی تر یەکانگیر دەبێت لەگەڵ ویستی ژیانی ئەوانی تردا. هەرچۆنێك بێت لەمرۆڤدا ویستی ژیان چیتر بێئاگا نییە؛ دەزانێت کە ویستێکی تری ژیان هەیە کە لەگەڵیدا هەوڵی هاوکاری دەدات

چونکە لەگەڵ ئارەزووی یەکگرتنو گەردونی بوون‌دا بەخشراوە.

لەبەر ئەوە بەلای شڤایتزەرەوە ویستی دەسەلاتی نیچە تەنها ویستی ژیان دەنوێنێت لەشێوە خودنامۆو هێشتا نیچە مرۆڤیەکەیدا. ئەوە ویستێکە بۆ ژیان کە هێشتا لەحاڵەتی بێئاگایی‌دایەو بەمجۆرە هێشتا نەبۆتە گەردوونی.

لەبەر ئەوە پێویستە گەشەکردن لەویستێکی خودنامۆوە بۆ ژیان بۆ ویستێکی یەکگرتوو بەبیرکردنەوە بەدیبهێندرێت.

شکۆمەندی بۆ ژیان لەڕێی بیرکردنەوەوە بەدەست دێت. ئەوە چەمکێکە کە بیرکردنەوە حەتمی دەکات، بەڵام بەرەنجامێکە کە گەیشتن پێی نابێت وەکو ئەنجامی یەکلایکردنەوەیەکی ساردوسڕی بابەتیانە بێت تارادەیەکیش ئەزمونێکە کە بەسەرمان‌دا دەسەپێندرێتو لەگەڵ سۆفیگەری‌دا mysticism هاوپەیمانی دەبەستێت.

پڕاوپڕ لە شڤایتزەردا ئاوێتەیەکی سەرنج ڕاکێشەری ئەقلانیو نائەقلانی دەدۆزینەوە. هزر دەچێت بەرەو سۆفیگەریو سۆفیگەریش لەڕێگەی هزرەوە رونو ئاشکرای لەبارەی خۆیەوە بەدەست دەهێنێت "ئەوە لەڕێگەی ناسینەوەی بوونی جیهانەوە نیە بەڵکو بەهۆی ئەزمونکردنی جیهانەوەیە کە دەچینە ناو پەیوەندیەکی زیندووەوە لەگەڵیدا. هەموو بیرکردنەوەیەك گەر وەکو پێویست قوڵ ببێتەوە دەگاتە سۆفیگەریەکی ئاکاری. ئەقلانیەت لەنائەقلانیەتدا بەردەوامی بەخۆی دەدات. سۆفیگەری ئاکاری کە پێی دەوترێت شکۆمەندی بۆ ژیان لەدەرەوەی سەرەنجام کۆتاییەکانی‌دا، هزری ئەقلانیە. Aus meinem Leben und Denken)

کاتێك لەبەر ئەم رۆشناییەدا لەگواستنەوە لەخود نامۆییەوە بۆ ویستی گەردوونی بۆ ژیان دەکۆڵینەوە ڕەگەزی سۆفیانە mystic بەئاشکرا گرنگی پەیدا دەکات.

ناسینەوەی ئەو مەودا گەورەیەی کە هەموو ژیان بەسەریەکەوە سەر بەئەوە خۆی لەخۆیدا ئەزمونێکی سۆفیگەرانەی یەکگرتنە لەناوەڕاستی هەڵوەشانەوەدا. ئەم ئەزمونکردنە کارێکی لۆجیکی نیە بەڵکو کارێکی سۆفیگەرانەیە. بەڵام سۆفیگەری شڤایتزەر لەسروشتدا ئاکاریەو پێویستە لە کردەوەدا درکی پێبکرێت. بەتەنها زانینی یەکێتی ژیان بەس نیە. پێویستە یەکێتی بۆ واقیعی زیندو بانگهێشت بکرێت، ئەوەش لەڕێی چالاکی ئاکاریەوە دەکرێت.

شڤایتزەر دەڵێت شکۆمەندی بۆ ژیان بڕواداریێکی دڵڕەقە. ڕێگەمان نادات پارێزگاری لەخۆمان یان شتەکانمان یان مافەکانمان یان کارەکەمان بکەین. دەبێت هەموویان بۆ خزمەتی هاو-مرۆڤەکانمان بەکاربهێنین گەر بزانێت کە خەڵك هیچیان نیە پێشکەشی بکەن جگە لە کۆششەکانیانو کاتیان، ئەوکات ئەوانە ئەو شتانەن کە داوای دەکات لێیان. ئەو ڕاماندەکێشێتە دەرەوەی ژیانی بابەتیو منێتیمانو داوا دەکات کە هەموو بۆ سودی هاومرۆڤەکانمان بژین. ئەم کارە دەڵێت چاوەکانت بکەرەوە کەسێك بۆخۆت بدۆزەرەوە یان کارێك بۆ سوودی ئەوانی تر کە خۆتی بۆ تەرخان بکەیت. دەشێت کەسێکی تەنها بێت یان پەرێشان یان نەخۆشو بێ دەرەتان پیر یان منال. دەشێ کێشەیەك بێت کە پێویستی بەکاری خۆبەخشانە هەبێت.

بەکورتی لەڕێگەی تەرخانکردنی خۆمانەوەیە بۆ ژیانی ئەویتر کە ژیانی خۆمان بەدیدێتو مەبەستو گرنگی بەدەست دەهێنێت شکۆمەندی بۆ ژیانو ئاکاری ڕاستەقینە داواکاری قورس دەکەن "ئەوان، دەڵێن، تۆ خۆشبەختیتو لەبەر ئەوەبانگهێشت کراویت کە زۆر ببەخشیت،

هەرچیەکت زیاتر لەوانی تر پێگەیشتووە لە تەندروستی، بەهرە، توانا، سەرکەوتن، منالی شادمانو یان دەوروبەرێکی خێزانی بەیەکەوە گونجاو- نابێت بەگرانتی وەربگیرێت لەلایەن تۆوە. پێویستە نرخی داواکراوی بدەیت. پێویستە خۆشەویستیەکی تایبەتی ژیان پێشکەشی ژیان بکەیت... (Kultur und Ethik, P. 253). بەلام ئێمە تەنها کاتێك درك بەبەهای وارسکیانەی ژیانمان دەکەین کەشتێك لەڕاستی ئەو وتەیەمان بۆ دەردەکەوێت کە دەلێت: ئەوەی ژیانی وندەکات دەیدۆزێتەوە.

پێویستە هەمیشە ئاگاداری ئەو ڕاستیە بین (کە زۆربە وردی سەرنجی لێدراوە) کە هەموو کارێکی دەرەکی گرفتی مەبەستیشە نەك هەر بەتەنها ڕاستی. زۆر گرنگترە ئەقلێتێك بەرهەم بهێندرێت کە سودمەند بێت بۆ کۆمەلگە وەکو لەبەدەست هێنانی ئەم یان ئەو سەرکەوتنی دەرەکی. ڕێگەیەکی بیرکردنەوەو کرداری ئاکاریانە هاندراو هەیە کە زۆر بە بەرهەمترە لەپەیوەندیەکانی مرۆڤدا وەکو لە شادومانیەکی روکەشی پەتی کەهەرگیز ناتوانرێت دروست بکرێت.

لەبەر ئەوەیە پێویستە خزمەتی کۆمەلگە بکەین بەلام بەبێ ئەوەی خۆمانی بۆ وازلێبهێنین. ناتوانین ڕێگە بدەین ببێتە پاسەوانی ئاکارەکانمان بەلکو پێویستە پابەندبین بە بێمتمانەیمان لەو ئایدیاو چەمکانەی کە ئەو برەویان پێدەدات. لەڕاستیدا، ئێمە دەزانین تاچ ڕادەیەکی مەزن کۆمەلگە پڕبووە لەگەمژەییو لەخشتەمان دەبات لەشتێکدا کە بەڕاستی گرفتە-مرۆڤایەتییە.

لەمیانەی گفتوگۆیەکدا پاش جەنگی جیهانی دووەم جارێك شڤایتزەر روبەڕوکرایەوە بە ئەو لێدوانانەی کەسالانی زوو کردبوونی. لەناو شتەکانی تردا، پرسیاری لێکرا بیرکردنەوەی چیە لەسەر بۆچونەکانی لەسەر سەرهەلدانەوەی کلتوری. وەلامەکەی ڕاستەوخۆ گەشبین نەبوو:

"نیشانەکانی بوژانەوەیەکی کلتوری لەڕاستیدا زۆر لاوازن. چونکە ماوەی چارەکە سەدەیەکمان لەپشتەوەیە کە تیایدا هێزەکانی وێرانکردن بەبێ هیچ بەربەستێك توانیویانە کاربکەن. جەنگەکانی یەکەمو دووەمی جیهانی هۆکار نەبوون بەلکو سەرەنجامی بارودۆخەکانی ئێستا بوون.

هیچ شتێك روینەداوە کە بارودۆخەکان گۆڕیبێتیان. بەردەوام دروست دەبنو بەشێوەیەکی بەرەوپێش چوو لەخراپ بووندان. (Ehrfurcht vordem Leben Oslo. 1951, P. 240) لەوەش زیاتر لە P. 241 دا دەلێت: کلتور وەکو میوەیەکی گەیوو بەرنابێتەوە بۆ ناو کۆشمان پێویستە درەختەکە بەوریاییەکی زۆرەوە بچەمێنینەوە گەر درەختێکی بەرگربێت بەلام ئەمە بەکاری زۆرەملێ ناکرێت. پێویستە کاری مرۆڤە ئازادەکان بێت کە لە دلیاندا وێنەی ئەو ئامانجەیان هەلگرتووە کە دەبێت بەدیبهێندرێت. جیهانی ئەمڕۆ جۆرە وێنەیەکی وەهای لەدلیدا هەلنەگرتووە. ناشتوانێت وابکات تاوەکو هێزی ئازادیو بیرکردنەوەی لەداڕمانی بەردەوامدابن. هەموو ئەوەی لەنێوان دوو جەنگەکەدا ڕوویداوە ئەم پرۆسەی داڕمانەی خێراتر کردووە. حالی حازر من هیچ گۆڕانێك بەرەو باشتر نابینم. هیچ کۆششێکی جدی لەئارادا نین بۆ گۆڕینی ئەم بەرەوپێش چوونە کە شایستەی بەجدی وەرگرتن بێت." شڤایتزەر وتی کە ناتوانێت دلنەوایی خۆی بداتەوەو هاوبەشی ئەو ڕایە بێت کە دەلێت شتەکان هێندە خراپ نەبوون وەکو دەردەکەون.

بەلام گەر تەنانەت لەدرککردن بەڕاستیەکاندا رەشبین بێت سەرەڕای ئەوە کاتێك پەیوەندی بەهیواو خواستەوە هەبێ ئەو گەشبینە.

"لـەو قەناعەتـەدام ئـەو ڕۆحـەی لەلایـەن ڕاستیەکانەوە دروست بوو بـەهێزترە لـەهێزی بارودۆخـەکان، بـەڕای مـن چارەنوسـێکی تـر چـاوەڕوانی مرۆڤایـەتی ناکـات جگـە لـەو چارەنوسـەی کـەخۆی بۆخۆی ئامادەی دەکـات لەڕێگەی شێوازی بیرکردنەوەو ڕەفتاریەوە. لەبەر ئەوە من باوەڕ ناکەم کـە ناچار بێت تـا کۆتـایی ڕێگەی دارمان ببڕێت... چونکـە مـن بـڕوام زۆرە بـەهێزی ڕاسـتیو بـەڕۆح، بـڕوام بـەئایندەی مرۆڤایەتی هەیە. جیهانی ئاکاریو ژیان سەلماندن هیواو خواستێکی گەشبینانەی تێدایە کە هـەرگیز لەدەسـت نـاچێت. لەبـەر ئـەوە هـەرگیز لەروبەڕوبوونـەوەی واقیعـی ناهـەموار مەترسـەو ببینە وەکو ئەوەی کە هەیە (Aus meinem Leben und Denken, P. 209 et seq.)

مرۆڤی بیرمەندی ئاکاری بەپەرۆشـیو هیـواوە سـەیری ئـایندەی کلتـورو مرۆڤایـەتی دەکـات. شڤایتزەر دەڵێت بەبێ ئەم هیـواو پەرۆشـیە واتـا ببیتە کەسێکی هـەژار. خۆگرێـدان پێیانـەوە واتـا ببیتە دەوڵەمەند. وەکو ڕەشـبینێك لـەدرك کـردن بەراسـتیەکانداو بـەلام گەشـبینێك کـە ویسـتو هیواکان مەبەستین، شڤایتزەر ئازایانە هەوڵدەدات مەشـخەڵێکی پرشـنگدار بباتـە نـاو سـەردەمێکی تاریکـەوە. شـکۆمەندی بـۆ ژیـان، بـڕوا بـە مرۆڤایەتیەکی نوێ، بڕوا بە ڕاستیو ڕۆح، بـڕوادار بەهێزی گەردونیانەی چاکە.

---

[i] بەئینگلیزی وەکو (My Life and Thought) _ژیانو هزرم).

[ii] Untergang des Abendlandes بەناوی The Decline of the West وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزیو بە (تدهور الحضارة الغربیة) وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی.

* الجبریة fatalism: بڕوابوون بە قەزاو قەدەر.

* ڕێبازی زیندوێتی Vitalism: ڕێبازێکـە دەڵێت کـە هـێزێکی کونـترۆلکردن هەیـە لەشـتە زیندووەکـانـدا کـە جیـاوازە لـەهێزە کیمیاوییو فیزیاییەکان.

[4] ناونیشانی ئەم کارە بە ئینگلیزی بریتیە لە The Spirit as Adversary of the soul بەکوردی دەکاتە "ڕۆح وەکو نەیاری دەروون"

<u>*سەرچاوە:*</u>

**Decline and Revival of Culture- The cultural philosophy of Albert Schweitzer.**
**Prof. Dr. Johan B. Hygan, University of Oslo**

# ستەمکاری

## خوێندنەوەیەکی کتێبی نۆیەمی کۆماری ئەفلاتوون


- فاروق ڕەفیق
- لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد


ئەفلاتوون تیۆریی خۆی لەمەڕ ستەمکاریی خستۆتەڕوو. کۆمارەکەی ئەفلاتوون تایپۆلۆژیایەك بۆ فۆرمە سیاسیەکان پێشکەشدەکات کە لەیەکەمین نمونەیدا بەپێی ژمارەی ئەو تاکانە پۆلێنراوە کەدەتوانن تێیدا بەشداربن. بەلای ئەفلاتوونەوە ستەمکاریی سیاسەتێکی دزێوە نەك لەبەرئەوەی کەفەرمانڕەوایی تاکە کەسە، بەڵکو لەبەرئەوەی بالادەستبوونی دەوڵەتە لەڕێگای ئارەزووە نزمەکانەوە. لەبەرامبەری ئەوپەڕی ستەمکارییدا، ئەفلاتوون دیموکراسی دانانێت بەڵکو سەروەریی عەقڵ دادەنێت، واتە دەستەڵاتی فەیلەسووف-پادشا بەسەرشاردا کەکارامەترین کەس بێتو کەمترین چێژو لەزەتیش لەدەستەڵاتی سیاسیو گەڕان بەدوای دەستەڵاتدا وەربگرێت. ئەفلاتوون بانگەشەی ئەوە دەکات کە ستەمکاریی ڕاستەوخۆ لەچاکترینو مەزنترین چەمکی دیموکراسییەوە وەبەردێت، واتە لەچەمکی سەربەستیەوە. ئەفلاتوون ستەمکاریی وەك دژی دادپەروەریی دادەنێت، بەلای ئەوەوە دادپەروەریی بریتیە لەئامادەکارییەکی هارمۆنیی بۆ بەریەککەوتنی ناوچەکانی شارو ململانێی ڕۆح. لەبەراوردیشدا ستەمکاریی بریتیە لەو ناهارمۆنییەتەی کە بەبڕوای ئەفلاتوون هەریەکە لەستەمکارو خەڵکی شاریش بەدەستیەوە دەناڵێنن، چ لەڕۆحیانداو چ لەناوچەکانی شارەکەشدا.

مەبەستی ئەم باسە لێکۆڵینەوەی گفتوگۆکەی ئەفلاتوونە لەمەڕ ستەمکاریی و پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی کتێبی نۆیەمە لەکۆمارەکەدا.

لەکتێبی هەشتەمی کۆماردا ئەفلاتوون پیشانی دەدات کەچۆن بۆچی شاری ئیدیاڵ پیر دەبێت و دادەوەشێت و، چۆن ئەو داوەشانە بەقۆناغی جیاجیادا تێدەپەڕێت تاکو دەگاتە نەخۆشیی ستەمکاریی کەئەمیش بریتیە لەلێکهەڵوەشانی تەواوەتی شاری ئیدیاڵە. قۆناغەکانی داوەشانیش دیارن، سەرەتا دەگاتە تیمۆکراسی (حکومەتی دەوڵەمەندان)و سیمای ئارەزووکردنی شەرەفمەندیی وەردەگرێت، پاشان دەگۆڕێت بۆ ئۆلیگارشی (حکومەتی کەمینە)و ئالوودەی ماڵ و سامان دەبێت، دوای ئەوەش دەگاتە دیموکراسی و حەزی سەربەستی. لەئاکامیشدا لەناو ستەمکاریدا نغرۆ دەبێت کەئەمیان لەبنەڕەتدا بریتیە لەشاری ئارەزووە بێسنوورەکان. بەرلەوەی لەشاری ستەمئەنگێزو ستەمکارو گیانی ستەمکاریی بکۆڵینەوە، دەبێ سکێچێك بۆ شاری دیموکراسی و پیاوی دیموکراس بکێشین، ئەم کارە زۆر پێویستە چونکە لەدوا شیکاردا ستەمکار جگە لەبەرجەستەکردنی تەواوی خۆزگە دیموکراسیەکان شتێکی تر نیە، دیموکراسی دایکی ستەمکارییە.

دیموکراسی "555b3-562a3" یاخود شاری دیموکراسی لەوکاتەدا دەردەکەوێت کەشاری ئۆلیگارشی بەهۆی پیسکەیی و چاوبرسێتیەکی زۆرەوە هەرەس دێنێت. چونکە نە ئارەزووی ئەوان بۆ سامان و نەخودی سامان هیچ سنوورێکیان بۆ نیە. ئەم زیادەڕۆییەی فەرمانڕەوا دەبێتە هۆی پێ‌ڕاکێشانی خەڵکیش. یاسا ڕێیان لێناگرێت موڵك و سامانی خۆیان بەفیڕۆ بدەن و




هەژاربکەون، بۆیە هەژاران ڕق لەدەوڵەمەندان هەڵدەگرن و لەدژیان پیلان دەگێڕن. خەبات و ململانێ شار دادەگرێت و لەگەڵ سەرکەوتنی هەژاراندا دیموکراسی سەرهەڵدەدات.

دیموکراسی لەسەر دوو پرەنسیپی مۆڵەق دادەمەزرێت: یەکسانی و سەربەستی. یەکسانی بڕیار دەدات هاونیشتمانێتی و ئەرکەکانی سەرشان دابەش بکرێن (557a4-5)، سەربەستیش جاڕ دەدات کەهەر کەسێك چی بوێت دەتوانێت بیکات. پرەنسیپی دووەمیان پرەنسیپێکی ناوییە "nominal" خۆی لەمەرجەکانی ئیحتیمالە راستەقینەکان گێل دەکات "55767". دیموکراسی پڕێتی لەهەموو جۆرەکانی مرۆڤ و هەموو چەشنە پێکهاتەکان. لێرەدا جەختکردنەکە لەسەر ئەم جیاوازیی و فرەچەشنی و مۆڵەتی بەیەکگەیشتنیان و پێکەوە لکان و یەکگرتنیانە لەشاری دیموکراسیدا.

لە"9-558d5"دا سۆکرات باسی جیاوازیی نێوان ئارەزووە پێویستەکان و ئارەزووە ناپێویستەکان دەکات و، بیرۆکە پێویستی فراوان ڕەت دەکاتەوە بۆئەوەی تەنیا ئەو ئارەزووانە

بگرێتــەوە کــەتێرکردنیان چاکــەی خۆمانـــەو بەهەموو ئـەو ئارەزووانـەش دەڵێـت ناپێویسـت کـەتێرکردنیان هیـچ چاکەیـەکی بـۆ خۆمـان تێـدا نیە، یاخود ئازاریان هەیە، وەکو ئەو ئارەزووانەی کـە ئەگـەر لەلاوێتییـەوە مەشـق بکرێـت بـۆ خۆلێقوتارکردنیـان، مـرۆڤ دەتوانێـت رزگـاری ببێت لێیان. لێرەوە پیاوی دیموکراس لەوساتەدا سەرهەڵدەدات کەپیاوی ئۆلیگـارش دنە دەدرێت زیاترو زیاتر دەستبڵاوبێتو زۆرتر سـەرف بکات. ئەو لێوان لێوە لەتێکۆشانو ململانێ لەنێوانی ئەو ئارەزووانــەو ئـارەزووە پێویسـتەکانی خۆیـدا. پیـــاوی دیموکـــراس بـــەوە دەناســـرێتەوە کەنەخشەیەکی نیە بۆ بەرێوەبردنی ژیانی خۆی.

لەشـــاری دیموکراســـیدا، هاوپـــەیمانێتی سـەربازییو گـروپو دژە گـروپو دورکەوتنـەوەو گەڕانـەوەو شۆڕشـی وشـەکان بوونیـان هەیـە. خـــەباتێك هەیـــە کەبەقســـەو پێشـــنیار بەڕێوەدەبرێتو لاوانیش گوێی لێدەگرن. ئاخاوتن هـانی بێشـەرمی دەداتو وەکـو جوامـێریی، خوێڕیەتی وەك رۆشنبیریی بـەرز، پەشـێویی وەك سەربەستی، خۆڕانانو بەخۆنازین وەك هەیبـەتو شـکۆداریی، هـانی هـەموو هـەموویان پێکـەوە دەدات. ئـەو ئاخاوتنانـە بـەناوی سەربەسـتیەوە، سـڵەمینەوەو پاشـەکەوتکردنو شـەرم لـەناو دەبەن. لە"562a-564b"دا سۆکرات هوشیارانە ئاشـکرای دەکـات کەدیموکراسـیش بەهـەمان شـێوەی ئۆلیگاریشـی بەخشـندەییو سـنگ فراوانیەکی زێدەڕۆ هەرەسی پێدەهێنێت.

هۆکەشی ئەو شتە باشـەیە کـەپێی دەوترێت سەربەستی. لەدیموکراسـیدا سەربەسـتی دەگاتـە خـاڵی گێرەشـێوێنی چونکـە هـەمووان یـەك مامەڵـەیان لەگـەڵدا دەکرێـتو هـەوڵیش دەدەن وەکو یەکتریی ڕەفتار بکەن، ئەمەش بـەپێی ئـەو ڕاستیەی کەهەموان دەیانـەوێت خۆیـان لەچوونە ژێر ڕکێـف بپارێزن. ئـەم زێدەڕەوییـە لـەئازادیدا دەگـات بەسـتەمکاریی. لـێرەدا ئازادیـەکی زۆر کۆیلایەتیەکی زۆر بەرهەم دێنێت.

لـە"562"دا سـۆکرات لەسـەر پێکهاتـەی ستەمکار دەدوێت. سـەرەتا باسـی تیۆرەکـەی خـۆی دەکـات لەمـەڕ سسـتمو سـەرکردایەتیو سـیفەتەکانی، بـەڕوونی دەربـارەی سـتەمکارو ستەمکاریی دەدوێت. قسـە لەسـەر شـاری ستەم ئەنگێزو گیانی ستەمکارانە دەکات. ئەوەی گرنگە ئەو جیاکارییەیە کەلـەنێوانی ستەمکارییو پێش خۆیدا دەیکات، ئەمە لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە ئـەو جیاوازیـــەی کـــە لـــەنێوان خاســـیەتە ستەمکاریەکانو خاسیەتی ستەمکاردا دەیکات. لـە"564"دا سـۆکرات پرسـیارێك دەخاتـەڕوو دەربارەی گۆڕانی سەرکردەی خەڵك بۆ ستەمکار. لەوەڵامیشدا چیرۆکێك دەگێڕێتەوە:

*ئایا شتێکی ئاشکرانیە کە لەکاتێکدا ئـەوە ڕوودەدات کەسـەرکردە وەك ئـەو پیـاوە دەجووڵێتـەوە لـەچیرۆکی پەرستگاکەی زێوسـی لیکاونیدا باس کراوە، پەرستگاکەی ئەرکادیا؟*

- *ئەوە کام چیرۆکەیە؟*

*ئـەو چیرۆکـەی دەڵێت ئەگـەر مـرۆڤ تـامی گۆشتی مـرۆڤ بکات، لـەکاتێکدا ئـەو گۆشتە لەگەڵ گۆشتی قوربانیە پیرۆزەکانی تـردا تێکەڵ کرابێت، ئـەوا ئـەو مرۆڤـە دەبێت بەگورگ. ئـەم چیرۆکەت نەبیستووە؟*

- *با.. بیستومە.*

*ئەی هـەمان شت نیە بۆ ئـەو سـەرکردەیەی کەجڵەوی خەڵکی گرتۆتە دەستو سڵ لەڕشتنی خوێنی کەس‌وکاری خۆیشی ناکاتـەوە؟ بـەتاوانی هەڵبەسـتراو خـەڵك ڕادەکێشـێت بـۆ دادگـاو دەیانکوژێت (وەك چـۆن سـتەمکاران هەمیشـە*

*هەروا دەکەن)، بەڕشتنی خوێنی مرۆڤ لێوی و زمانی پیسی تامی خوێنی خەڵك و خزمی خۆی دەکات. هەندێك دەردەکات و لەملی هەندێکی تر دەدات، بەڵێنی درۆ دەدات بەخەڵك دەربارەی سڕینەوەی قەرزی سەرشانیان و سەرلەنوێ دابەش کردنەوەی زەوی و زارەکان. پیاوێکی بەمجۆرە، بەهۆی ئەم شتانەوە یان بەدەستی دوژمنەکانی دەکوژرێت، یاخود دەبێت بەستەمکار و لەپیاوێکەوە دەگۆڕێت بۆ گورگێك* "565d5-566a3".

دیسان پیشەی ستەمکار بەڕێگایەکی چارەنوسیدا دەڕوات. دەرکراوەو لەجاران بەهێزتر گەڕاوەتەوە. دوژمنەکانی دەتۆقێنێت و داوا لەخەڵك دەکات ببن بەپاسەوانی و خزمەتی پاسەوانەکانی خۆی دەکات. هەڕەشەو گوڕەشە لەساماندارەکان دەکات، دنیایەك بەڵێنی زیادەڕۆ دەدات و زۆربەشیان ناباتەسەر، بگرە لەجیاتی ئەوە بەشەڕو شۆڕەوە خەریکیان دەکات و وایان لێدەکات جگە لەکاری ڕۆژانەیان فریای هیچی تر نەکەون. هەوڵی بنەبڕکردنی شتە چاکەکان و لەناوبردنی پیاوانی بەشەرەف دەدات "566D5"و لەگەڵ ئەوانەدا لەقەڵەمیان دەدات کەوێراویانە ڕەخنەی لێبگرن. سەرەنجام هەتا بێت زیاتر دەبێتە هۆی مەترسی بۆ ژیانی خۆی. لەبەرئەوەی متمانەی بەکەس نیە لەشاردا بەناچاری پەنادەباتە بەر خەڵکی بیانی و بەپارە رایان دەگرێت، ناچاریش دەبێت کۆیلەکان ئازاد بکات. شاریش کەپێشتر سەربەست بوو، هەژارو داماو و گەمارۆدراو و تۆقێنراو دەکەوێت. بۆیە دەبێ ستەمکار بەچاوێکی تیژەوە چاودێری هەموو پیاوێکی بەجەرگ و بیرفراوان بکات، هەموو پیاوێکی زانا یان دەوڵەمەند.

هەربۆیە پێویستی بەپاسەوانی شاهانەی زۆرتر دەبێت و هەتا بێت جولانەوەکانی زیاتر رقی خەڵك هەڵدەستێنێت "567b10-567d5". ئەم شتانە بۆچی ڕوودەدەن؟ سۆکرات ڕوونی دەکاتەوەو پێی وایە شاعیرانی تراژیدیا لێپرسراون بەرامبەری بوونی ستەمکاریی، بەتایبەتی یۆربیدس:

*بەخۆڕایی نیە کەتراژیدیا بەگشتی شۆرەتێکی دانایی هەیەو یۆربیدسیش بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش دەرکەوتووە.*

— بۆچی

چونکە *لەناو ئەو شتە پڕ ژانانەدا وتویەتی "ستەمکاران خەڵکێکی دانان و هاوڕێیەتی دانایان دەکەن". ئەو بەڕاشکاوی ناوی ئەوانەی هێناوە کەدەبن بەهاوەڵی ستەمکار. بەڵێ ئەمیش و شاعیرانی تریش پەسنی ستەمکاریان داوە وەکو خوداوەندو گەلێ شتی تری لەو بابەتەیان وتووە. کەواتە مادام شاعیرانی تراژیدیا دانان، ئەوە بەدڵنیاییەوە لێمان دەبوورن ئەگەر لەناو دەستورەکەی خۆماندا قبوڵیان نەکەین و لەشاری خۆماندا وەریان نەگرین چونکە ستایشی ستەمکاریان کردووە."* 568a6-b6".

شاعیرانی تراژیدیا ستایشی ژیانی ستەمکار دەکەن و هاوڕێی ستەمکاریشن. شانۆ نامەکانیان بەسەر ناوچە جیاجیاکاندا دەگەڕێن و جەماوەر بۆ ستەمکاریی و دیموکراسی کێش دەکەن. جێگای سەرنجە کەزمانی ستەمکاری شتی ناشەرعیی دەکات بەشەرعیی. تاقە وشەیەك تەرخاندەکات بۆ بەرجەستەکردنی پاڵەوانێتی، کەلەتوێی ئەوەوە پارێزگاری لەهەموو مانا ئەسیناییەکانی دەکات و دەشێ تاریفی پادشایەکی خۆرەڵاتی بکات. ستەمکار هێشتا هەر سەرقاڵی ئەوەیە نەهێڵێت کەس سەربەست بێت و هەموان

لەبەردەمیدا بچەمێنەوە وەك ئەوەی خوداوەندێك بێت. خەڵكیش بڕوادێنن كەلەدەستچوونی ستەمكارێكی هاوشێوەی یەزدان شتێكی خەمناك دەبێت، بۆیە شتە نارەوشتییەكانیشی وەك ئاسایی دێتە بەرچاویان، هەروەكو تەلاقدانی جوانی لەدادپەروەریی.

سۆكرات دیموكراسی دەلكێنێت بەستەمكارییەوە. لەسەرەتای كتێبی دووەمدا گلۆكۆن بەشێوەیەكی شاراوە پێشنیاری ئەم پێككەیشتنە دەكات. زۆرینە حەزیان لەدادپەروەری نیە بەڵكو لەجیاتی ئەوە تامەزرۆی ژیانی ستەمكارانەن. هەموو پیاوێك ستەمكارێكە بۆ خۆی یاخود دەشێ فەنتازیای دیموكراس بووبێتە هۆی ئەوە. سۆكرات دەیەوێ پیشانی بدات كە لەم ژیانەدا ئارەزوویەك هەیە بۆ ناعەدالەتییو كاریگەریی پراكتیكیی ئەمەش بریتیە لەلاوازبوونی بەرگریی لەڕووی ستەمكاردا. بەمە ئەو بازنەیەی كە لەكتێبی یەكەمدا بۆ دادپەروەیی كێشرا تەواو بوو. دادپەروەریی لەستەمكاریدا لەوەزیاتر نیە كە تریماخۆس وتویەتی: دادپەروەریی سوودی بەهێزەكانە. ئێستا ئەو ستەمكارەی خەڵكی فریوداو لاوازی كردن، بەهێزترە. لەگەڵ دادپەروەرییەكدا كەكورتكرابێتەوە بۆ دەستەڵات، خەڵكانی لاواز بێجگە لەملكەچكردن چارەیەكیتریان نیە، ئەوان بوون بەكۆیلەی كۆیلەكان:

*بەهەوڵدان بۆ خۆلادان لەوەی پیاوە سەربەستەكان بكرێن بەكۆیلە، خۆیان كەوتنە ناو ئاگری ئەوەوە كە كۆیلەكان ببن بەسەرداریان، ئەمەش لەجیاتی ئەو سەربەستیە مەزن و نەگونجاوەی كەلەژێر سایەی دیموكراسیدا بەدیهات، خۆیان خستە ژێر زەبری تاڵترین و ئەستەمترین كۆیلایەتیەوە بۆ كۆیلەكان "* 5 56967-c3" .

ئێستا پرسیارەكە بۆ هەریەكە لەسۆكرات و ئەدیمانتۆس ئەمەیە:

*من دەڵێم ماوەتەوە ئەوەی سەرنجی خودی پیاوی ستەمكار بدەین، چۆن چۆنی لە دیموكراسییەتەوە بەرزدەبێتەوە بۆ ستەمكاریی و، كەوای لێهات ئینجا لەچی دەچێت! ئایا لەژیانی خۆیدا بەدبەخت دەبێت یان پیرۆزكراوو كامەران "* 3-571a1" .

پێویستە ئێمە لەدوو ئاستەوە سەرنجی خودی پیاوی ستەمكار بدەین: ئاستی سیاسیی و ئاستی شەخسیی. لەسەر ئاستی سیاسی جارێكی تریش دەڵێین كەهۆی گۆڕانكارییە سیاسیەكان دەگەڕێتەوە بۆ بەشبەشبوونی شارەكە. خەباتی نێوان سێبەشەكەی شار لەسستەمی دیموكراسیدا دەبێتە هۆی دەركەوتنی ستەمكاریی. سێبەشەكەش "564d - 565a" بریتین لەمشەخۆران و پارەدارە زەنگینەكان و سەرباقی خەڵك. بەم پێیە كە سەركردەكان هەوڵ دەدەن پارە بۆ خۆیان و خەڵكەكەشیان دابین بكەن، دەوڵەمەندان بەپیلان گێڕان دژی خەڵك تاوانبار بكەن، خەبات و ململانێ دەستپێدەكات. دەوڵەمەندانیش لەبەرامبەردا هەوڵ دەدەن ئۆلیگارشیانە رەفتاربكەن. خەڵكی پیاوێك دەكەن بەپاڵەوانی خۆیان و بەمەش ستەمكاریی سەر هەڵدەدات. سۆكرات دەڵێت:

*ئێستا، خەڵك عادەتیان وانیە كەپیاوێك بكەن بەپاڵەوانی خۆیان و مەشقی دابدەن و بایەخی پێبدەن و مەزنی بكەن؟*

*— بەڵێ، وایە*

*ئەی روون نیە کە کاتێك ستەمکاریی سەرهەڵدەدات، ئەم سەرکردایەتیە تایبەت دەبێت بەڕەگو زەمینەی گەشەکردنی؟ "* 565c9-d2 " .

پیاوی لەم چەشنە بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات پەنادەباتە بەر هەمووتاوانێك، بەشێوەیەکی گشتیی ستەمکار هەمیشە هەوڵی هەڵگیرساندنی جەنگ دەدات بۆئەوەی خەڵکی پێویستیان بەسەرکردەیەك بێت و بواری ئەوەشیان نەبێت دژایەتیی بکەن. گەر خەڵك هەوڵ بدەن لەدەستی ستەمکار رزگاریان ببێت، ئەوا ئەو دوو دڵ نابێت لەوەی بەڕەقی لەگەڵیان بجولێتەوە. ستەمکار بەرجەستەبوونی خۆزگەکانی دیموکراسییەو، هەرچییەك بخوازێت دەیکات، ئەو بابەتی ئارەزووە دیموکراسییەکانە، خۆی ئیرۆسە.

لەسەر ئاستی شەخسی، ژمارەی ئارەزووە ناپێویستەکان لەپیاوی ستەمکاردا زۆرەو بەهێزیشن. ئادامنتۆس پرسیار لەو ئارەزووانە دەکات و سۆکراتیش لەوەڵامدا باسی جیهانی خەونەکان دەکات.

بەپێی سۆکرات کەسێتی ستەمکارانە لەناو هەموو کەسێکدا بەنوستوویی هەیەو لەناو خەونەکاندا دەناسرێتەوە، کەلەوێدا سڵ ناکاتەوە لەهەر رەفتارێك و جووتبوون لەهەر مرۆڤێك و لەیەزدانیش، سەری هەموو شتێك دەپەڕێنێت و هەموو جۆرە خۆراکێکیش دەماشێتەوە. سۆکرات بەم ئارەزووانە دەڵێت ئارەزووی پێشێل کردنی یاساو پێیان ناڵێت ئارەزووی ناسروشتی. ئەم ئارەزووانە لەجەوهەردا لەشێمانە واقیعییەکان جیا دەبنەوە، چونکە هیچ خواوەندێك خۆی لەخوداوەندەکانی شیعر جویَناکاتەوە کەئەوان ئامادەبوونێکی سێکسییان هەیە. خوداوەندەکان بابەتن بۆ ئارەزووە ناپێویستەکان، ئەو ئارەزووانەی کەپێویست نین بۆ بوون و مانەوەیەکی باش. بۆیە ژمارەیەك ئارەزووی کێویی و دڕندە هەن کە لەکاتی خەوپێداکەوتنی بەشە داناکانی رۆحدا بێداردەبنەوە:

*کاتێك بەشەکانی تری رۆح - بەشە ژیرو ماقوڵ و جڵەوگیرەکان - خەویان لێدەکەوێت، بەشە وەحشیی و دڕندەکە بەتێری و پاراویی رادەپەڕێت و بەدوای دەروازەیەکدا دەگەڕێت خۆی بخاتەڕوو. خۆت دەزانیت لەوساتەدا لەهیچ شتێك ناسڵەمێتەوەو لەهەموو رکێفێکی شەرم و عەقڵ دەربازیبووە.. لەلایەکی تریشەوە پێم وایە کەسی تەندروست و میانڕەو لەگەڵ خۆیدا، ئەم شتانەی خوارەوە ئەنجام دەدات ئینجا دەنوێت: سەرەتا هۆشی وریا دەکاتەوەو بەتێرامانێکی بەرزو بڵندەوە خەریکی دەکات. ئارەزووەکانی خۆی سەرکوت ناکات و بەرەڵاشیان ناکات، بۆئەوەی هیچ ژانێك و هیچ چێژێك بەشە پاك و بێگەردەکەی دەروون نارەحەت نەکات و بتوانێت بەئاسوودەیی بۆ شتێك بگەڕێت کەخۆشی نازانێت چیەو هەوڵ بدات دەرکی پێبکات، ئەوشتە چ لەرابووردودا یان ئێستا یا لەئایندەدا بێت. پاشان هەوڵ دەدات خۆی زاخاو بدات و خۆی هێور بکاتەوە، بۆ نمونە ئەگەر تۆزقاڵێك ماندوویی لەرۆحیدا مابێت ئەوا ناخەوێت "* -561C3 572a3" .

ئەمە زۆر نائاساییە، بەڵام بەکارهێنانێکی زۆر فەلسەفییانەی ئەوکاتەیە کەتێیدا خەڵکانی‌تر لەکاری رۆژانەیان دەحەوێنەوە. ئەو هەرچەندە باس لەمەشقی هێمنانەی پیاوی داناو سەنگین دەکات، بەڵام پرسیارەکەی لەمەڕ دوو حاڵەتی دژە: یەکەمیان ئەندێشەی دڕندەو کێوییانەی جووتبوون و دووەمیشیان دەرك کردن بەحەقیقەت لەناو بەشە ژمێردراوەکاندا. ئەمانە

خەونـەکانی سـتـەمکارو فەیلەسـوفن. بـەلای سۆکراتەوە ئـیرۆس سـەروەری هـەموو ئـارەزووە ناشەرعییەکانە. گـەر ئـەم ئیرۆسـە هـی سۆکرات یاخود دیاریمە بوایـە ئـەوا نارەزاییەکە لـەجێی خۆیدا دەبوو. بـەلام شـاعیران بالْیـان بـەئیرۆس گرتـووەو نازنـاوی سـتـەمکاریان پێبەخشـیوە. ئیرۆسی شـاعیران تـەنیا هـەر ئارەزوویـەك نیـە بـەلْکو بابـەتی هـەموو ئارەزووەکانیشـە، لـەتوێی ئەوەوە دلْدار خۆی لەلای خۆشەویستەکەی ئـازیز دەکاتو تەواوی لێپرسراوێتی دەکاتـە سەرشانی خۆی. ئـیرۆس پـرە وەك دولبـەر، بەتالْـە وەك دلْـدار، ئـیرۆس تـەواوی نارەزاییـەکانی دلْـدارو سەرپاکی بالادەستیەکانی دلْبەر دەگرێتەخۆی.

پیاوی ستەمکار کـوڕی پیـاوی دیموکراسییە. کوڕێکە خـەلْکی بـەرەو ئـارەزووە ناشـەرعییەکان هانیان داوە، بـەوەی ئیرۆسـیان تێدا بزواندووە. پیـاوی سـتـەمکار بـەئارەزووە ناپێویسـتو ناشـەرعییەکان ناسـراوەو باوکیشـی نـاتوانێت بیگەڕێنێتـەوە بۆ سـەر ئـارەزووە پێویسـتەکانو ژیـانێکی میـانڕەوی راسـتەقینە. ئـیرۆس لـەم پیـاوەدا بۆتـە سـەرکردەی هـەموو ئـارەزووە ناپێویستەکان. ئـیرۆس ستەمکار لـەناو رۆحـدا شێتی دەبەخشێت بەپاسەوانە چەکدارەکانی، لەم رێگایەوە هەموو میانەڕەوییەك تێك دەشکێنرێتو شێتییەکی سەمەرە دادەگرێت:

*ئایـا لەبـەر ئـەم هۆیەیـە کـەزۆرجار بەخۆشەویستی ئیرۆتییانە گوتراوە ستەمکار؟*

*— دەشێ وابێت.*

*کەواتـە، ئایا پیـاوی مەست شتێك لەعـەقلی ستەمکارانەی تێدا نیە؟*

*- بەلێ، تیایەتی.*

*هەروەها ئەگەر پیاوێك شێتو ناتەواو بێت، هەولْدەدات نەك تەنیا فەرمانڕەوایی مرۆڤ بـەلْکو هـی خواوەندەکـانیش بکـاتو بەنیازیشـە لەهەولْەکەیدا سەرکەوتووبێت.*

*— بێشك وادەکات.*

*کەواتە بەمانای وردی وشەکە، پیاو لەوکاتـەدا دەبێتـە سـتەمکار کـە بەسروشـتی خـۆی یـان شێوازی ژیانی، یاخود هەردووکیان وای لێدەکـەن مەست بێت، پڕبێـت لـەئارەزووی ئیرۆتییانـەو شێتیش بێت" 5732b6-c8".*

سۆکرات لەناو شەهییەتە جیاجیاکـانی بەشـی خـوارووی رۆحـدا، واوەسـفی ئـیرۆس دەکـات کـە سروشتێکی تایبەتی هەبێتو بەهۆیـەوە بتوانێت سەرکردەی شەهییەتەکان بێـتو دواتریش ببێت بە سـتـەمکار لـەناویاندا. لـەپیاوی سـتـەمکاردا ئـیرۆس ئاراستەکان دیـاریی دەکـاتو رێنمـایی دەکـات بـۆ هـەموو جـۆرە تـاوانو کردارێکـی بێشـەرمانە. لەڕاسـتیدا ئـەو پیـاوە وەکـو ئافەریدەکـەی نـاو خەونـەکانی لێدێـت. لەخـەوندا شەهییەتەکان خۆیان خستبووە ڕوو، بۆیە دەبێت بە نادادپەروەرترین کـەس. کـەئیرۆس بالادەست دەبێت ئەوبەشەی رۆح فەرمانڕەوایی بەشەکانیتر دەکات، تارادەیەك هەر ئەویش گونجاوترینیانە بۆ فەرمانڕەوایی. فەرمانڕەوایی ئـیرۆس پـەیوەندیی هەیە بەنەبوونی رێنیشـاندەرێکەوە بـۆ تـێرکردنی رێکوپێکی ئارەزووەکان. چونکە ئەوەی بکەوێتـە ژێـر کاریگـەریی ئـارەزووەوە وەك دومـەلْێکی گەییوی لێدێتو دەبێ بتەقێت، نـاتوانێت تـەرکیز بخاتەسـەر هـیچ کـارو چالاکییـەك هەرچـەندە ساناش بێت. سـتـەمکار سێبەری ئەشکەوتەکەیە لەبـەر رۆشـناییدا، بەرجەسـتەبوونی ئـیرۆسو نوێنەری بە سیاسەتکردنی ئارەزووەکانە. لـێرەدا تورەییو خۆشەویستی دەبن بەیەك.

*سۆکرات زیاتر لەسەر ژیـانو رەفتـاری پیـاوی ستەمکار دەدوێت:*

*ئێستا، هەرچۆنێك بێت، لەژێر باری خۆشەویستییەکی ئیرۆتیدا، لەبێداریشدا هەر پیاوی ناو خەونەکانەو کۆناکاتەوە لەهیچ تاوانێکی دزێوو هیچ رەفتارێك‌و هەڵلوشینی هیچ جۆرە خۆراکێك. بەڵکو تارادەیەکی وەها کەژیانە ئیرۆتیانەکەی ستەمکار، لەخۆیدا وەك ئەوەوایە شارێك بێت‌و خۆی قووتی تاقمە گێرە شێوێنەکەی لایەنگری پەیدابکات‌و لەم پێناوەشدا هەموو شتێك بکات (هەندێك لەئەندامانی تاقمەکەی لەدەرەوە هاتوون‌و ئەوانیتر هی ناوەوەن‌و سەربەستییان بۆ گەڕێنراوەتەوەو بەهۆی بەدرەفتارییانەوە بەرەڵا کراون). ئەمە نیە ئەو ژیانەی کەستەمکار دەیگوزەرێنێت؟*

*– بەڕاستی وایە* "574e3-575a7".

ئێستا دەتوانێن لەقسەکانی سۆکراتەوە چی هەڵبهێنجین؟ پێویستە جەخت لەوەبکەین کە ئیرۆس رۆح دەکاتە ستەمکار، پیاوی ستەمکار ئەو پیاوە خەمۆك‌و نیگەرانەیە کەدەیەوێ نەك تەنیا حوکمڕانیی مرۆڤ بکات، بەڵکو هی یەزدانیش، ستەمکاریی بەرەنجامی پێداهەڵگوتنی ئەو ژیانەیە کەشاعیرانی تراژیدیا پەسنیان داوە، ستەمکاریی هەمیشە مەترسییە بۆ سەر شارەکان‌و پیاوەکان. هەریەك لەئێمە خۆی لەخۆیدا ستەمکارێکە. دواجار ستەمکار لەدەرکەوتنیدا نائاساییە، بەڵام لەشێمانەکانیدا وا نیە.

سۆکرات بەرلەوەی دەربارەی بەکۆیلەکردن‌و ناعەدالەتی بدوێت هەنگاوێکی تریش دەنێت بەرەو جیاکردنەوەی خاسیەتەکانی ستەمکارو ستەمکاریی، ئەمەش پرسیارەکەی کتێبی دووەممان بیردەخاتەوە لەمەڕ دادپەروەریی، لەکتێبی دووەمدا تیۆرەی سەرەکیی‌و بنەڕەتی لەمەڕ دادپەروەریی هەیەو لەو کاتەوە کە بەراوردێکە لەنێوانی شارو رۆحدا. هەر رژێمێك جۆرە پیاوێکی بۆ دەگونجێت، هەر شارەو پیاوێك هەیە کەبۆی دەشێت – وەك ئەنجامێکی لۆژیکییانە لەبەرامبەری شارێکی ستەمئەنگێزدا گیانێکی ستەمکاریش هەیە. چونکە لەهەردوو رووی تایبەتی‌و گشتییەوە گیانی ستەمئەنگێز بەکەڵکی پیاوی ستەمکاردێت.

بابگەڕێینەوە بۆ سەر کتێبی دووەم، سۆکرات بەراوردێك دەکات لەنێوانی ژیانی پیاوی دادپەروەرو نادادپەروەردا:

*بەگریمانەکردنی کەسێکی‌وا، با پیاوێکی دادپەروەر بخەینە تەنیشتیەوە، کەئەمیان سادەو خانەدانە، وەك ئەسخیلیۆس دەڵێت ئەم پیاوە نایەوێت باوەڕی پێبکرێت کەباشە بەڵکو دەیەوێ باش بێت. دەبێ ناوبانگ‌و شۆرەتەکەی لێ‌دووربخەینەوە، چونکە شۆرەتی دادپەروەریی پاداشت‌و شەرەفی پێ‌دەبەخشێت، ئەوساش بۆمان روون نابێتەوە کەئایا لەپێناوی دادپەروەرییدا دادپەروەرە یاخود لەپێناوی شەرەف‌و پاداشتدا. بۆیە دەبێ لەهەموو شتێك رووتی‌بکەینەوە دادپەروەیی نەبێت، تاکو لەبەرامبەری پیاوی نادادپەروەردا دایبنێین، ئەوکاتە جگە لەدادپەروەرییەکەی هیچی تری بۆ نامێنێتەوە، دەتوانین تاقی‌بکەینەوەو، بزانین ئایا بەخراپ باسکردن‌و سەرەنجامەکانی کاری تێدەکرێت یان نا، با لەسەر ئەم حاڵە بەجێگریی بمێنیتەوە وەتا دەمرێت دادپەروەر لەناوەوەداو ستەمکار لەدەرەوەدا. بەم رێگایە هەردووکیان دەگەنە لوتکە، یەکێکیان لوتکەی دادپەروەریی‌و ئەویتریان لوتکەی نادادپەروەریی، ئەوساش دەتوانین بڕیار بدەین کەکامیان بەختەوەرترە* "861b6-ds".




لەكتێبی نۆیەمدا سۆكرات بەخۆشحاڵییەوە بانگەشەی خۆی لەمەڕ پیاوی دادپەروەرو پیاوی نادادپەروەر دەخاتەڕوو، دەڵێت پیاوی دادپەروەر لەهی نادادپەروەر باشترە، لەوەڵامدا تاڕادەیەك درێژ لەسەری دەڕواتو دەڵێت:

*سەرەتا، ئاخاوتن لەسەر شار، تۆ پێت وایە شاری ستەمئەنگێز سەربەستە یان بەكۆیەلكراوە؟*

*-ئەو شارە چەندی بشێت كۆیلەیە!.*

*لەگەڵ ئەوەشدا خەڵكانێك هەن كەسەربەستو سەردارن.*

*- خەڵكێكی كەم دەبینم وابن، زۆربەی خەڵك كۆیلەی بێچارەن.*

*كەواتە ئەگەر مرۆڤو شار وەكو یەك وابن، نابێ هەمان شتیش لەمرۆڤدا ڕووبدات؟ نابێ ڕۆحی پڕبێت لەكۆیلایەتیو ژێردەستیی، شەرەفمەندترین بەشی دەروونی دابەزێت بۆ ئاستی نزمترینو بێبەهاترینو پووچترینیان ببێت بەسەردارو سەرۆك.. ئینجا گیانی ستەمكارانە - من دەربارەی گیان دەدوێم - كەمترین شت بەئەنجام دەگەیەنێت لەوانەی كەدەیەوێت، لەژێر زەبری هەراسانیو نائارامیدا ئەنجامیان دەداتو ناڕەحەتو خەمبار دەبێت "577c5-c1".*

سۆكرات ئاماژە بۆ گلۆكۆن دەكات، ئەو دەربارەی ئەو دوانە دوا بوو كەیەكەمیان بەدبەختی لێنەگەڕاوە ببێتە ستەمكارو ئەویتریشیان بووە بەستەمكارێكی ڕاستەقینە "572c3". ئەم پیاوە ستەمكارانە، پیاوە تایبەتەكانیان خێرا ناناسرێنەوە، گریانو نوزە نوزو دادو فیغانیان قەت تەواو نابێت. بەڵام پرسیارەكە هەر دەمێنێتەوە؛ پیاوێكی ستەمئەنگێز چۆن دەبێتە ستەمكارو مەرجەكانی ڕوودانی ئەم گۆڕانكارییە چین؟.

*بەڵام چ دەبێت گەر خواوەندێك یەكێك لەو پیاوانە بەخۆی و ژنو منداڵو كۆیلەكانییەوە "زیاتر لەپەنجا كۆیلە" هەرهەموویان لەشارەكە دووربخاتەوەو فڕێیان بداتە بیابانێكەوە، كەلەوێدا هیچ پیاوێكی سەربەست بەهانایەوە نەیەت؟... ئایا ناچار نابێت ماستاو و مەرایی بۆ هەندێك لەكۆیلەكانی خۆی بكاتو بەڵێنی شتی زۆریان پێبداتو سەربەستیان بكات، ئەگەرچی هەزیشی بەوە نەبێت؟..* 578c1-579a1.

*كەواتە ئایا ئەم خەرمانی خراپەكارییانە پێوانەیەك نیە بۆ جیاوازیی نێوان ئەو پیاوە ستەمكارەی كە ناوەوەی بەجڵەونەگیراوی ماوەتەوە - ئەوەی كەئێستا وتت بەنرخترین كەسە - لەگەڵ ئەوەیاندا كەژیانێكی تایبەتی نیە، بەڵام بەهۆی هەڵێكەوە ناچاربووە ببێت بەستەمكار، هەوڵ دەدات خەڵك بەڕێوەببات لەكاتێكدا كەكۆنترۆڵی خۆی پێناكرێت؟ ئەو جەستەیەكی ماندووە كەناچارە بەدرێژایی ژیانە تایبەتیەكەی خۆی ناچارە بەدرێژایی ژیانی*

*جەنگو ڕكابەریی لەگەڵ جەستەكانی تردا بكات "579c3-d1".*

*مەبەست لەم وێنەیە باسكردنی پیاوی ستەمئەنگێزە كەچۆن دەبێتە ستەمكارو شارەكەش دەبێتە شاری ستەمكاریی. هەروەها بەپێی "578-80" ئاشكرایە كەستەمكاریی خراپترین شێوازە بۆ شارو ئەو هاونیشتمانیانەش كەدەبن بەكۆیلەو كەمترین شتیان پێدەبڕێت. هەروەها پیاوی ستەمكار بەدبەخترین پیاوە چونكە ئەزمونی ئەشكەوتەكە بەرجەستە دەكاتو ناچاردەبێت لە ماڵەكەی خۆیدا لەناو زیندانی شاردا بژی. كەواتە ستەمكار ئەو دیلكراوەی ناو ئەشكەوتەكەیە كە وەهمەكانی ناو ئەشكەوتەكەی ئارەزوو كردووە. نادادپەروەرترینو بەدبەختترین پیاو ئەو ستەمكارەیە كەخودی خۆیو شارەكەش ستەمكارانە بەڕێوەدەبات "585b8-c5" زیاد لەو ناڕەحەتیانەی كەوەك ستەمكارێك دەیانچێژێت، ناچاریشە لەگەڵ ئەو ترسەدا ململانێ بكات كە لەنائەمینو ناسەلامەتی شوێنەكەیەوە دەكەوێتەوە.*

بەڵام ستەمكاری بەرجەستەكەری ئیرۆس چی دەوێت؟ ئیرۆسی ستەمكار لەڕۆحدا بۆچی دەگەڕێت؟ ئیرۆس باڵ دەكێشێت بەسەر ژیانی ستەمكاردا، دەبێت بەسەرداری ستەمكار، داواكارییەكانی ئیرۆس هێور نابنەوەو دانامركێن. شتێكی ئاشكرایە كەئیرۆس بەدوای چاكەدا ناگەڕێت، وەك چۆن فەیلەسوف - پادشا بەدوایدا دەگەڕێت. هەروەها نەبۆ شەرەفمەندی یان ئارەزووی سامانی تیمۆكراتەكانو نەخۆشیو لەزەتی ئۆلیگارشییەكان و نەژیانی دیموكراسییش ناگەڕێت. ئایا ئیرۆس بەدوای ئەو نادادپەروەرییانەدا دەگەڕێت كەخەسڵەتە تایبەتییەكانی شتەكان خاپوور دەكاتو پەشێوییەكی وەها بخاتە جێگەیان كەتیایدا هەوڵ بدات هەموویان زەوت بكات؟ ئەگەر بەپێی بۆچوونەكەی سۆكرات بێت، دەتوانین پێشنیار بكەین مەسەلەكە ئاوایە: مادام ستەمكار ئیرۆس بێتو ئیرۆسیش داوای دامركاندنەوەی ئارەزووە ناپێویستەكان دەكاتو ئەوانیش هێوربوونەوەیان بۆ نیە، چونكە سروشتیان وەهایە كە هەمیشە برسی بن. بۆیە ئیرۆس داوای نادادپەروەرییو ستەمكاریی دەكات، دیلكراوی ناو ئەشكەوتەكەش نەك تەنیا وێڵی وەهمەكانە، بەڵكو داوای عەدالەتیەكی لەخەیاڵ بەدەرە. ئەم پیاوە ستەمكارە توانای ئەوەی لەدەست داوە كەجیاوازیی لەنێوانی پێویستیەكانی ژیانو ناپێویستیەكاندا بكات، ئەو دانایی پراكتیكی نەماوە. لەشارێكدا كەسەرباقی دانیشتوانەكەی میانڕۆبن، چەند گیانێكی ستەمكاری كەم هەستی جەماوەریی كەمیشیان دەبێت، بەزۆریی هەر خۆیان تێك دەشكێنن، بەڵام لەشارێكدا كەسیفەتی لەو بابەتەی زۆربێت، یان كەستەمكار بەڕێوەی دەباتو بەكۆیلەكردن بووە بەڕاست، هەموانو ستەمكارەكەش دەبن بە كۆیلە.

*لەڕاستیدا، ئەوكاتەو هەركاتێكیش ئەگەر هەندێك لەوانە بیربكاتەوە، ستەمكارێكی ڕاستەقینە كۆیلەیەكی ڕاستەقینەیە، بگرە لەنزمترین ئاستی كۆیلایەتیشدایەو، ناچارە مەرایی بۆ خەڵك بكات. ئەو زۆر دوورە لەهێوركردنەوەی ئارەزووەكانی خۆی، بەتایبەتی ئەگەر توانای هەبێت بەباشی لەدەروونی خۆی وردببێتەوە، چونكە ئەو زۆربەی زۆری شتەكانی*

*پێویستەو هەژارێکی راستەقینەیە. جا کەماڵی ئەم لەشارەکەیدا ئاواهی بێت، ئەوا رۆحی پڕ دەبێت لەترس و تۆقین و راچەنین و ژان* "579d8-c4".

بۆیە ستەمکاری سەرداری هەموان، خۆیشی کۆیلەی ئیرۆس و ستەمە، چونکە ئیرۆس دانایی و میانڕەویی وەدەرناوە. ئیرۆس ئەوە نازانێت کەتوانای بیرکردنەوەی دروستی نیە، بەڵکو داوای جیاوازینەکردنێکی هەڵەشانە دەکات. سۆکرات دەگاتە ئەنجام و دەڵێت شاری ستەمئەنگێز و رۆحی ستەمکار هەردووکیان ناڕەحەتن و بوون بەکۆیلە، هەریەکێکیان کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی گەندەڵترین بەشەوە. ستەمکار شارەکەی کردووە بەکۆیلەو خۆشی کۆیلەی ئیرۆسە.

ئێستا سۆکرات بەبەراوردکردن دەتوانێت پێناسەی ئەو پیاوە فەیلەسوفە بکات کەدەتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات:

*باشترین و دادپەروەرترین و کارامەترینیان بریتیە لەشاهانەترینیان، ئەوەیان کەوەك پادشایەك حوکمی خۆی دەکات، هەروەها خراپترین و نادادپەروەرترین، بەدبەختترینیانەو بریتیە لەستەمکارترینیان، کەستەمێکی زۆر لەخۆی و ئەو شارەش دەکات کەبەڕێوەی دەبات* "580b5 - c3".

ستەمکارو فەیلەسوف بێدارترین و بەدادترین پیاون. وا پێدەچێت هەردوکیان لەسەمایەکی ئەزەلیدا بن و هەریەکەیان بۆئەوە بژی کەببێتە دژی ئەوەکەی‌تر. یەکێکیان بەدوای فەرمانڕەوایی راست و دروستدا وێڵەو ئەویتریان راستی تەفرو تونا دەکات، فەیلەسوف باسی غەفڵەت و پەشێوایی ستەمکار دەکات و. ئەوەی سەرەوە "580a-c11" یەکەمین ئاماژە بوو بۆ دیاریکردنی باشترین و کارامەترین و بەدادترین کەس کەشاهانەترین کەسەو وەکو پادشایەك فەرمانڕەوایی خۆی دەکات.

لە"580c-581d"دا، سۆکرات دووەمین بۆچونی خۆی لەمەڕ مەزنیی ژینی پیاوی دادپەروەر دەخاتەڕوو: *لەڕاستیدا رۆحی تاکەکان دابەشکراوە بۆ سێ بەش، وەك چۆن شاریش دەبێت بەسێ بەشەوە، لێرەوە من وا هەست دەکەم سەلماندنێکی دیکەشمان لەبەردەستدایە. بەلای منەوە سێ‌چەشنە لەزەت هەیە کەلەگەڵ سێ‌بەشەکەی رۆحدا جووت دەبن و هەریەکەیان تایبەتە بەبەشێك و هاوشێوەی ئارەزووەکان و چەشنی حوکمڕانییەکەن.*

- *مەبەستت چیە؟*
- *یەکەمیان ئەو بەشەیە کە کەس بەهۆیەوە فێر دەبێت و دووەم ئەو بەشەیە کەبەهۆیەوە تورە دەبێت و سێیەمیش ناوێکی تایبەتی نیە چونکە شێوەی زۆرە، کەباسی مەزنترین شتی ناویمان کرد ئینجا ناوێکی لێدەنێین* "580d4-580e1".

بەپێی باڵادەستبوونی هەربەشێك، دەبینین سێ‌چەشنە پیاومان هەیە: پیاوی فەیلەسوف، پیاوی شکۆداری بەشەرەف، پیاوی پارەپەرست. سۆکرات لێرەدا لەجیاتی ئەوەی بەپێی رۆڵی هەریەکەیان لەشاردا ریزیان بکات، وەك لەپێشتردا وای‌کرد، دێت بەپێی بەدەستەڵاتترین داواکاریی ریزیان دەکات، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی سۆکرات لێرەدا پشت بەپێوانەکاری بونیادی هەریەکە لەدەوڵەت و رۆح دەبەستێت.

سۆكرات كرێسانه "curisouly" دەپرسێت، لەم سێ ژینە كامیان باشترە؟ بەلای ئەوەوە ئەمە بەراشكاوی پشت دەبەستێت بەوەی كام لەزەتەیان مەزنترە. كەواتە چۆن بڕیار بدەین؟ سۆكرات پێشنیاری سێ چەشنە پێوانە دەكات: ئەزمون، دانایی، ئاوەزداریی "reasoning". پیاوی فەیلەسوف لەهەرسێ چەشنەكەی لەزەتدا شارەزایە، بۆیە تەنیا ئەو دەتوانێت بڕیار بدات لەنێوانی حەزلێكەرانی دانایی و حەزلێكەرانی مشتومڕدا كامیان دروستە "582e7"، دووەم تەنیا هەر خۆی شارەزایی هەیە لەزانیندا. سێیەم پێویستە داوەریكردن لەتوێی ئاوەزەوە بێت كە ئەمیشیان ئامڕازی دەستی فەیلەسوفە. بۆیە گومان لەوەدا نییە كە ئاوەز بڕیار دەدات ئەو ژینە باشترە. بۆیە دەمەتەقێكەی ئێستا دەریدەخات پیاوی فەیلەسوف بەخۆشحاڵییەوە ئیدارەی ژیانی خۆی دەكات، دەریدەخات پیاوی دادپەروەر هەقێتی بەوپەڕی لەزەتەوە ژیانی خۆی بگوزەرێنێت.

لە "5b8a-c"دا، سۆكرات دانوساندن لەسەر ئەوە دەكات كەژیانی پیاوی دادپەروەر ژیانێكی باڵایە. بەمجۆرە دانوساندنەكەی دادەڕێژێت: چۆن برسێتی و تینوێتی بریتین لەبەتاڵیی جەستە "585b1"، نەزانییش جۆرێكە لەبەتاڵیی رۆح "585b4"، بۆیە ئەو شتانەی كەدواتر ئەو بەتاڵاییە پڕدەكەنەوە لەوشتانەی پێشووتر واقیعیترو دروستترن "585d2-3". ئەو رۆحەی كەبەو شتانە پڕ بۆتەوە كەدروست ترن و بوونیان زیاترە، رۆحێكە كەلەجەستە واقیعییانەترو دروستتر پڕبووە. بۆیە:

*ئەوەی زیاتر بەشتەكان پڕ بووبێت، چێژی زیاتر وەردەگرێت و واقیعیترو دروستترە، لەزەتێكی راستەقینەتر وەردەگرێت، لەكاتێكدا ئەوەی كەبەشتێك لەشتەكانی وەرگرتووە، بەشێكی پڕبووەو لەزەتەكەی كەمترەو كەمتریش جێگای متمانەیە.. بۆیە ئەوانەی هیچ شارەزاییەكیان لەعەقڵ - ئاوەز- و داناییدا نییە، بەڵام هەمیشە سەرقاڵی ئاهەنگ و شتی وەهان، ئەوانە نزم بوونەتەوەو پاشان سەركەوتونەتەوەو لەناوەڕاستدا وەستاون و بەدرێژایی ژیانیان هەر لەم ئاستەدا بەرزو نزم دەكەن و هەرگیز بەرزتر نابنەوە " 585d11-586a3"*

بەڵام لە587a-bدا، ئەگەر یەكێك لەبەشە نزمەكانی رۆح حوكمڕان بوو، ئەوا لەزەتی تایبەت بەخۆی بۆ نادۆزرێتەوەو دووبەشەكەی تریش ناچاردەكات كەبەدوای لەزەتی ساختەو نامۆدا بگەڕێن. ئەو پڕەنسیپەی رۆح كەزۆر دوورە لەفەلسەفەوەو ئاوا ئیش دەكات ناوی ئیرۆسە. بۆیە ستەمكار زۆر دوورە لەچێژوەرگرتن لە لەزەتی راستەقینەو بەوپێیەش كەمترین لەزەتی هەیە.

وا دیارە سێ چەشنە لەزەت لەئارادان، یەكێكی رەسەن و شەرعی، لەگەڵ دوانی نارەسەن و ناشەرعی، ستەمكاریش دەكەوێتە سەری ئەوسەری لەزەتە ناشەرعییەكانەوەو تادێت لەعەقڵ و یاسا دووردەكەوێتەوەو لێیان تێدەپەڕێت و خۆی بەو لەزەتانە گەمارۆ دەدات كەزیاتر لەدەستوپێوەندێكی بەكۆیلەكراو دەچن. 587812-c2.

بۆیە زەمینەی بنەڕەتی و راستەقینەی متمانەكردن بەدادپەروەریی، وەك سۆكرات باسی

لێوەدەکات 590-588، پێویستە بەپێی چەشنە فەرمانێك بجووڵێتەوە کەبەڕۆحدا ڕۆچووە، جێی سەرنجە کەعەقڵ پارێزگاریی لەهەموو توخمەکانی ناو ڕۆح دەکات، وەك چۆن دەبێ پاسەوانانی شار پارێزگاری خۆیان بکەن. ئالەم ڕێگایەوە دڵنیا دەبین لەهارمۆنیای سەراپای ڕۆحو لەبەرامبەریشدا تێدەگەین کەحوکمی ئیرۆس حوکمێکە شایانیخۆزگە پێخواستن نیە، چونکە ڕۆح لەژێر سایەی ئیرۆسدا تووشی پەشێویی دەبێت. ئەگەر یەکێتیو هارمۆنیی نیشانەی تاکێکی تەندروست بنو، بەوپێیەش شارێکی تەندروست، ئەوا پەشێوییو هەرەمەیی نیشانەی تاکی ناتەندروستو شاری ناتەندروستن. بۆیە ستەمکار لەڕووی ئەدەبییەوە پیاوێکی هاوسەنگ نیەو "ستەمکاریی"ش نەخۆشییەکی سیاسیو ڕۆحییە.

سەرنج:

1- فاروق لەلێکۆڵینەوەکەیدا پشتی بەم وەرگێڕانەی کۆمار بەستووە:

Plat0, Republic, Translated by G.M.A. grobe, revised by C.D.C Reeve, Hacket publishing company, 1992.

2- پێویستە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشین کە لەناو تێکستەکەدا چەند ژمارەیەك بڵاوکراونەتەوە، ئەم ژمارانە ئاماژەن بۆ شوێنی وەرگرتن - ئیقتیباسەکان لەتێکستە ئەسڵییەکەی ئەفلاتوندا، ئەمەش تەقلیدێکە کە تۆژەرە کلاسیکییەکان دایان هێناوە بۆ ئاسان دۆزینەوەی ئیقتیباسەکان لەمەتنەکانی ئەفلاتوندا.

3- فاروق ئەم لێکۆڵینەوەی لەکۆلیژی زانستە سیاسیەکانی سەر بەزانکۆی کارلتۆن Carlton university بۆ خوێندنی باڵا، بەئەنجام گەیاندووە، هەروەها لێکۆڵینەوەکەی پێشکەش پرۆفیسۆر د.نوول کردووە کەسەرپەرشتیاری خوێندنەوەکەی فاروقە.

# هاوسەرێتیی ناشادی مارکسیزم و فێمینیزم

## بەرەو یەکێتیەکی پێشکەوتووخوازانەتر


- هێیدی هارتمان
- لە ئینگلیزییەوە: ئەنوەر حەمە سالح


"هاوسەرێتی" مارکسیزمو فێمینیزم وەکو هاوسەرێتی ژنو مێرد لەیاسای گشتی ئینگلیزدا وەسف کراوە: مارکسیزمو فێمینیزم یەکن، ئەویەکەش مارکسیزمە[1]. هەوڵە تازەکان بۆ یەکخستنی مارکسیزمو فێمینیزم جێگەی رەزامەندی نین بۆ ئێمەی فێمینیست چونکە خەباتی فێمینیستی ئاوێتەی خەباتێکی "گەورەتر" دەکەن دژی سەرمایە.

نایەکسانێتییەکان لەم هاوسەرێتییەدا، وەکو زۆر دیاردەی کۆمەڵایەتی رووداونین. زۆر مارکسی ئاسایی مشتو مڕی ئەوە دەکەن کە فێمینیزم لەباشترین باردا کەمتر گرنگە وەکو لەململانێی چینایەتیو لەخراپترین باریشدا چینی کرێکار دابەشدەکات. ئەم رەفتارە سیاسیە شیکردنەوەیەك بەرهەم دەهێنێت کە فێمینیزم هەڵدەمژێت بۆ ناو خەباتی چینایەتی. سەرەڕاش، هێزی شیکاریانەی مارکسیزم سەبارەت بەسەرمایە بێتوانایییەکانی سەبارەت بە سێکسیزم Sexim دەشارێتەوە. ئێمە لێرەدا گفتوگۆی ئەوە دەکەین کە لە کاتێکدا شیکاری مارکسیانە تێگەیشتنێکی بنەڕەتی بۆ گەشەسەندنی مێژوویی دەخاتە بەردەست، بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر سەرمایەن.

بەشی یەکەمی باسەکەمان لەهەندێك لەبۆچوونە مارکسیەکان دەکۆڵێتەوە بۆ "کێشەی ژنان" لەبەشی دووەمدا بەلای کاری رادیکاڵ فێمینیستەکاندا لادەدەین. پاش سەرنجدان لەکەمو کورتیەکانی پێناسەکانی رادیکاڵ فێمینیستەکان بۆ باوکسالاری Pateriarchy پێناسەی خۆمان پێشکەش دەکەین. لەبەشی سێهەمدا هەوڵدەدەین خاڵە بەهێزەکانی مارکسیزمو فێمینیزم بەکاربهێنین بۆ پێشنیارکردن لەبارەی هەریەك لەگەشەسەندنی کۆمەڵگە سەرمایەدارەکانو لەبارەی کێشەی ئێستای ژنان. هەوڵدەدەین میتۆدۆلۆجیای مارکسی* (Marxist Methodology) بەکاربهێنین بۆ شیکردنەوەی ئامانجەکانی فێمینیست، راست کردنەوە ناهاوتایی لەکاری تازەی سۆشیالیست فێمینیستی‌داو پێشنیارکردنی شیکاری زۆرتری تەواوی پێکهاتەی ئێستای ئابوری کۆمەلایەتی Socioeconomic.


مارکس

پۆلێنەکانی Categories مارکسیزم لەئاست رەگەزدا نابینان Blind-Sex. بەتەنها شیکارکردنێکی فێمینیستی پوخت خەسڵەتی پەیوەندی نێوان ژنانو پیاوان دەردەخات. هێشتا شیکاری فێمینیستیش بەتەنها خۆی وەکو پێویست نیە چونکە نابینابووە بۆ مێژوو و بەشێوەیەکی ناتەواو بۆ ماتریالیست. هەردوو شیکاری مارکسیو بەتایبەتی میتۆدی مێژوویيو ماتریالیستی، شیکاری فێمینیستی بەتایبەتی ناساندنی باوکسالاری وەکو ستراکتۆرێکی کۆمەلایەتیو مێژووی، پێویستە سەرنجیان لێبدرێت گەر بمانەوێت لەگەشەسەندنی کۆمەلگە سەرمایەدارەکانی خۆرئاواو لەرەوشی خراپی ژنان بگەین تیایاندا.

گفتوگۆی ئەوە دەکەین کە شیکردنەوەیەکی ماتریالیستی دەریدەخات باوکسالاری بەئاسانی سایکیك* Psychic نییە بەڵکو ستراکتۆرێکی کۆمەلایەتیو ئابوریە. ئێمە پێشنیار دەکەین کە دەبێت باش تێبگەین کە کۆمەلگەکەمان رۆژێك وا ناسراوە کە بە رێگەکانی هەریەك لەباوکسالاریو سەرمایەداری دامەزراوە. لەکاتێکدا دەستنیشانی گرژیەکانی نێوان باوکسالاریو بەرژەوەندیەکانی سەرمایەداری دەکەین، گفتوگۆی ئەوە دەکەین

کە کەڵەکەبوونی سەرمایە خۆی لەگەڵ ستراکتۆری کۆمەڵایەتی باوکسالاری دەگونجێنێتو یارمەتی بەردەوام بوونیشی دەدات. لەم چوارچێوەیەدا ئێمە پێشنیار دەکەین کە ئایدۆلۆژیای سێکست Sexist ideology لە ئێستەدا یەك فۆرمی سەیری سەرمایەداری بەڕێوە دەبات، یەك ڕێگە ڕووندەکاتەوە کە پەیوەندیەکانی باوکسالاری دەیانەوێت کۆمەکی سەرمایەداری بکەن. ئێمە بەکورتی دەڵێین کە هاوبەشی نێوان باوکسالاریو سەرمایەداری پەرەی سەندووە.

لەبەشی کۆتاییدا، بەشی چوارەم گفتوگۆی ئەوە دەکەین کە پەیوەندیە سیاسیەکانی مارکسیزمو فێمینیزم بالادەستی مارکسیزم بەسەر فێمینیزمدا لەتیگەیشتنی چەپدا بۆ کێشەی ژن روون دەکاتەوە. یەکێتیەکی پێشکەوتن خوازانەتری مارکسیزمو فێمینیزم بەتەنها داوای تێگەیشتنێکی ڕۆشنبیری بۆ پەیوەندیەکانی چینو رەگەز Sex ناکات بەڵکو داوا دەکات هاوپەیمانیەك جێگەی بالادەستیو پاشکۆیەتی بگرێتەوە لە سیاسەتەکانی چەپدا.

## 1-مارکسیزمو کێشەی ژن

کێشەی ژن هەرگیز "کێشەی فێمینیست" نەبووە. کێشەی فێمینیستی لەهۆکارەکانی نایەکسانی سێکسی نێوان ژنانو پیاوان، بالادەستی پیاوان بەسەر ژنانەوە ئاراستەکراوە. زۆربەی شیکاریە مارکسیەکان بۆ پێگەی ژنان پەیوەندی ژنان بەسیستەمی ئابوریەوە نەك پەیوەندی نێوان پیاوانو ژنان بۆ کێشەکە بەهەند وەردەگرن، ئاشکرایە بەڕێوەبردنی پیاوان لە باسکردنیاندا بۆ ژنان روون دەبێتەوە.

شیکاری مارکسی بۆ کێشەی ژن سێ شێوەی سەرەکی وەرگرتووە. هەموو چەوساندنەوەی ژن لەبوونی پەیوەندی (یان نەبوونی) بە بەرهەم هێناوە دەبینن.

ژنان وەکو بەشێك لەچینی کرێکار دەستنیشان دەکەن، ئەم شیکارانە بەشێوەیەکی هاوجووت پەیوەندی ژنان بە پیاوانەوە دەخەنە ژێر سایەی پەیوەندی کرێکاران بەسەرمایەوە. یەکەم، مارکسیە کۆنەکان، مارکس، ئەنگلز، کاوتسکیو لینین وایان دەبینی سەرمایەداری هەموو ژنان رادەکێشێتە ناو هێزی کرێی کارەوە، ئەم پرۆسەیەشیان بە تێکشاندنی دابەشکردنی رەگەزیانەی کار دەبینی Sexnal division of labor.

دووەم، مارکسیە هاوچەرخەکان ژنانیان خستە ریزی شیکارێکی ڕۆژانەی ژیانی سەرمایەداریەوە. لەم تێڕوانینەدا، هەموو لایەنەکانی ژیانمان وادەبینرێن کەسیستەمی سەرمایەداری بەرهەم بهێنێنو خۆشمان هەموو کرێکاری ناو ئەو سیستەمە بین.

سێهەمیش، مارکسیە فێمینیستەکان جەختیان کردۆتە سەر کاری ناوماڵو پەیوەندی بەسەرمایەداریەوە، هەندێك وتوێژی ئەوە دەکەن کە کاری ماڵ بەهای فائض بەرهەمدەهێنێتو کە کرێکارانی ناوماڵیش راستەوخۆ کار بۆ سەرمایەداران دەکەن.

لەکاتێکدا مارکسیە کۆنەکان کاری ماڵیان پشت گوێ خستو جەختیان لەسەر بەشداری ژنان بوو لەهێزی کاردا، دوو بۆچوونی زۆر تازە جەختیان لەسەر کاری ماڵە تا ئەو رادەیەی ڕۆڵی ئێستای ژنان لەبازاڕی کاردا پشت گوێ دەخەن.. سەرەڕای ئەوەش، هەرسێ بۆچوونەکە هەوڵ دەدەن ژنان بخەنە ریزی چینی کرێکارەوەو

وەکو روویەکی تری چەوساندنەوەی چینایەتیش لە چەوساندنەوەی ژنان بگەن. بەکردنی ئەم کارە هەمووان رێگەچارەیەکی کورت دەدەنە مەبەستی شیکردنەوەی فێمینیستیو پەیوەندیەکانی نێوان ژنانو پیاوان. لەکاتێکدا گرفتەکانمان بە شێوەیەکی نایاب لێکدراونەتەوە، ئەوان بەهەڵە تێگەیشتوون. جەختی شیکاری مارکسیەت پەیوەندیەکانی چین بووە؛ مەبەستی شیکاری مارکسیەت تێگەیشتن بووە لەیاساکانی جووڵەی کۆمەڵگەی سەرمایەداری. لەکاتێکدا بڕوا دەکەین میتۆدۆلۆجیا مارکسی بەکاربهێنرێت بۆ فۆرمەلەکردنی ستراتیژی فێمینیست، ئەم بۆچوونە مارکسیە فێمینیستانەی لەسەرەوە لێک درانەوە بەروونی ئەو کارە ناکەن؛ مارکسیزمەکەیان بەئاشکرا زاڵە بەسەر فێمینیزمەکەیاندا.

هەروەك لەپێشەوە پێشنیارمان کرد، ئەمە بەڕێژەیەك دەگەڕێتەوە بۆ هێزی شیکاریانەی مارکسیزم خۆی. مارکسیزم تیۆرێکە بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵگەی چینایەتییە، بۆ پرۆسەی کەڵەکەبوون لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا، بۆ بەرهەمهێنانەوەی باڵادەستی چینایەتی، هەروەها گەشەسەندنی هاودژیەکانو خەباتی چینایەتی. کۆمەڵگە سەرمایەدارەکان بەهۆی داواکاریەکانی پرۆسەی کەڵەکەبوونەوە ئاراستە دەکرێن، زۆر بەکورتی کورتکراوەتەوە بەهۆی ئەو راستیەی بەرهەمهێنان گۆڕاوە بۆ ئالوگۆڕ، نەك بەکارهێنان. لەسیستەمی سەرمایەداریدا بەرهەمهێنانی هەتا ئەو رادەیە گرنگە کە قازانج بەدەست بهێنێت، و بەهای بەکارهێنانی بەرهەمەکان تەنها گرنگیەکی لاوەکی هەیە. قازانجەکان لەتوانای سەرمایەدارانەوە هاتوون بۆ قۆرغ کردنی هێزی کار، بۆ پێدانی رەنجدەران کەمتر لە بەهای ئەوەی بەرهەمی دەهێنن. کە لەبوونی قازانجەکان بەشێوەیەك سیستەماتیکی بونیادی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت، هەروەکو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانیشی دەگۆڕێت. سوپای یەدەکی کار، هەزاری ژمارەیەکی زۆری خەڵکو نزیکە هەزاری ژمارەیەکی لەوە زۆرتر، ئەم گازندانەی خەڵك لەسەرمایەداری بەهۆی پرۆسەی کەڵەکەبوونەوەن.

لەتێڕوانینی سەرمایەدارانەوە بەرهەمهێنانەوەی چینی کرێکار لەوانەیە "سەلامەت تر بێت بۆخۆی (چینی کرێکار) بەجێبهێڵرێت"[2]. لەهەمان کاتدا، سەرمایەداری ئایدیۆلۆژیایەك بەرهەمدەهێنێت، کە لە پەنایەوە پەرە دەسێنێت لە تاکگەرایدا، کێبڕکێکردن، باڵادەستی لە ئێستاشدا بڕشت لێبڕانی جۆرێکی تایبەتی. تیۆری مرۆڤ هەرچۆنێك بێت لەسەر دەستپێکی ئایدۆلۆژیا دەبێت ئەمانە وەکو بەهاکانی باڵادەستی کۆمەڵگە سەرمایەدارەکان بناسێت.

مارکسیزم چەندین لایەنی کۆمەڵگە سەرمایەداریەکانمان تێدەگەیەنێت لەبونیادی بەرهەم هێنان، دروست کردنی ستراکتۆرێکی وەزیفی تایبەت، و سروشتی ئایدۆلۆژیای باڵادەستی تیۆری مارکس بۆ گەشەسەندنی سەرمایەداری تیۆرێکە بۆ گەشەسەندنی "جێگە چۆڵەکان". بۆ نمونە مارکس پێشبینی گەشەی پرۆلیتاریاو مردنی وردە بۆرژوای کرد.

زۆر بەچڕوپڕی براڤەرمان لەناو هەموو ئەوانی تردا دروست بوونی "جێگەکانی"، کرێکاری فەرمانبەرو کرێکاری خزمەتکاری لەکۆمەڵگە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکاندا روونکردۆتەوە.[3] هەروەکو چۆن سەرمایە ئەم

جێگایانە دروست دەکات بەبێ گوێدانە ئەو تاکانەی پڕیان دەکەنەوە، پۆلێنەکانی شیکاری مارکسیش، چین، سوپای یەدەگی کار، کرێی کرێکار، روونی ناکاتەوە بۆچی خەڵکی دیاریکراو جێگە دیاریکراوەکان پڕدەکەنەوە. هیچ ئاماژەیەك نادەن سەبارەت بەوەی بۆچی ژنان لەدەرەوەو ناوەوەی خێزان پاشکۆی پیاوانن‌و بۆچی بەجۆرێکی تر نیە. پۆلێنە مارکسیەکان وەکو خودی سەرمایە رەگەز نابینان Sex blind. پۆلێنەکانی مارکسیزم ناتوانن پێمان بڵێن کەکێ جێگە چۆڵەکان پڕدەکاتەوە. شیکاری مارکسی بۆ کێشەی ژنان بەدەست ئەم گرفتە بنەڕەتیەوە ناڵاندوویەتی.

## 2-رادیکاڵ فێمینیزم‌و باوکسالاری

**هەرەشەی گەورەی نوسینی رادیکاڵ** فێمینیست ئاراستەی دۆکیۆمێنت کردنی دروشمی "سیاسەت تایبەتیە" بووە. رادیکاڵ فێمینیستەکان وت ویژی ئەوەیان کردووە کە نارەزایەتی ژنان ناڵەیەکی نیرۆتیکی* نەگونجاندن نیە، بەڵکو وەڵامێکە بۆ بونیادێکی کۆمەڵایەتی کە تیایدا ژنان بەشێوەیەکی سیستەماتیکی کۆنترۆڵ کراون، قۆرخ کراون‌و چەوسێنراونەتەوە. نزمی شوێنی ژنان لەبازاڕی کاردا ناوەندگیری بونیادی سۆزداری نێر لە هاوسەری بەستنی چینی ناوەڕاستدا، بەکارهێنانی ژنان لەپڕوپاگەندەدا، گوایە تێگەیشتن لە سایکیکی Psychic ژنان وەکو نیرۆتیك (عصابی Neurotic)ی گشتگیرکراو لەلایەن سایکۆلۆژیای ئەکادیمی‌و عەیادیەوە لەلایەن بێلایەنی ژیانی ژنان لەکۆمەڵگەی سەرمایەداریدا کۆڵراوەتەوە. ئەدەبیاتی رادیکاڵ فێمینیست زۆر گەورەیەو دژی کورتکردنەوەیەکی ئاسان دەوەستێتەوە، لەهەمان کاتدا جەخت کردنی لەسەر سایکۆلۆژیا جێگەی رەزامەندیە.

رادیکاڵ فێمینیستەکانی نیویۆرك دۆکیومێنت لەسەر "سیاسەتەکانی ئیگۆ The politics of Ego" رێکدەخەن. "تایبەتی سیاسەتە" بۆ رادیکاڵ فێمینیستەکان واتا، دابەشکردنی بنەڕەتی‌و بناغەی چین لەنێوان رەگەزەکاندا بە Sexes، هێزی بزوێنەری مێژوو تێکۆشانی پیاوانە بۆ دەسەڵات‌و هەژمونکردن بەسەر ژناندا، و دیالەکتیکی رەگەز Sex[4].

هێزی گەورەی شیکاری رادیکاڵ فێمینیستانە لە تێڕوانینیا بۆ ئێستا. گەورەترین لاوازیشی جەخت کردنێکە لەسەر سایکۆلۆژیا کە بەرامبەر مێژوو کوێری دەکات.

هۆکاری ئەمە بەتەنها لەمیتۆدی رادیکاڵ فێمینیستدا نیە، بەڵکو لەسروشتی باوکسالاری خۆشیایەتی، چونکە باوکسالاری بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر فۆرمێکی نەرمی رێکخستنی کۆمەڵایەتیە. رادیکاڵ فێمینیستەکان باوکسالاری بەکاردەهێنن بۆ ئاماژەکردن بۆ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە بەهۆی باڵادەستی نێر بەسەر ژنانەوە جیادەکرێتەوە. پێناسەی کەیت میلێت کلاسیکە:

*کۆمەڵگەکەی ئێمە... باوکسالاریە. ئەم راستیە دەستبەجێ روندەبێتەوە گەر مرۆڤ بیهێنێتەوە یادی خۆی کە سوپا، پیشەسازی، تەکنۆلۆژیا، زانکۆکان، زانست، دەزگاکانی سیاسەت، داراییەکان، هەموو مەیدانێکی دەسەڵات لەناوکۆمەڵدا، بەدەزگای سەرکوتکەری پۆلیسەوە، بەتەواوەتی لەدەستی نێردان.*[5]

ئەم پێناسەیەی رادیکاڵ فێمینیست بۆ باوکسالاری بۆ زۆربەی ئەو کۆمەڵگەیانەی

زانیاریمان لەبارەوە هەیە پیادە دەبێتو جیاوازی لەنێوانیاندا ناکرێت، بەکارهێنانی مێژوو لەلایەن رادیکاڵ فێمینیستەکانەوە بەشێوەیەکی ئاسایی دیاریکراوە بۆ دابینکردنی نمونەکان بۆ بوونی باوکسالاری لەگشت کاتو شوێنێکدا[6].

بۆ مارکسیەتو مەیلی بەربڵاوی زانستە کۆمەڵایەتیەکان پێش بزوتنەوەی ژنان، باوکسالاری دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمێکی پەیوەندیەکانی نێوان پیاوان کە هێڵکاریەکانی سیاسیو ئابوری کۆمەڵگە فیودالو پێش فیودالەکانی پێك هێنا، کە تیایدا ریزبەندی پلەوپایە دوای هۆکارە تایبەتمەندیەکان دەکەوێت. کۆمەڵگە سەرمایەدارەکان وەکو مێریتۆکراتیك** بیرۆکراتیك، زانا کۆمەڵایەتیە بۆرجوازەکان سەیرکراوە؛ مارکسیەکان کۆمەڵگە سەرمایەدارەکان وەکو سیستەمەکانی باڵادەستی چینایەتی دەبینن.(7)

بۆ هەردوو جۆرەکەی زانا کۆمەڵایەتیەکان نەکۆمەڵگە باوکسالاریە مێژوویەکانو نەکۆمەڵگە سەرمایەداریەکانی ئەمرۆی خۆرئاوا وەکو سیستەمەکانی پەیوەندیەکانی نێوان پیاوان سەیر دەکرێن کە وایان لێدەکات باڵادەست بن بەسەر ژناندا.

### بەرەو پێناسەیەکی باوکسالاری

دەتوانین بەشێوەیەکی سوودمەند باوکسالاری پێناسە بکەین وەکو جۆرێکی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان پیاوان کە بناغەیەکی ماددی هەیەو سەرەڕای ریزبەندی پلەوپایەش پشت بە یەکتر بەستنو هاوکاری لەنێوان پیاواندا دروست دەکات یان دادەمەزرێنێتو بەتوانایان دەکات بۆ زاڵ بوون بەسەر ژناندا. هەرچەندە باوکسالاری ریزبەندیەو پیاوانی چینە



جیاوازەکان، رەگەزەکان races یان گروپە ئیتنیەکان جێگەی جیاوازیان هەیە لە باوکسالاریدا بەڵام یەکگرتوشن لە پەیوەندی هاوبەشیاندا لەباڵادەستیدا بەسەر ژنەکانیاندا. پشت بەیەکتر دەبەستن بۆ درێژەدان بەو باڵادەستیە. ئەوانەی لەئاستێکی بەرزتردان دەتوانن خۆیان رزگاربکەن لەهەڕەشەی ئەوانەی لەئاستێکی نزمتردان بە بەخشینی دەسەڵات پێیان بەسەر ئەوانەدا کەنزمترین(و- ژنان). لەریزبەندی پلەی باوکسالاریدا هەموو پیاوان، پایە کۆمەڵایەتیان لەباوکسالاریدا هەرچیەك بێت خۆیان لێ بواردراوە بەوەی بتوانن بەلایەنی کەمەوە کۆنترۆڵیان بەسەر چەند ژنێکەوە هەبێت. چەند بەڵگەیەك هەن بۆ پێشنیارکردنی ئەوەی کاتێك باوکسالاری بۆیەکەمجار بەدامەزراوەیی کرا لەکۆمەڵگە دەوڵەتیەکاندا، سەرکردە پایەبەرزەکان بەشێوەیەکی توند پیاوانیان کردە سەرکردەی خێزانەکان

(کۆنترۆڵیان بەسەر ژنومناڵەکانیان دا پتەوکردن) لەبەرامبەردا پیاوان وازیان لە هەندێك سەرچاوەی داهاتەکانیان هێنا بۆ سەرکردە تازەکان.(8) پیاوان پشتیان یەك بەیەکتر بەستووە (سەرەڕای ریزبەستنی پلەو پایەیان) بۆ درێژەدان بەبالآ دەستیان بەسەر ژناندا.

ئەو بناغە ماددیەی باوکسالاری لەسەری دەژی بەشێوەیەکی زۆر سەرەکی لەبالآدەستی پیاواندایە بەسەر هێزی کاری ژناندا. پیاوان ئەم کۆنترۆڵە دەپارێزن بە بێبەشکردنی ژنان لە رێگەکانی گەیشتن بە سەرچاوە دەرامەتیە بەرهەمهێنە سەرەکیەکان (بۆ نمونە لەکۆمەڵگە سەرمایەداریەکاندا ئەو ئیشانەی کرێکانی بژێوی دەدەن) هەروەها بە سنوربەندکردنی سێکسایەتی ژنان Sexuality(9).

هاوسەرێتی تاك هاوسەری هێترۆسێکسوال* فۆرمێکی تازەی رێژەییە کە وادیارە رێگە بەپیاوان دەدات هەردوو بوارەکە کۆنترۆڵ بکەن. کۆنترۆڵی رێگەکانی ژنان بۆ گەیشتن بەسەرچاوەکانی دەرامەتو سێکسواڵەتیان، لەئەنجامدا، رێگە بەپیاوان دەدات کۆنترۆڵی هێزی کاری ژنان بکەن بۆ مەبەستی خزمەتکردنی پیاوان لەچەندین رێگەی تایبەتی سێکسیەوە و هەروەها بۆ مەبەستی بەخێوکردنی مناڵانیش ئەو خزمەتانەی ژنان پێشکەشی پیاوانی دەکەن، پیاوان لەکردنی زۆر کاری نارەحەت قوتار دەکات (وەکو پاککردنەوەی توالیت) کە لە دەرەوەو ناوەوەی ماڵدا دەکرێت.

نمونەی ئەوانە لەدەرەوەی ماڵ روودەدەن بریتین لە هەراسانکردنی ژنە کرێکارو خوێندکارەکان لەلایەن سەرۆك کارو مامۆستا نێرەکانەوە هەروەکو بەکارهێنانی گشتی سکرتێرەکان بۆ راپەڕاندنی کاری تایبەتیو قاوەلێنانو دروستکردنی ناوەندێکی "سێکسی".

بەخێوکردنی مناڵ، هەرچۆنێك بێت کارێکی گرنگە بۆ باوکان گەر هێزی کاری مناڵان سودێکی هەنوکەیی هەبێت یان دەبێت بۆ درێژەکێشانی باوکسالاری وەکو سیستەم.

هەروەکو چۆن دەبێت کۆمەڵگەی چینایەتی لەرێگەی قوتابخانەکانو شوێنی کارو کاری تاقەت پروکێنەوە.. هتد بەرهەم بهێنرێتەوە، هەرواش پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی باوکسالاری. لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بەگشتی مناڵان لەلایەن ژنانەوە لەماڵدا بەخێودەکرێن، ژنان لەژیانی کۆمەڵایەتی‌دا وەکو لاوازتر لەپیاو پێناسە دەکرێنو دەناسرێنەوە لەکاتێکدا پیاو لەوێنەی ناوکی خێزاندا بەدەگمەن دەردەکەوێت. ئەو مناڵانەی بەم جۆرە پەروەردە دەکرێن بەچاکی شوێنی خۆیان لە ریزبەندی جیاکردنەوەی پایەی رەگەزیدا دەزانن، گرنگی ئەم پرۆسەیە، هەرچۆنێك بێت، لەبوارەکانی دەرەوەی ماڵ دایە لە :کەنیسەکان، قوتابخانەکان، وەرزشەکان، یانەو یەکێتیەکان، سوپاکان، کارگەکان، فەرمانگەکان، بنکە تەندروستیەکانو میدیا... هتد کە رەفتارەکانی باوکسالاری تیایاندا دەوترێنەوەو پێگەی لاوازی ژنان زەق دەکرێتەوەو پتەودەکرێت. کەواتە بناغەی ماددی باوکسالاری بەتەنها پشت بە بەخێوکردنی مناڵ نابەستێت لەخێزاندا، بەڵکو بەهەموو بونیادە کۆمەڵایەتیەکان کە پیاو بەتوانادەکەن لەکۆنترۆڵکردنی کاری ژناندا. لایەنەکانی بونیادە کۆمەڵایەتیەکان کە بەردەوامی دەدەن بە باوکسالاری بێردۆزیانە دەستنیشانکراون، لێرەوە جیاکراوەن لە لایەنەکانی تریان. گایل روبین توانای دەستنیشانکردنی پێکهاتی باوکسالاری ئەم بونیادە کۆمەڵایەتیانەی بەشێوەیەکی مەزن

زیاد کردین بەهۆی ناساندنی "سیستەمەکانی سێکس" ڕەگەز Sex/ gender

سیستەمی سێکس/ ڕەگەز ژمارەیەك ئامادەکارین کە بەهۆیەوە کۆمەڵگەیەك ڕەگەزایەتی بایەلۆجی دەگوازنەوە بۆ بەرهەمەکانی چالاکی مرۆڤ، و تیایدا ئەم پێویستیە سێکسییە گوازراوانە تێردەکرێن"(10)

ئێمە بە نێرو مێ لەدایك بووین (ڕەگەزە بایۆلۆژیەکان) بەلام کراوینەتە پیاو و ژن "ڕەگەزە ڕێکخراوە کۆمەلایەتیەکان" چۆن ئێمە بەو شێوەیە دروستکراوین ئەوە جۆری دووەمی مۆدی بەرهەمهێنانە یان وەك ئەنگلز وتویەتی "بەرهەمهێنانی مرۆڤەکان خۆیان، زیادکردنی جۆرەکانن"

چۆن خەڵك جۆرەکانی زیاد دەکەن ئەوە کۆمەلایەتیانە دیاریکراوە. گەر لەرووی بایۆلۆژیەوە خەڵك سێکسیانە قۆناغەکانی گەشە ببڕن، و کۆمەڵگەش بەڕێگەیەکی وەها ڕێك خرابێت کە هەموو شێوەکان دەربڕینی سێکسیانە بەیەکسانی ڕێگەپێدراوبن، بەرهەمهێنانەوە تەنها لەبەرەو رووبوونەوە سێکسیەکانەوە دەبێت، بەتایبەتی هیترۆ سێکسیەکان.

جیاکردنەوە (دابەشکردنی) توندی کار لەرێگەی ڕەگەزەوە داهێنانێکی کۆمەلایەتی باوە لەهەموو کۆمەڵگە ناسراوەکاندا دوو ڕەگەزی زۆر دابڕاو دروست دەکاتو پێویستیەك بۆ پیاوانو ژنان کە بۆ مەبەستە ئابوریەکان پێکەوەبن. بەم جۆرە یارمەتی ئاراستەکردنی پێویستیە سێکسیەکانیان دەدات بەرەو بەدیهێنانێکی هێترۆسێکسیانە، و یارمەتی دەدات بۆ زامنکردنی بەرهەمهێنانەوەی بایۆلۆژیانە.

لەکۆمەڵگە زۆر خەیالاویەکاندا، دەشێت بەرهەمهێنانەوەی بایۆلۆژیانە بە جۆرە تەکنیکێکی تر زامن بکرێت، بەلام دابەشکردنی کار بەهۆی ڕەگەزەوە تا ئەمرۆش وەکو چارەسەرێکی گەردوونی دەردەکەوێت. هەرچەندە لەرووی تیۆریەوە مومکینە کە دابەشکردنی ڕەگەزیانەی کار نایەکسانی نێوان ڕەگەزەکان نەگەیەنێت، لەزۆربەی کۆمەڵگە ناسراوەکاندا، دابەشکردنی کاری قبوڵ کراو بەشێوەیەکی کۆمەلایەتیانە بەهۆی ڕەگەزەوە کارێکە پایەیەکی نزمتر دەداتە کاری ژنان.

دابەشکردنی ڕەگەزیانەی کار هەروەها پاڵپشتیشە بۆ کلتووری ڕەگەزیە لاوەکیەکان کە تیایدا ژنانو پیاوان بەجیاوازی ئەزموونی ژیان دەکەن؛ بناغەی ماددی دەسەلاتی پیاوە کە پیادە کراوە (لەکۆمەڵگەی ئێمەدا) نەك بەتەنها لەنەکردنی کاری ماڵداو لەزامنکردنی وەزیفەی بەرزدا بەڵکو هەروەها لەروی سایکۆلۆجیشەوە.

چۆن خەڵك بەپێویستیە سێکسیەکانیان دەگەن چۆن نەوە نوێکان دەخەنەوە، چۆن فێری ڕەگەز دەبن، چۆن هەستدەکات پیاو بێت یا ژن– هەموو ئەمە لەمەودای وەسفەکەی سیستەمی سێکس/ ڕەگەزی روبین دایە، روبین جەخت لەسەر هاوخوێنی دەکات (کە پێت دەڵێت تۆ دەتوانیت لەگەڵ کێدا پێویستیە سێکسیەکانت تێربکەیت)و گەشەسەندنی ڕەگەز کەسێتیەکان دیاریدەکات لەرێگەی بەخێوکردنی منالو OedipalMachine. (شێوازی ئۆدیپی)یەوە.

زیاتر لەوە، هەرچۆنێك بێت، دەتوانین چەمکی سیستەمی سێکسی/ ڕەگەز بەکاربهێنین بۆ لێکۆلینەوە لەهەموو دامەزراوە کۆمەلایەتیەکانی تر لەبەر ئەو ڕۆڵەی هەیانە لەدیاریکردنی پتەوکردنی ریزبەستنی پلە کۆمەلایەتیەکان بەپێی ڕەگەز. روبین سەرنج دەدات کە لەرووی تیۆریەوە سیستەمێکی

سێکس/ ڕەگەز دەتوانێت ببێتە باڵادەستی مێ، باڵادەستی نێر یان یەکسانی خواز، مەیلی هەیە بۆ وەسفکردنی چەندین جۆری سیستەمەکانی سێکس/ ڕەگەز یان بەقۆناغکردنی مێژوو بۆ ئەو مەبەستە.

*سیستەمی سێکس/* ڕەگەزی باوکسالاری ئێستامان هەڵدەبژێرین بۆ وەسفکردن، چونکە بەشێوەیەکی گونجاو بیری ڕیزبەندی پلەوپایەو باڵادەستی نێر دەهێنێتە بیرمانەوە کە بەکرۆکی سیستەمی دەبینین.

بەرهەمی ئابووری (ئەوەی مارکسیەکان وەکو مۆدی بەرهەمهێنان ئاماژەی بۆ دەکەن)و بەرهەمهێنان خەڵك لەبواری سێکس/ ڕەگەزدا هەردوو دەستنیشانی "ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دەکەن کەلە سایەیدا خەڵکی سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراوو وڵاتێکی دیاریکراو ژیان دەگوزەرێنن" بەگوێرەی بۆچونی ئەنگلز. کەواتە بەسەیرکردنی ئەم دوو جۆرەی بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی خەڵكو شتەکان دەتوانین لەسەراپای کۆمەڵگە بگەین(11).

شتێك نیە وەکو "سەرمایەداری ڕووت" و نە "باوکسالاری پەتی" یش بوونی هەیە، چونکە دەبێت بەپێویستی لەیەك چوارچێوەدابن. ئەوەی هەیە باوکسالاری سەرمایەداری، یان باوکسالاری فیودالیزم، یان کۆمەڵگە راوکەرە کۆکەرەوە یەکسانی خوازەکان یان کۆمەڵگە دایکسالارە باخدارەکان یان کۆمەڵگە باوکسالارە باخدارەکانەو بەم جۆرە..

لەوێدا وادەردەکەوێت کە گرێدانی پێویست نەبێت لەنێوان گۆڕانەکانی جۆرێکی بەرهەمهێنان لەگەڵ گۆڕانەکانی جۆرێکی تردا بۆ نمونە، کۆمەڵگەیەك دەتوانرێت لەسەرمایەداریەوە بگوازرێتەوە بۆ سۆشیالیزمو هەر بە باوکسالاری بمێنێتەوە.(12) هەستی گشتی، مێژوو، ئەزموونەکانی خۆمان پێمان دەڵێن، هەرچۆنێك بێت، ئەم دوو جۆرەی بەرهەمهێنان هێندە بەچڕی بەیەکداچوون کە گۆڕان لەیەکێکیاندا ئاسایی جووڵە، گرژی، ناتەبایی لەویتردا دروست دەکات.

دەتوانین لەم چوارچێوەیەدا لە ڕیزبەستنی ڕەگەزپەرستانەی پایەکان بگەین. ڕەنگە چڕوپڕی زیاتر بتوانرێت بکرێت بەدرێژایی هێڵەکانی دیاریکردنی سیستەمی ڕەنگ/ ڕەگەز race/colour مەیدانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە ڕەنگی بایۆلۆژی دەگرنو دەگۆڕینە پۆلێنێکی کۆمەڵایەتی، ڕەگەز (عنصر race)

ڕیزبەندیەکانی ڕەگەزپەرستی، وەکو ڕیزبەندیەکانی ڕەگەز Sex، جۆری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیمانن، هی چۆن خەڵك بەرهەمدێنو بەرهەمدێنەوە. بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئایدیۆلۆژی نین، مۆدی دووەمی بەرهەمهێنانەکەمان پێك دەهێنن، بەرهەمهێنانو بەرهەمهێنانەوەی خەڵك. ڕەنگە ووردبینانەتر بێت گەر بۆ نمونە ئاماژە بەکۆمەڵگەکەمان بکرێت نەك وەکو بەسانایی سەرمایەداری بەڵکو سەرمایەداری باوکسالاری پایەبڵندی سپی (سپی پێست).

لەبەشی سێهەمدا؛ ڕۆشنایی دەخەینە سەر مەسەلەیەك کە سەرمایەداری خۆی لەگەڵ گونجاندووەو سوودی لەڕێکخستنە ڕەگەزپەرستیەکانو چەندین نمونەی پەیوەندی ناوەکی نێوان باوکسالاریو سەرمایەداری وەرگرتووە.

گەشەسەندنی سەرمایەداری جێگەکانی ڕیزبەندی پلەوپایەی کرێکاران دەخولقێنێت،

بەلام پۆلێنەکانی مارکسیەتی باو ناتوانێت پێمان بلێت کێ کام جێگە پڕدەکەنەوە.

ڕیزبەندیەکانی ڕەگەزپەرستی Racial و ڕەگەز (gender) بڕیاردەدەن کێ جیگە بەتاڵەکان پڕ دەکەنەوە. باوکسالاری بەسانایی ڕێکخستنێکی ڕیزبەندی نیە، بەلام بە ڕیزبەندیی خەڵکی تایبەت شوێنە تایبەتەکان پڕ دەکەنەوە ئەوە لە لێکۆڵینەوەی باوکسالاریدایە کە تێدەگەین بۆچی ئەوە ژنانن کۆنترۆڵ کراونو چۆن کۆنترۆڵ کراون. لەکاتێکدا بڕوامان وایە کە زۆربەی کۆمەڵگە ناسراوەکان باوکسالاری بوون ئێمە باوکسالاری وەکو گەردوونی، وەکو دیاردەیەکی نەگۆڕ سەیر ناکەین. بەڵکو باوکسالاری، جۆرێکە لەپەیوەندی لە نێوان پیاواندا کە یارمەتی پیاوان دەدات زاڵبن بەسەر ژناندا، بەتێپەڕبوونی کات لەشێوەو هێزدا گۆڕاوە.

گرنگە کە لە ڕیزبەندی لەنێوان پیاونداو ڕێگە جیاوازەکانیان بۆ سودی باوکسالاری بکۆڵرێتەوە، بێگومان چین ڕەگەز (عرق – Race)، نەتەوایەتی، هەروەها باری خێزانی نامۆبونی سێکسی، هەروەها تەمەنیش، ڕۆڵی خۆیان هەیە لێرەدا. ژنانی چین، ڕەگەز race، نەتەوە، باری خێزانی، یان گروپی نامۆیی سێکسی جیاواز کەوتوونەتە ژێر پلە جیاوازەکانی دەسەلاتی باوکسالاریەوە.

ڕەنگە ژنان خۆشیان پیادەی، چین، ڕەگەز race، یان دەسەلاتی نەتەوە یان تەنانەت دەسەلاتی باوکسالاری (لەڕێگە پەیوەندیەکانی خێزانەکانیانەوە) بکەن بەسەر پیاوانی نزمتر لە ڕیزبەندی پلەوپایەی باوکسالاری نێرە هاوخوێنەکانی خۆیان.

بۆ پێداچوونەوە، ئێمە پێناسەی باوکسالاری دەکەین وەکو جۆرێك لەپەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان کە بناغەیەکی ماددی هەیەو تیایدا پەیوەندیەکانی ڕیزبەندی پلەوپایە هەن لەنێوان پیاونداو هاوکاری لەنێوانیاندا کە بەدەوری خۆی تواناداریان دەکات لەبالادەستی بەسەر ژناندا. بناغەی ماددی باوکسالاری بریتیە لەکۆنترۆڵی پیاوان بەسەر هێزی کاری ژناندا. ئەو کۆنترۆڵە بەهۆی بێبەشکردنی ژنان لەڕێگەی گەیشتن بەسەرچاوە بەرهەمهێنەرە ئابووریەکانو پابەندکردنی سێکسوالێتی ژنانەوە بەدەست هاتووە. پیاوان پیادەی کۆنترۆڵی خۆیان دەکەن لەوەرگرتنی خزمەتی تایبەتی لەژنان، لەناچارنەبوون بۆ کردنی کاری ناوماڵو بەخێوکردنی منال، لەگەیشتن بە جەستەی ژنان بۆ سێکسو لەهەستکردن بە بەهێزیو لەبەهێزبووندا.

گرنگترین یەکەکانی باوکسالاری هەروەکو ڕاستەوخۆ ئەزموونیان دەکەین ئەمانەن:

هاوسەرێتی هێترۆسێکسی (سەرەنجامیش هۆمۆفۆبیا)***، بەخێوکردنی منال لەلایەن مێوەو کاری ناوماڵ، پشت بەستنی ئابووری ژنان بەپیاوان (کە بەهۆی ئامادەکاریەکانی بازاڕی کار زیاتر پتەوکراوە)، دەوڵەتو ژمارەیەکی زۆر دامەزراوە کە پشتیان بەپەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی پیاوان بەستووە، یانەکان، وەرزشەکان، یەکێتیەکان، پیشەکان، زانکۆکان، کڵێسەکان، ئەنجومەنەکانو سوپاکان. هەموو ئەم یەکانە پێویستە لێیان بکۆڵرێتەوە گەر بمانەوێت لەسەرمایەداری باوکسالاری بگەین.

هەریەك لەڕێزبەندی پلەوپایەو پشت بەیەکتر بەستن لەنێوان پیاونداو پاشکۆیەتی ژنان بنچینەن بۆ ئەرکی کۆمەلگەکەمان لەبەر ئەوەی ئەم پەیوەندیانە سیستەماتیکین. واز لە پرسیاری دروستبونی ئەم پەیوەندیانە دەهێنینو دەپرسین، ئایا دەتوانین پەیوەندیە

باوکسالاریەکان لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا بناسینەوە؟ پێویستە هەمان ئەو سەنەدانە بدۆزینەوە لەنێوان پیاواندا کە هەریەك لە بۆرژوازەکان "کۆمەڵناسە مارکسیەکان رادەگەیەنن چیتر دروست نابنو نین لەئەوپەریشیدا، پاشماوەیەکی ناگرنگن. ئایا دەتوانین تێبگەین چۆن ئەم پەیوەندیانە لەنێوان پیاواندا لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا بەردەوام بووە؟ ئایا دەتوانین دەستنیشانی ئەو رێگانە بکەیت کە تیایدا باوکسالاری قۆناغی گەشەی سەرمایەداری پێك هێناوە؟

### 3-هاوبەشیەتی باوکسالاریو سەرمایە

چۆن پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی باوکسالاری لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا بناسینەوە؟ وادیارە گەر هەر ژنێك لەلایەن پیاوەکەیەوە بەتەنها چەوسێنرابێتەوە؛ چەوساندنەوەکەی وەکو مەسەلەیەکی تایبەتی دەردەکەوێت؛ وادیارە پەیوەندیەکانی نێوان پیاوانو نێوان خێزانەکان بەیەکسانی پارچە پارچە بووبێت. زەحمەتە پەیوەندیەکانی نێوان پیاوانو ژنان، وەکو باوکسالاری بەشێوەیەکی سیستەماتیکی بناسرێنەوە. ئێمە دەڵێین، کە هەرچۆنێك بێت، کە باوکسالاری وەکو سیستەمێکی پەیوەندیەکانی نێوان پیاوانو ژنان لەسەرمایەداریدا هەیەو، کە لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا هاوبەشیەکی بەهێزو تەندروست لەنێوان باوکسالاریو سەرمایەدا بوونی هەیە. هێشتا گەر یەکێك لەگەڵ چەمکی باوکسالاریو تێگەیشتنێك بۆ مۆدی بەرهەمهێنانی سەرمایەدا دەست پێبکات، دەستبەجێ تێدەگات کە هاوبەشێتی نێوان باوکسالاریو سەرمایە شتێکی حەتمی نییە، پیاوانو سەرمایەداران هەمیشە کێشمەکێشمی بەرژەوەندیەکانیان هەبووە بەتایبەتی لەسەر بەکارهێنانی هێزی کاری ژنان.

لێرەدا رێگایەك هەیە کە تیایدا ئەم ململانێیە لەوانەیە خۆی رابگەیەنێت: زۆرینەی هەرە گەورەی پیاوان لەوانەیە بیانەوێت ژنەکانیان لەماڵەوە بن بۆ ئەوەی خزمەتی شەخصیان بکەن. ژمارەیەکی کەمتری پیاوان، کە سەرمایەدارەکانن، لەوانەیە بیانەوێت زۆربەی ژنان "جگە لەوانەی خۆیان" لەبازاڕی کرێی کاردا ئیش بکەن. بە تێڕوانینی مێژووییانە بۆ گرژیەکانی ئەم ململانێیە لەسەر هێزی کاری ژنان دەتوانین دەستنیشانی بناغەی ماددی پەیوەندیەکانی باوکسالاری لەکۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا بکەین، هەروەکو دەتوانین بناغەکانی شەریکایەتی نێوان سەرمایەو باوکسالاریش دەست نیشان بکەین.

### بەپیشەسازی کردنو گەشەسەندنی برژێویەکانی خێزان

مارکسیەکان چەند ئەنجامگیریەکی تەواو لۆجیکیان کرد لەهەڵبژاردنێکی دیاردەی کۆمەڵایەتیەوە شاهیدیان لەسەر سەدەی نۆزدەهەمدا. بەڵام مارکسیەکان تا ئەوپەڕی بەهەڵە هەڵسەنگاندنی بەهێز بوونی پێشینەی هێزە کۆمەڵایەتیەکانی باوکسالاریان کرد لەگەڵ ئەوەیش دەبوو سەرمایەی گەنجی کەم ئەزموون تێبکۆشێتو خۆی لەگەڵ ئەم هێزانەدا بگونجێنێت. شۆڕشی پیشەسازی هەموو خەڵکی راکێشایە هێزی کارەوە، لەوانەشدا ژنانو منالان، لەراستیدا کارگە سەرەتاکان منالو مێیان بەشێوەیەکی زۆرەملێ بەکاردەهێنا(13). ئەو ژنو منالانەی دەیانتوانی بەجیا لەپیاوان برژێوی

پەیدا بکەن پەیوەندیەکانی دەسەلاتیان لاوازو (هەروەك لەبەشی یەکەم لەسەرەوە باسکرا) کرێشیان لەهەمووان نزمتر بوو.

کرێکارە نێرەکان بەرەنگاری هاتنەناوەوەی بە کۆمەڵی ژنانو منالانیان دەکرد بۆ ناو هێزی کارو هەوڵی وەدەرنانیان دەدان لە ئەندامێتی نەقابەو هێزی کاردا. ساڵی 1846 لایەنگرانی 10 کات ژمێر کار رایانگەیاند: پێویست ناکات بڵێین، کە هەمو هەوڵەکان بۆ باشکردنی باری رەوشتیو فیزیکی کرێکارە مێکانی کارگەکان بەهیچ دەگات، گەر سەعاتەکانی کاریان بەشێوەیەکی ماددی بۆ کەمنەکرێتەوە لەراستیدا دەبێت بگەینە ئەو رادەیەی بڵێین، کە زۆر باشترە ژنە مێرددارەکان لەبەڕێوەبردنی ئەرکەکانی ماڵداریدا دابنرێن وەکو لەشوێنکەوتنی ئامێرە هەرگیز لەجووڵە نەکەوتووەکان. لەبەر ئەوە ئاواتەخوازین کە ئەو رۆژە دورنەبێت، کە مێردە سەرەك خێزانەکان بتوانن ژیانی ژنو خێزان دابین بکەن، بەبێ ناردنی ژنان بۆ بەرگەگرتنی نارەحەتی کارگەیەکی لۆکە.

لە 1954دا لە وولاتە یەکگرتووەکاندا یەکێتی نەتەوەیی چاپ National Typograpical Union بڕیاریدا "کە بەدەوری خۆی هانی دامەزراندنی پیتچنە مێکان نەدات" ئەندامە نەقابیە نێرەکان نەیانویست پارێزگاری بۆ ژنە کرێکارەکان دابین بکەن، سەرەڕاش هەوڵیاندا بێبەریان بکەن.

لە 1879 ئادولف ستراسەر سەرۆکی "نەقابەی نێونەتەوەیی کرێکارانی جگەرە Cigarmakers Intranationl Uuion" وتی: "ئێمە ناتوانین ژنان بخەینە دەرەوەی بازرگانی، بەلام دەتوانین رێژەی بەشداریان لەکاردا سنوردار بکەین لەرێگەی یاساکانی کارگەوە"(14).

لەکاتێکدا دەتوانرا گرفتی پێشبڕکێی هەرزان بەهۆی رێکخستنی بەدەستهێنانی کرێی ژنانو گەنجانەوە چارەسەر بکرێت، گرفتی خێزانی هەڵوەشاوە نەدەتوانرا. پیاوان پارێزگاری نەقابەیان بۆ پیاوان پاراستو نارەزاییان دەربڕی بۆ یاساکانی پارێزگاری کار بۆ ژنانو منالان(15). یاساکانی پارێزگاری کار لەکاتێکدا لەوانەبوو هەندێك خراپکاری کاری منالو مێ باشتربکات، هەروەها بەشداریکردنی ژنانی پێگەیشتوو لەزۆربەی کارەکانی (نێر)دا سنووردارکرد پیاوان هەوڵیاندا ئیشە کرێ بەرزەکان بۆ خۆیان بهێڵنەوەو کرێی نێرەکان بەگشتی بەرزبکەنەوە. داوای ئەو کرێیانەیان کرد کە بە تەنها پر بەکرێی کاریان بێت بۆ یارمەتی دانی خێزانەکانیان. ئەم سیستەمی (بژێوی خێزان)ە بەرە بەرە وایلێهات ببێتە نمونە بۆ خێزانە جێگیرەکانی چینی کرێکار لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا.(16)

چەندین چاودێر بانگەشەیان کرد کە ژنی ناکرێکار بەشێك بێت لە ستانداردی ژیانی کرێکارە نێرەکان(17) لەبری جەنگان بۆ کرێی یەکسان بۆ ژنانو پیاوان. پیاوان، هەوڵیان دەدا بۆ بژێوی خێزان، بۆ هێشتنەوەی خزمەتی هاوسەرەکانیان لەماڵدا. لەنەبوونی باوکسالاریدا لەوانە بوو چینێکی یەکگرتووی کرێکار رووبەرووی سەرمایەداری ببێتەوەو، بەلام پەیوەندیەکانی باوکسالاری چینی کرێکاری دابەشکردووە، رێگەی داوە بەشێکی (پیاوان) خۆی نەجات بدات لەسەر حسابی ئەویتر (ژنان). هەریەك لە ریزبەندی پلەوپایەو هاوکاری نێوان پیاوان لەئەم پرۆسەی بڕیاردانەدا زۆر گرنگ دەبوون. بژێویەکانی خێزان لەوانەیە وەکو بڕیاردانێکی ململانێ بەسەر هێزی کاری ژناندا

سەیر بکرێت کە لەو کاتەدا لەنێوان بەرژەوەندیەکانی باوکسالاریو سەرمایەداریدا رووی دەدا.

بژێویەکانی خێزان بۆ زۆربەی پیاوان پێگەیشتوو پیادە رازی بوونو رێکەوتنی پیاوان دەکات لەسەر کرێ نزمەکان بۆ ئەوانی تر، خەڵکی گەنجو ژنانو ئەو پیاوانەی لەڕوی کەسایەتیەوە بە لاواز ناسراون (ئیرلەندی، رەشپێستەکان.. هتد، نزمترین گروپەکان لەریزبەندی پلەو پایەی باوکسالاریدا ئەوانەن کە دژایەتی چەندین قازانجی باوکسالاریان کردووە)

کرێ نزمەکان بۆ ژنانو منداڵانو پیاوە لاوازەکان بەهۆی جیاکردنەوەی کار لەبازاڕی کاردا پتەوکراون، لەئەنجامدا لەلایەن نەقابەکانو بەڕێوەبردن هەروەکو دامەزراوە لاوەکیەکانی وەکو قوتابخانەکانو بەرنامەکانی فێرکردنو تەنانەت خێزانەکانیشەوە بەردەوامی پێدراوە.

جیاکردنەوەی کار بەپێی رەگەز Sex، بە زامنکردنی ئەوەی کە ژنان کارەکرێ نزمەکانیان هەیە، زامنی هەریەك لە پشت بەستنی ئابووری ژنان بەپیاوانو بیرۆکەی بوارە گونجاوەکانی پیاوانو ژنان بەهێزتر دەکات. کەواتە بەلای زۆربەی پیاوانەوە گەشەکردنی بژێویەکانی خێزان زامنی بنەما مادیەکانی بالادەستی نێر لەدوو رێگەوە دەکات. یەکەم، پیاوان ئیشە چاکەکان لەبازاڕی کاردا وەردەگرنو کرێ بەرزەکان بەدەست دەهێنن. ئەو کرێ نزمەی ژنان لەبازاڕی کاردا وەریدەگرن بەردەوامی دەدات بە قازانجی مادی پیاوان بەسەر ژنانداو هانی ژنانیش دەدات کە بیانووی وەکو پیشە هەڵبژێرن. دووەم، لەو حاڵەتەدا، ژنان کاری ناوماڵ دەکەن، چاودێری منداڵ دەکەن، و چەند خزمەتێکی تر کە لە ماڵ راستەوخۆ سوود بەپیاوان دەگەیەنن بەباشتر دەزانن(18). لێپرسراوەتیەکانی ژنان لەماڵدا بەدەوری خۆی نزمی شوێنی ژنان لەبازاڕی کاردا پتەوتر دەکات.

ئەو پرۆسەی جیاکردنەوەی کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا گەشەی سەند دەتوانرێت بەقازانجی بەرژەوەندیەکانی سەرمایەدار هەروەك بەقازانجی بەرژەوەندیەکانی باوکسالاری ببینرێت. هەمیشە وتراوە، سەرمایەدارەکان زانیویانە کە لەو پەڕی بارودۆخەکاندا کە لە بە پیشەسازیکردنی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوبونەوە، خێزانەکانی چینی کرێکار ناتوانن بەوردی خۆیان بەرهەم بهێننەوە؛ درکیان کرد کەبیانووەکان کرێکاری تەندروست تریان بەرهەم هێناوەو پاراستووە وەکو لە ژنە هاوسەرە کرێکارەکان هەروەها منداڵانی خوێندەوار کرێکاری باشتر دەبن لە منداڵانی نەخوێندەوار. رێکەوتنامەی کڕینو فرۆشتن، دانی بژێوی خێزان بەپیاوان هێشتنەوەی ژنان لەماڵدا لەو کاتەدا گونجاو بوو بۆ سەرمایەدارانو هەروەك بۆ کرێکارە نێرەکانیش. هەرچەندە لەوکاتە بەندەکانی رێکەوتنەکە گۆڕاون، هێشتا راستە کە خێزانو کاری ژنان لە خێزاندا خزمەتی سەرمایەدەکات بەدابین کردنی هێزێکی کارو خزمەتی پیاوان دەکات وەکو بوارێك کە تیایدا پیادەی ئیمتیازەکانی خۆیانی تیادا دەکەن. ژنان، کاردەکەن بۆ خزمەتی پیاوانو خێزانەکانیان، وەکو بەکارهێنەریش خزمەتی سەرمایە دەکەن. خێزان ئەو جێگایەشە کە تیایدا بالادەستیو ملکەچی فێردەکرێت، هەروەك فایەرستونو قوتابخانەی فرانکفۆرتو زۆری تر روونیان کردۆتەوە(19) منداڵانی ملکەچ دەبنە کرێکارانی ملکەچ، کچانو کوڕان هەریەك رۆڵی گونجاوی خۆیان فێردەبن.

لەکاتێکدا بژێوی خێزان پیشانی دەدات کە سەرمایەداری دەگونجێت بۆ باوکسالاری، گۆڕانی هەیکەلی منالآن پیشانی دەدات کە باوکسالاری دەگونجێت بۆ سەرمایە. منالآن وەکو ژنان بەدەرن لەکرێی کار. هەروەك توانای منالآن بۆ پەیداکردنی پارە دابەزیوە، پەیوەندی شەرعیشیان بە باوانیانەوە گۆڕاوە. لەسەرەتای قۆناغی مێژوویی پیشەسازی لەولایەتە یەکگرتووەکاندا، دابین کردنی پێویستیەکانی منالآن تەنانەت سەرەتاییەکانیشی لەلایەن باوکانیانەوە وابڕی لێدەکرایەوە وەترسناك بێت بۆ پێشکەوتنی شادییان، باوکان پێشینەی یاساییان هەبوو لەبارەکانی نەریتی رکەبەریدا.

لێرەدا باوکسالاری خۆی گونجاند لەگەڵ رۆڵی گۆڕاوی ئابووری منالآن، کاتێك منالآن بەرهەمهێن بوون، پیاوان بانگەشەیان دەکرد هی خۆیانن، کاتێك نابەرهەمهێن دەبوون دەدرانە ژنان.

### هاوبەشێتی لەسەدەی بیستەمدا

ئەو پێشبینەیەی مارکسیەکانی سەدەی بیستەم راست دەرنەچوو کە باوکسالاری لەقۆناغی پێویستی سەرمایەداریدا بۆ پرۆلیتارەکردنی هەمووان دەوێت. مارکسیەکان بەتەنها هەر بەهەڵە هەڵسەنگاندنی هێزو توانای خۆگونجاندنی باوکسالاریان نەکرد، هەروەها هێزی سەرمایەشیان زۆر هەڵسەنگاند. هێزی نوێی سەرمایەداریان نەبینی، کە پەیوەندیە فیودالەکانی لەت کرد، وەکو هێزێکی راستەقینە. چاودێرە هاوچەرخەکان لەشوێنگەیەکی باشتردان بۆ بینینی جیاوازیەکانی ئارەزووەکانی سەرمایەداری "پاکژ"و ئەوانەی سەرمایەداری "راستەقینە" وەك ئەوەی رووبەڕووی هێزە مێژوویەکان دەبێتەوە لەپیادەکردنی هەموو رۆژێکدا. باسکردنی شەریکایەتی نێوان سەرمایەو رێکخستنە رەگەزیەکانو بازاڕی دابەشکاری نمونەی زیاتر دابین دەکات کە چۆن هێزەکانی سەرمایەداری "پاکژ" رووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ واقعی مێژوویدا. خۆ گونجاندنێکی گەورە پێشاندراوە لەئەم پرۆسەیەدا لەلایەن سەرمایەداریەوە.

ئەو مارکسیانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر باشووری ئەفەریقا کردووە گفتو گۆی ئەوە دەکەن کە هەرچەندە رەنگە رێکخستنە رەگەزیەکان racialorders رێگە بە پرۆلیتاریکردنێکی یەکسانی هەموو کەس نەدەن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەربەستە رەگەزیەکان رێگە لە کەڵەکەبوونی سەرمایە دەگرن.

بە ئەبستراکتی، شیکەرەوەکان مناقەشە بکە لەبارەی کام بەڕێوەبردنانە یارمەتی سەرمایەداران دەدەن بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین نرخی پاشەکەوت. هێشتا لەبارودۆخێکی مێژوویی دیاریکراودا دەبێت سەرمایەداران خەریکبن بە کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی، بە سەرهەڵدانی گرووپەکانی کرێکاران خۆهەڵقورتاندنی دەوڵەتەوە. دەبێت دەوڵەت تەدەخول بکات بۆ ئەوەی کۆمەڵگە وەکو یەکەیەکی تەواو بەرهەم بهێنێتەوە. لەوانەیە پێویست بکات کۆنترۆڵی هەندێك سەرمایەدار بکرێت بۆ زاڵبوون بەسەر هەندێك مەیلی خراپی سەرمایەدا. حساب کردن بۆ ئەم فاکتەرانە گەورەترین قازانجی پراکتیکی سەرمایەدارانە. گەر بۆ مەبەستەکانی کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی سەرمایەداران کار بەڕێگەیەکی تایبەتی رێکبخەن، هیچ شتێك لەبارەی سەرمایەداری خۆیەوە بڕیارنادات کێ (وەکو، کام تاکانە لەگەڵ تایبەتمەندیە وەسفیەکاندا) شوێنە بەرزەکان بەدەس دەهێنێتو کێشی پلە نزمەکانی هێزی کرێی کار بەدەست دەهێنێت.

بێگومان ئەوە یارمەتی دەدات کە لەوانەیە سەرمایەداران خۆشیان گروپی کۆمەڵایەتی باڵادەستبن لێرەشەوە رەگەزپەرست (وسێکسیست).

سەرمایەداری تایبەتمەندیە وەسفیەکانی گروپە باڵادەستەکان هەروەك هی پاشکۆیەکان بەمیرات وەردەگرێت. وت وێژە تازەکان لەسەر مەیلی مۆنۆپۆلی (احتکاری—قۆرخکاری) سەرمایە بۆ دروست کردنی بازاڕی کاری دابەشکاری لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەدا هاوشێوەن.

لەکوێدا سەرمایەداران بەمەبەستەوە هێزی کار دابەشکەن، تایبەتمەندیی هۆکاریەکان بەکاردەهێنن بۆ دابەشکردنی چینی کرێکار، ئەمە بەروونی لەپێویستی بۆ کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی هاتووە وەك لە پێویستیەکانی کەڵەکەکردن لەروانگەیەکی تەسکەوە.(19) بە تێپەڕینی کات، هەموو ئەو هەوڵە جیاکاریانە سەرکەوتوو یان سوودمەند نابن لەدابەشکردندا. توانای سەرمایە بۆ پێکهێنانی هێزی کار پشت دەبەستێت بەفەرمانە دیاریکراوەکانی کەڵەکەکردن لەروانگەیەکی تەسکەوە (بۆ نمونە، ئایا بەرهەمهێنان بەڕێگەیەك رێك خراوە پێویستی بە پەیوەندیکردن هەبێت لەنێوان ژمارەیەکی گەورەی کرێکاراندا؟ گەروایە، باشترە هەموان بەهەمان زمان قسە بکەن)(20) لەناو هێزە کۆمەڵایەتیەکانیشدا لەکۆمەڵگەدا لەوانەیە سەرمایە هان بدات ناچار بکات بۆ خۆگونجاندن (درێژەکێشانی جیاکردنەوەی ئاودەستە گشتیەکان بۆ سپیەکانو رەشەکان لەباشوری ئەفەریقا ئەتوانرێت تەنها وەکو تێچوونێکی ئابووری سەرمایەدارەکان تەماشا بکرێت، بەڵام کەمتر لە تێچوونێکی کۆمەڵایەتی بۆ ناچارکردنی سپیەکان بۆ خۆشتن لەگەڵ رەشەکاندا).

گەرخاڵی یەکەم وتووێژەکەمان دەربارەی رێڕەوی گەشەکردنی سەرمایەداری ئەوە بێت کە سەرمایە هێندە بەهێز نییە، دووەم ئەوەیە کە سەرمایە بەشێوەیەکی مەزن خۆگونجێنەرە، کەڵەکەبوونی سەرمایە بەرەو رووی شێوە کۆمەڵایەتیە پێشینەکان دەبێتەوە، تێکیان دەشکێنێتو خۆشیان لەگەڵ دەگونجێنێت.

دەتوانرێت خۆگونجاندنی سەرمایە وەکو کاردانەوەیەکی هێزی ئەم شێوە کۆمەڵایەتیە پێشینانە لە ژینگە نوێکان تەماشا بکرێت. هێشتا هەرچەندە بەردەوام دەبن بەڵام نەگۆڕاو نین. ئەو ئایدیۆلۆژیانەی ئەمڕۆ سێکسو رەگەز تێیدەگەن بۆ نمونە بەشێوەیەکی بەهێز پێك هاتووە بەهۆی رێگە تایبەتیەکانی رەگەزایەتیو سێکسواڵ دابەشکردنەکانی سێکسواڵ لەپرۆسەی کەڵەکەبووندا پتەوکراون.

## خێزانو بژێوی خێزانی ئەمڕۆ

لەسەرەوە وتووێژی ئەوەمان کرد کە بەتێڕوانین بۆ سەرمایەداریو باوکسالاری، کە خۆ رێکخستن یان خۆگونجاندنی بەرامبەر یەکتری شێوەی پێشکەوتنی بژێوی خێزانی وەرگرت لەسەدەی بیستەمدا بژێوی خێزان هاوبەشێتی نێوان باوکسالاریو سەرمایەی جێگیر کرد. هەرچەندە بەشداری ژنان لەهێزی کاردا زیادیکردو لەجەنگی جیهانی دووەمەوە بەتایبەتی خێراتر بوو، ئێمە وتوێژی ئەوە دەکەین کە هێشتا بژێوی خێزان بەردی بناغەی دابەشکردنی سێکسیانەی کارە لەئێستەدا کە تیایدا ژنان بەشێوەیەکی سەرەکی لێپرسراوی کاری ماڵنو پیاوانیش بەشێوەیەکی سەرەکی کاری کرێ.

کرێی نزمی ژنان لەبازاڕی کاردا (گرێدراوە بەپێویستی بەخێو کردنی منداڵان لەلایەن

یەکێکەوە) جەخت لەسەر بەردەوام دروست بوونی خێزان دەکات وەکو یەکەیەکی داهاتی هاوبەشی پێویست. خێزانی پشتگیری کراو لەلایەن بژێوی خێزانەوە، بەم جۆرە رێگە بەکۆنترۆڵی کاری ژنان دەدات لەلایەن پیاوانەوە لەدەرەوەو ناوەوەی خێزاندا. هەرچەندە رەنگە زیادبوونی کرێی کاری ژنان ببێتە هۆی فشار بۆ سەر خێزان (هاوشێوەی ئەو فشارەی کاوتسکیو ئەنگلز لەسەدەی نۆزدەدا تێبینیان کرد)، لەوانەیە هەڵەبێت بەو جۆرە بیر لەسەرەنجامێك بکرێتەوە کە چەمکەکانو حەقیقەتەکانی خێزانو دابەشکردنی سێکسیانەی کار زوو دیار نامێنن. دابەشکردنی سێکسیانەی کار لەبازاڕی کاردا دەردەکەوێتەوە، کە لەوێدا ژنان لەئیشەکانی ژناندا کاردەکەن، هەمیشە هەمان ئەو ئیشانەی فێربوون لەماڵدا بیانکەن- ئامادەکردنی خواردنو خزمەت، هەموو جۆرەکانی پاککردنەوە،پەرۆشی تەواو.. لەم جۆرەکارانە. لەبەر ئەوەی ئەم کارانە پلەی نزم کرێی نزمیان هەیە پەیوەندیەکانی باوکسالاری بەساغی دەمێننەوە، هەرچەندە بناغە ماددیەکەیان بەجۆرێك لەجۆرەکان لەخێزانەوە بۆ جیاوازی کردنی کرێ دەگۆڕێن، لەپشت بەستن بەخێزانەوە بۆ پشت بەستن بە باوکسالاری پیشەسازی(21).

پەیوەندیە باوکسالاریە پشت بەستووەکان بە پیشەسازی بەرێگەی جۆراوجۆر پتەو دەکرێن رێکەوتنەکانی نەقابە کەکرێی کەمتر، سوودی کەمتر دەستنیشان دەکات، لەگەڵ هەلی کەمتری پێشکەوتن بۆ ژنان بەتەنها هەر سەرهەڵدانەوەی تایبەتمەندیە کۆنەکان نییە -حاڵەتێکی رەفتارەکانی سێکسیست یان ئایدیۆلۆژیای باڵادەستی نێر نییە- کەپارێزگاری بنەمای ماددی سیستەمی باوکسالاری دەکەن. لەکاتێکدا هەندێك دەگەنە ئەو رادەیەی وتووێژی ئەوەیان کردووە کە باوکسالاری پێشتر لەخێزاندا ئامادەگی نەبووە، ئێمە نەمانتوانیوە ئەوە بکەین "بۆ نمونە سەیری ستیوارت ئۆوین بکە (فەرماندارەکانی هۆشیاری)- Captains of consciousuess) هەرچەندە بنەماکانی چارەسەری ناوەندی نێوان باوکسالاریو سەرمایە لەگۆڕاندا وەکو کاری زیاد بەسەرمایە کراو پێشوەخت لەخێزاندا جێگەی خۆیان گرتووە، شوێنگەی بڵاوبوونەوەی هێزی کاری ژنان دەگۆڕێت، هەرچۆنێك بێت ئەوە راستە، هەروەك چۆن لەسەرەوە وتووێژمانکرد، کە جیاوازی کردن لەکرێدا کە بەهۆی ئەوپەڕی جیاکردنەوەی کارەوە لەبازاڕی کاردا دروست بووە خێزان پتەو دەکاتو لەگەڵیشیدا، دابەشکردنی خێزانیانەی کارە بەهۆی هاندانی ژنان بۆ شووکردن ئایدیای بژێوی خێزان -کە پیاوێك ئەتوانێت ئەوەندە بەدەست بهێنێت کە پشت گیری تەواوی خێزانێك بکات- لەوانەیە رێگە بۆ ئایدیایەکی تازە بکاتەوە کەپیاوانو ژنان بەهۆی بەدەستهێنانی بژێویەوە بەشدارن لەداهاتی کاشی خێزاندا. ئەوکاتە، جیاوازی کرێ بەشێوەیەکی زیاد دەبێتە پێویستی لەبەردەوامی باوکسالاریو کۆنترۆڵی نێر بەسەر هێزی کاری ژناندا. جیاوازی کرێ یارمەتی دەر دەبێت لەناساندنی کاری ژنان وەکو پاشکۆ بۆ کاری پیاوان لەهەمان کاتدا پاشکۆیی راسەقینەی بەردەوامی ئابووری ژنان بۆ پیاوان پێویست دەکات دابەشکردنی رەگەزیانەی کار لەبازاڕی کاردا دەبێت وەك راگەیاندنی باوکسالاری سەیر بکرێت کە یارمەتی بەردەوام بوونی دەدات.

چەندین خەڵك وتوێژی ئەوەیان کردووە کە هەرچەندە هاوبەشێتی نێوان باوکسالاریو

سەرمایە ئێستا بوونی هەیە بەڵام رەنگە نەویستراوبێت لەلایەن سەرمایەدارییەوە، رەنگە سەرمایە لەکۆتاییدا پەیوەندیە خێزانیەکانو باوکسالاری تێك بشکێنێت وتووێژەکە بە شێوەیەکی سەرمایەداری (کە خێزان نمونەی نیە) بەرەو ئەوە دەڕوات ببێتە گەردوونی، کە تیایدا ژنان بەشێوەیەکی زیاتر دەتوانن پارە پەیدا بکەنو ملکەچیو پاشکۆیەتی خێزان رەتبکەنەوە، لەبەر ئەوەی خێزانیش چەوسێنەرە بەتایبەتی بۆ ژنانو منالان، ئەوا دادەڕمێت هەرکاتێك خەڵك بتوانن لەدەرەوەی خێزان بژێوی پەیدا بکەن.

ئێمە لەو بڕوایەداین کە پەیوەندیەکانی باوکسالاری بەجۆرێکی وەها بەرجەستە بووبن لەخێزاندا کە بەو ئاسانیە لەلایەن سەرمایەوە تێك نەشکێنرێن، هەروەها بەڵگەی کەمیش دەبینین کە حاڵی حازر خێزان لەهەڵوەشاندابێت. هەرچەندە زیادبوونی بەشداری ژنان لەهێزی کاری ژناندا تەڵاقی ئاسان کردووە، هاندەرەکانی تەلاق وێرانکەرنین بۆ ژنان. کرێکاری ژنان یارمەتی ژمارەیەکی زۆرکەمی ژنان دەدەن بۆ پاڵپشتی کردنی خۆیانو منالەکانیان. بەڵگەی بێ هێزبوونی خێزانی تەقلیدی (باو) لەباشترین حاڵەتدا لاوازە. رێژەی تەلاق وەکو ئەوەی چاوەڕوانکرابوو زیادی نەکرووە لەنێو چینەکاندا، سەرەڕاش، مارەکردنەوەش لەئاستێکی بەرزدایە، هەتا سەرژمێری 1970 قۆناغی یەکەمی هاوسەرێتی بەردەوام بوو لەسەر لاوازبوونی مێژوویی خۆی. لەساڵی 1970وە خەڵك وا دیار بوو هاوسەرێتیان دوا دەخست لەگەڵ منال بووندا، بەڵام لەتازەترین باردا، رێژەی لەدایك بوون جارێکی تر بەرز بۆتەوە. ئەوە راستە کە رێژەیەکی گەورەی خەڵك ئێستا لەدەرەوەی خێزانە تەقلیدیەکان ژیان دەگوزەرێنن. بەتایبەتی خەڵکی گەنج لەدەرەوەی ماڵی باوانیان ژیان دەگوزەرێننو ماڵی خۆیان دادەمەزرێنن پێش ئەوەی هاوسەرێتی ببەستنو خێزانە تەقلیدیەکان (باوەکان) دەست پێبکەن. خەڵکی پیر بەتایبەتی ژنان خۆیان بەتەنیا لەماڵەکانیاندا دەبیننەوە دوای ئەوەی منالەکانیان دەڕۆن، ئەزموونی تەریکی یان مردنی مێردێك دەکەن.

هەرچۆنێك بێت، رەوتەکان ئەوە نیشان دەدەن کە نەوە نوێکانی خەڵکی گەنج لەکاتێکی ژیانی تێگەیشتنیاندا خێزانی ناوکی دروست دەکەن بەرێژەیەکی زیاتر لە هەر کاتێکی پێشتر. کۆمەڵەکان یان گروپەکانی خەڵك کە لەساڵی 1930وە دروست بوون لەکۆمەڵەکانی پێشوتر زیاتر هاوسەرێتیو منالبونیان لەنێواندا هەبوو. رەنگ مەودای هاوسەرێتیو منال بوون کورت ببێتەوە، بەڵام کاریگەریەکەی هەر درێژەی دەبێت.

ئەو وتووێژەی کە سەرمایە خێزان تێك دەشکێنێت هەروەها هێزە کۆمەڵایەتیەکانیش نابینێت کە ژیانی خێزانی سەرنج راکێش دەکەن. سەرەڕای رەخنەی ئەوەی کە خێزانە ناوکیەکان لەڕووی سایکۆلۆجیەوە وێرانکەرن، لەکۆمەڵگەیەکی پێشبڕکێیدا هێشتا خێزان رووبەڕووی پێویستیە راستەقینەکانی خەڵك دەبێتەوە. ئەمە بەتەنها هەر بۆ تاك هاوسەرێتی درێژخایەن راست نیە، بەڵکو زیاتریش راستە بۆ منال بەخێوکردن. تەنها دایكو باوك قورساییە داراییو سایکیکییەکان لەئەستۆ دەگرن. بۆ ژنانی چینی کرێکار بەتایبەتی، ئەم قورساییانە سەربەخۆیی بەشداریکردن لەهێزی کاردا دەکەنە وەهم. خێزانە تاك باوانەکان لەم دواییانەدا

لەلایەن شیکەرەوە سیاسیەکانەوە وەکو پێکهاتەی خێزانە باوەکان تەماشا دەکران کەلە دووبارە مارەییدا دەبنەوە بەخێزانی دوو باوانی.

لەوانەیە کاریگەریەکانی زیادبوونی بەشداری ژنان لەهێزی کاردا لە لێژبونەوەیەکی دابەشکردنی رەگەزیانەی کار لە ناو خێزاندا ببینرێنەوە وەك لە تەلاقی یەك لەدوای یەکدا، بەڵام بەڵگەش بۆ ئەمە نیە. سەرژمێرەکان لەسەر ئەوەی کێ کاری ناوماڵ دەکات، گۆرانکاری کەم پیشان دەدەن تەنانەت لەو خێزانانەشدا کە ژنەکان بژێوی پەیدا دەکەن هێشتا ژنان زۆربەی کاری ناوماڵ دەکەن.

رۆژی زیادەی کار حەقیقەتێکە بۆ ژنە کرێکارەکان. ئەمە بەکەمی جێگەی سەرسورمانە کاتێك دابەشکردنی رەگەزیانەی کار لەدەرەوەی خێزاندایە لەبازاڕی کاردایە کە ژنان بەپشت بەستوویی بەپیاوان دەهێڵێتەوە -تەنانەت کاتێکیش خۆیان بژێوی پەیدا دەکەن. هەرچۆنێك بێت ئایندەی باوکسالاری بەتەنها پشت بەئایندەی پەیوەندیە خێزانیەکان نابەستێت، چونکە باوکسالاری وەك سەرمایەداری دەتوانێت بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر خۆرێکخەرو گونجێنەر بێت.

گەر دابەشکردنی باوکسالاریانەی کار لەناو خێزاندا یان لە سەر جێگەیەکی تر بەشێوەیەکی کۆتایی لەلایەن سەرمایەداریەوە وسیتراوبێت یان نەء، ئێستا سەرمایەداری ئەو پێکیدەهێنێت. هەروەك لەخوارەوە روونی دەکەینەوە باوکسالاری رەوایی دەداتە کۆنترۆڵی سەرمایەداریو ناڕەوایش دەداتە هەندێك شێوەی خەبات دژی سەرمایە.

## ئایدۆلۆژیا لەسەدەی بیستەمدا

باوکسالاری بەدامەزراندنو شەرعیەت دان بە ریزبەندی پلەوپایە لەنێو پیاواندا (بەرێگەدان بەپیاوانی هەموو گرووپەکان بەکۆنترۆڵ کردنی بەلایەنی کەمەوە هەندێك ژن) کۆنترۆڵی سەرمایە پتەو دەکات، و بەنرخەکانی سەرمایەداری پێناسەی کەلو پەلەکانی باوکسالاری دەکات.

ئەو دیاردە سایکۆلۆجیەی شولامیس فایەرستون دەستنیشانی دەکات چەند نمونەیەکن لەبارەی چی روودەدات لە پەیوەندیەکانی پاشکۆییو باڵادەستیدا. ئەوانە لەحەقیقەتەکانی هێزی سەرمایەی پیاوانەوە دێت -کە ژنان رەتی دەکەنەوە- بەڵام پێك هاتوون بەهۆی ئەو حەقیقەتەی کە ئەوانە کە لەچوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی سەرمایەداردا رودەدەن(22). گەر وەکو رادیکاڵ فێمینیستەکان وەسفیان دەکەن لە تایبەتمەندیەکانی پیاوان بروانین -پێشبڕکێ، عەقلانیەت، باڵادەستی- زۆرتر لەوەسفکردنمان بۆ کۆمەڵگەی سەرمایەداری دەچن.

ئەم هەماهەنگیە دەتوانرێت لەدوو رێگەوە لێك بدرێتەوە. لەنمونەی یەکەمدا، پیاوان وەکو کرێکارانی کرێ هەڵمژراون لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی سەرمایەداریدا لە کاردا، بەرەو پێشبڕکێیەك نێردراون کە ئەم پەیوەندیانە بریاری لەسەر دەدەنو بەها هاوشێوەکان هەڵدەمژن(23). پێناسەی رادیکاڵ فێمینیست بەدەر نیە لەهێڵی کۆمەڵگە سەرمایەدارەکان. دووەم، گەر تەنانەت پیاوانو ژنان بەو رێگەیەش رەفتار نەکەن کە ستانداردە رەگەزیەکان بریاریان داوە، پیاوان ئەو خەسڵەتانە بەهی خۆیان دادەنێن کە لە ئایدیۆلۆژیای باڵادەستیدا بەهایان دراوەتێ. بۆ نمونە، بەم جۆرە دانەرانی بەرزایەکانی کرێستوود Crestwood Heights بۆیان

دەرکەوت کە لەکاتێکدا پیاوان پیشەیی بوون، ڕۆژی خۆیان بەکۆکردنەوەی شتە بێبایەخەکان دەبردە سەر (هەمیشە ئەو تەکنیکانەیان بەکارهێناوە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی داوای هۆکارە ئەقلانیەکانیان دەکرد بۆ بەدەستهێنانی ڕەفتاری ئارەزووکراو) پیاوانو ژنان کارەکتەری (ئەقلانیو پراگماتیک) یان دەدایە پاڵ پیاو. لەکاتێکدا ژنانیش توانایەکی گەورەیان بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێگە زانستیەکانی بەخێوکردنی منداڵو گەشەکردنی منداڵ تەرخان کردبوو، ژنانو پیاوانی بەرزایەکانی کرێستوود کارەکتەری "نائەقلانیو سۆزداری یان دایە پاڵ ژنان(23).

ئەمە بەتەنها هەر یارمەتیدەر نیە بۆ ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی (نێر)و (مێ) لە کۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا، بەڵکو یارمەتیدەریشە بۆ فۆرمێکی تایبەتی لە ئایدیۆلۆژیای سێکسیست لە کۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا وەردەگیرێت. هەروەکو چۆن کاری ژنان خزمەت بەئامانجی دووفاقی بەردەوام بوونی باڵادەستی پیاوانو بەرهەم هێنانی سەرمایەداری دەگەیەنێت، هەروەها ئایدۆلۆژیای سێکسیست خزمەت بەئامانجی دووفاقی پایەبڵندی تایبەتمەندیەکانی نێر/ بەهاکانی سەرمایەداریو نزمکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی مێ/ پێویستی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت. گەر ژنان پایەنزمو بێ دەسەڵات بن لەکۆمەڵگەکانی تردا، هۆکارەکانی (ئەقڵانیەکان) پیاوان بۆ ئەمە دەیان بوو جیاواز دەبوون. تەنها لەکۆمەڵگەیەکی سەرمایەداریدا بەنزم تەماشاکردنی ژن وەکو سۆزدارو نائەقلانی مانای هەیە. هەروەکو چۆن دەربڕینە وەسفیەکان لە ڕێنیسانسدا (سەردەمی ڕابوون) هیچ مانایەکیان نەدەبەخشی تەنها لەکۆمەڵگایەکی سەرمایەداریدا بەنزم سەیرکردنی ژنان وەکو "پاشکۆ" مانای هەیە. (پاشکۆیەتی) وەکو وەسفێك لەکۆمەڵگەی فیودالەکاندا مانای نابێت. لەبەر ئەوەی دابەشکردنی کار کە جەخت دەکاتە سەر ژنان وەکو ژنی بەمێردو دایکان لەناو خێزان پەیوەندیەکی گەورەیان هەیە لەگەڵ بەرهەمهێنانو بەکارهێنانی بەهاکاندا، خراپی ناوبانگی ئەم چالاکیانە بێتوانایی سەرمایە بۆ گەیشتن بەپێویستیە کۆمەڵایەتیە بڕیاردراوەکان دەشارێتەوە، لەهەمان کاتدا ژنان لەبەر چاوی پیاواندا سووك دەکات، هۆکاری ئەقلانی بۆ باڵادەستی نێر دابین دەکات. دەتوانرێت نمونەی ئەمە لە بەکارهێنانی سەیری هاوڕۆژی بازرگانیەکانی تەلەفزیۆندا ببینرێت. لەلایەکەوە، خۆیان بەرەو بەربەستە ڕاستەقینەکان دەبەن بۆ دابین کردنی پێویستە کۆمەڵایەتیە بڕیاردراوەکان وەکو: پاکژکەرەوەکان کە جلو بەرگ دەڕزێننو پێست توشی حەساسیەت دەکەن، کاڵا هەمە چەشنەکان کە لەمادەی کۆن دروست کراون. لەلایەکی ترەوە، سەبارەت بەو گرفتانەی کە دەبێت ناوبانگ خراپکەربن ئەمە بەهۆی ژنانی گاڵتەجارەوە جێبەجێ دەکرێن، ئەو کرێکارانەی کە دەبێت لە ئەم گرفتانە بکۆڵنەوە.

گفتوگۆیەکی هاوتەریب، کە لەوانەیە لەسەر دابەشکردنی ڕەگەزیانەی کار لە بازاڕی کاردا بکرێت هاوبەشێتی نێوان باوکساڵاریو سەرمایەداری پێشان دەدات. دابەشکردنی ڕەگەزیانەی کار ژنان لەئیشە کرێ نزمەکاندا جێگیر دەکاتو لەو کارانەشدا کە باوەڕ وایە بۆ ڕۆڵی ژنان گونجاوبن. ژنان مامۆستان، کرێکاری چاودێری کۆمەڵایەتیو لەبواری تەندروستیدا کرێکارن. ڕۆڵە پەروەردەییەکانی ئەم کارانە پلەیەکی نزمیان هەیە چونکە سەرمایەداری جەخت لەسەر سەربەستی تاکەکەسیو توانای

سەرکێشی کەسی دەکات بۆ گەیشتن بە پێویستیە کۆمەڵایەتیەکان، جەخت کردنەکان دژایەتی دەکرێن لەلایەن خزمەتە کۆمەڵایەتیە بەکۆمەڵ پێشکەش کراوەکانەوە. لەحاڵێکدا دەتوانرێت بەسوك تەماشای گرنگی کۆمەڵایەتی کارە پەروەردەییەکان بکرێت کاتێك ژن دەیانکات دەتوانرێت خۆ ببوێردرێت لە پێشینەی سەرمایە لەبواری ئاڵو گۆڕدا بەهۆی داواکاریەك بۆ بەکارهێنانی بەهاکان. بەم جۆرە ئەوە فێمینیزم نییە کە چینی کرێکار دابەش دەکات بەڵکو سێکسیزمە.

### 4- بەرەو یەکێتیەکی پێشکەوتووخوازانەتر

زۆر گرفت دەمێننەوە تا ئێمە ئاشکرایان بکەین. باوکسالاری وەکو لێرەدا بەکارمان هێناوە زیاتر وەکو زاراوەیەکی وەسفی دەمێنێتەوە وەکو لەزاراوەیەکی شیکاری. گەر لەو بروایەدابین کە مارکسیزم بەتەنها ناتەواوە، رادیکاڵ فێمینیزمیش وەکو پێویست نییە، کەواتە پێویستمان بە پێشخستنی چەند پۆلێنێکی نوێیە. ئەوەی کارەکەمان دژوار دەکات ئەوەیە کە هەمیشە هەمان ئەو روخسارانەی وەکو دابەشکردنی کار باوکسالاریو سەرمایەداری پتەو دەکەن، لەکۆمەڵگەیەکی سەراپا باوکسالاری سەرمایەداریدا، زۆر زەحمەتە میکانیزمەکانی باوکسالاری دابڕێت. سەرەڕای ئەوەش، ئەمە ئەو کارەیە کە دەبێت بیکەین. ئێمە چەند جێگەیەکی دەستپێکمان دەستنیشان کرد، بەسەریرکردنی ئەوەی کێ سود لەهێزی کاری ژنان دەبینێت، پەردەمان لەسەر بناغەی مادی باوکسالاری هەڵدا، بە پشکنینی میکانیزمەکانی ریزبەندیو هاوکاری لەنێوان پیاواندا. ئەو پرسیارانەی کە دەبێت بیانکەین ناکۆتان.

ئایا دەتوانین پرسیار لەسەر یاساکانی جووڵەی سیستەمێکی باوکسالاری بکەین؟ چۆن باوکسالاری دەبێتە هۆی دروست بوونی خەباتی فێمینیستی؟ ئەو سیاسەتە رەگەزیانە چ جۆرێکن کە دەتوانین بیانبینین لەنێوان رەگەزەکانی کۆمەڵگەکانی تری جگە لەسەرمایەداری پێشکەوتوو؟ هاودژیەکی سیستەمی باوکسالاری چینو پەیوەندیەکانیان چییە بە هاودژیەکانی سیستەمی سەرمایەداریەوە؛ ئێمە دەزانین پەیوەندیەکانی باوکسالاری بوونە هۆی بەرزبوونەوەی بزووتنەوەی فێمینیستیو سەرمایەش دەبێتە هۆی دروست بوونی خەباتی چینایەتی، بەڵام چۆن لەچوارچێوەی کایەی مێژوویی‌دا خەباتی فێمینیزم کەڵکی نەماوە بۆ خەباتی چینایەتی؟ لەم بەشەدا دەمانەوێت وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە بدۆزینەوە.

### فێمینیزمو خەباتی چینایەتی

لەرابردوو و لە ئێستەدا، پەیوەندی نێوان فێمینیزمو خەباتی چینایەتی یان ئەوە بووە لەدوو رێگەی تەواو جیاوازدا بوون (فێمینیزمە بۆرژواکان) لەلایەکەوەو (خەباتی چینایەتی) لەلایەکی ترەوە، یان لەناو چەپدا مارکسیزم بەسەر فێمینیزمدا زاڵ بووە. بەتێڕوانین لەمەی دواییان، دەردەکەوێت کە سەرەنجامی هێزی شیکاری مارکسیزمو دەسەڵاتی پیاوان بوو لەناو چەپدا. ئەمانە تێکۆشانە کراوەکانو شوێنگەی هاودژی مارکسیە فێمینیزمەکانیان لەچەپدا دروست کرد.

زۆربەی ئەو فێمینیزمانەی کە خۆشیان بەرادیکاڵ دەزانن (دژە سیستەم، دژە

سەرمایەدار، دژە ئیمپریالیست، سۆشیالیست، مارکسیو هەر جۆرێکی تر) لەسەر ئەو رایەن کە باڵی رادیکاڵی بزووتنەوەی ژنان توانای جوڵەی لەدەستداوە لەکاتێکدا باڵی لیبراڵ کاتی بەدەست هێناوە بۆ بەرەوپێش چوون، بزوتنەوەکەمان لەو سەردەمە هەست بزوێنە پڕ چوستو چالاکیەیدا نییە کە گرنگ نەبێت چیمان کردووە- بۆ بەرزکردنەوەی هۆشیاری، بۆ راکێشانی زیاتری ژنان (تەنانەت زیاتر لەوەی بتوانرێت بەئاسانی رێك بخرێت) بۆ ناو بزووتنەوەکەمان، بۆ زیاتر خستنە پێش چاوی کێشەکانی ژنان لەکۆمەڵدا، هەمیشە بەو رێگایانەی بەشێوەیەکی بنەرەتی بەرەنگاری پەیوەندیەکانی هەریەك لەباوکسالاریو سەرمایەداری دەبنەوە لەکۆمەڵگادا.

ئێستا هەستدەکەین چەند بەشێکی بزووتنەوەکە لە قەفەسنراونو "فێمینیزم" دژی ژنان بەکارهێنراوە، بۆ نمونە، لە دۆزەکانی دادگادا کاتێك دۆزگەران دەڵێن ئەو ژنانەی لە هاوسەریە ماوە درێژەکان دێنە دەر کە تیایاندا کەیبانوو بوون پێویستیان بە (نەفەقە) نییە چونکە هەموان دەزانن ئێستا ژنان سەربەست کراون. شکستی هەتا ئێستایزامنکردنی رێڕەوێك بۆ "باشکردنی مافەکانی یەکسانی Equal Rights Amendment" لەولایەتە یەکگرتووەکاندا رەوایەتی ئامادەبوونی ترسی ژنان لەوەی کە بەکارهێنانی فێمینیزم دژی ژنان بەردەوام بێت دەردەخات، هەروەها ئاماژەش بە پێویستی حەقیقی ئێمەش دەدات بۆ جێگیرکردنەوەی بزوتنەوەکەمان، بۆ شیکردنەوەی ئەرەی بۆچی بەم شێوەیە لەقەفەس نراوە. شتێکی لۆجیکییە بۆ یارمەتی لابەلای مارکسیەت لابکەینەوە لەو جێگیرکردنەوەیەدا چونکە تیۆرێکی پێشکەوتووی گۆڕانی کۆمەلایەتیە. تیۆری مارکسی باش گەشەی کردووە بە بەراورد بە تیۆری فێمینیستیو لەهەوڵماندا بۆ بەکارهێنانی، دەبێت هەندێك جار لە ئامانجەکانی فێمینیست لابدەین.

چەپ هەمیشە هاودژ بووە سەبارەت بە بزوتنەوەی ژنان، هەمیشە وەکو ترسناك بۆ مەبەستی شۆڕشی سۆشیالیستی سەیری کردووە. کاتێك ژنانی چەپ پشتگیری فێمینیزم دەکەن، رەنگە ئەمە هەڕەشەیەکی تایبەتی بێت بۆ پیاوانی چەپ. بێگومان چەندین رێکخراوی چەپ سوود لەهێزی کاری ژنان دەبینن. لەبەر ئەوە، چەندین شیکردنەوەی چەپ (لەشێوە باوو پێشکەوتووەکانیشدا) خۆ- خزمەت کردنن) بەهەردوو شێوەی تیۆریو سیاسی. هەولدەدەن کار لەژنان بکەن واز لە هەولەکان بهێنن بۆ پێشخستنی تێگەیشتنێکی سەربەخۆ بۆ بارودۆخی ژنانو گونجاندنی شیکارەکانی چەپ لەگەڵ بارودۆخەکەدا. سەبارەت بە وەلامی ئێمە بۆ ئەم فشارە، ئەوە شتێکی سرووشتیە کە لە کاتێکدا بەلای شیکارکردنی مارکسیدا دەچین، هەولدەدەین لەگەڵ "برایەتی Fratenity"دا پەیوەندی بکەین بە بەکارهێنانی ئەم نمونەیەو رەنگە واز لە رەوای دان بەخەباتەکەمان بهێنین بۆ (برایەتی) وەکو لەهەولدان بۆ شیکردنەوەی رەوشی ژنان بۆ باشکردنی پیادەکردنی سیاسیمان. لەکۆتاییدا، چەندین مارکسی قایل بوون بە شیکردنەوەی باوی مارکسیەت بۆ کێشەی ژنان. پێویستە وەکو بەشێك لەچینی کرێکار سەیری ژنان بکرێت، خەباتی چینی کرێکار دژی سەرمایەداری پێویستە پێش هەر ململانێیەکی نێوان ژنانو پیاوان بکەوێت. نابێت ململانێی (رەگەز-Sex) موداخەلەی هاوکاری چینایەتی بکات.

لەکاتێکدا رەوشی ئابووری لە ولایەتە یەکگرتوەکاندا لەم سالانەی دوایدا خراپتر بووە،

شیکردنەوەی باوی مارکسیەت خۆی جێگیر کردۆتەوە. لە شەستەکاندا بزووتنەوەی مافە شارستانیەکان، بزووتنەوەی ئازادی قسەکردنی خوێندکاران، بزووتنەوەی دژە جەنگ، بزووتنەوەی شەڕانگێزی پیشەییو گرووپە یەخە سپیەکان (White Collar groups)*هەمووان کێشەی نوێیان بۆ مارکسیەکان بەرزکردەوە. بەڵام ئێستا گەڕانەوەی گرفتە ئابوریە ئاشکراکانی هەروەك هەڵاوسانو بێکاری گرنگی ئەم داواکاریانەیان شاردۆتەوەو چەپیش گەڕاونەتەوە بۆ "بنەڕەتەکان" سیاسەتە تەسك دیاریکراوەکانی چینی کرێکار.

گەشەکردنی "رێبازی مارکسی-لینینی"ەکان دژە فێمینیستیان هەڵبژاردووە لە رێبازو پراکتیکدا. هەروەها ئاماژەش هەن بۆ دابەزینی کێشەکانی فێمینیست لەچەپی ئەکادیمیدا. پەرۆشی رۆژانە لە کۆنفرانسەکانی چەپدا دیار نامێنێت.

فشارەکانی سەر ژنانی رادیکاڵ بۆ وازهێنان لە شتە ساویلکەییەو بوونە شۆرشگێڕێکی "جدی" زیادی کردووە. بە بەراوردکردنی لەگەڵ هەڵاوسانو بێکاریدا کارەکەی ئێمە وەکو بەفیڕۆدانی کات دەردەکەوێت. ئەوەی نیشانەی باڵادەستی نێرە کە بێکاری ئێمە هەرگیز لە قەیرانێکدا حسابی بۆ نەکراوە. لەزۆربەی قەیرانەکانی داویدا ئەوانەی (1930)ەکان، مەزنترین بێکاری بەشێوەیەکی لایەنگیری رەفتاری لەگەڵدا کرا بە بێبەشکردنی ژنان لەچەندین جۆری کار-یەك کاری کرێ بۆ یەك خێزان، ئەو کارەش هی پیاوان بوو.

سەرمایەداریو باوکسالاری لە قەیرانەکاندا چاك دەبنەوەو هێز بەدەست دەهێننەوە. هەروەك چۆن قەیرانە ئابووریەکان ئەرکی گێڕانەوەی توانایان هەیە بۆ سەرمایەداری بەهۆی راست کردنەوەی ناهاوتاییەکان، رەنگە هەرواش خزمەتی باوکسالاری بکەن. سالانی سییەکان ژنانیان گەڕاندەوە دواوە بۆ جێگەی خۆیان.

خەبات دژی سەرمایەو باوکسالاری سەرکەوتوو نابێت گەر واز لە پیادەکردنی لێکۆڵینەوەی کێشەکانی فێمینیزم بهێنرێت. خەباتێك تەنیا مەبەستی پەیوەندیەکانی سەرمایەبێت لە چەوساندنەوەدا شکست دێنێت، لەکاتێکدا پشتگیریە نهێنیەکانی باوکسالاری لە پەیوەندیەکانی چەوساندنەوەدا لەبەرچاو نەگرتبێت. شیکارکردنی باوکسالاری پێویستە بۆ دەستنیشانکردنی جۆری ئەو سۆشیالیزمە بێت کە سودمەندە بۆ ژنان. لەکاتێکدا ژنانو پیاوان شەریکە بەشن لە پێویستی رووخاندنی سەرمایەداریدا (لە هەمان کاتدا) بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی گرووپە رەگەزیەکان دەپارێزن. ئاشکرا نیە -لە هێڵکاریەکەی ئێمەدا، لە مێژوودا، یان لەلایەن سۆشیالیستە نێرەکانەوە- کە ئەو سۆشیالیزمەی خەباتی بۆدەکرێت هەمان شت بێت بۆ ژنانو پیاوان. چونکە سۆشیالیزمی مرۆیی بەتەنها داوای کۆی دەنگ ناکات لەسەر ئەوەی کۆمەڵگەی نوێ چۆن دەبێتو مرۆڤی تەندروست دەبێت چۆن بێت، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر کۆنکرێتی، داوا لە پیاوان دەکات واز لە ئیمتیازەکانیان بهێنن.

ئێمە وەکو ژنان پێویستە رێگە بەخۆمان نەدەین کە لە پێداویستیو گرنگی کارەکانمان پەشیمان بکرێینەوە، هەروەکو چۆن لەرابردوودا وامان کردووە. پێویستە دژی هەوڵی ملکەچ پێکردنی فێمینیستەکان بۆ وازهێنان لە ئامانجەکانمان بجەنگین چ بەنەرمی بێت یان بەرەقی.

ئەمە دوو رێوشوێنی ستراتیجی پێشنیار دەکات. یەکەم، خەبات بۆ دامەزراندنی

سۆشیالیزم دەبێت خەباتێك بێت كە تیایدا گرووپە بەرژەوەندی جیاوازەكان هاوپەیمانیەك پێك بهێنن. نابێت ژنان متمانە بەپیاوان بكەن دوای شۆرش سەربەستیان بدەنێ، لەلایەكەوە چونكە هیچ هۆیەك نیە بۆ بیركردنەوە لەوەی كە ئەوان دەزانن چۆن، لەلایەكی ترەوە لەبەر ئەوەی هیچ زەرورەتێك نی یە ئەوان ئەوە بكەن.

لەراستیدا بەرژەوەندی راستەوخۆیان لەبەردەوامی چەوساندنەوەی ئێمەدایە لەجیاتی ئەوە پێویستە ئێمە رێكخراوەكانی خۆمان هەبنو لەگەڵ بنكەی دەسەڵاتی خۆمان. دووەم لەو بروایەداین كە دابەشكردنی رەگەزیانەی كار لەناو سەرمایەداریدا پیادەكردنێكی داوەتە دەست ژنان كە تیایدا فێربووین تێبگەین پشت بەیەكتر بەستی مرۆڤ چیەو پێویستیەكان چین. لەكاتێكدا خەباتێكی درێژیان دژ سەرمایە هەیە، ژنان دەزانن خەبات بۆچی بكەن. وەكو یاسایەكی گشتی، شوێنی پیاوان لەسەرمایەداریو باوكسالاریدا رێگرە لەبەردەم ناسینەوەی پیاوان بۆ هەریەك لە ،پێویستیەكانی مرۆڤ بۆ پەروەردە، هاوبەشی، گەشەكردن، و ئەگەری گەیشتن بەو پێویستیانە لەكۆمەڵگەیەكی ناپیزبەندو نا باوكسالاردا.

بەلام گەر تەنانەت ئێمە هۆشیاریشمان بەرزكردنەوە لەوانەیە پیاوان دەستنیشانی بەهای ئەو دەستكەوتانە بكەن كە لەوانەیە بەدەستی بهێنن بەرامبەر بەو شتانەی كە لەدەستی دەدەن، ئەو حاڵەتە هەڵبژێرن كە خۆیان دەیلێن، پیاوان لەزنجیرەكان زیاتریان هەیە بیدۆڕێنن.

وەكو سۆشیالیست فێمینیستەكان پێویستە پراكتیكێك رێكبخەین كەخەبات دژ سەرمایەداریو خەبات دژی باوكسالاری ئاراستەبكات. پێویستە سوربین لەسەر ئەوەی كە ئەو كۆمەڵگەیەی ئێمە دەمانەوێت دروستی بكەین كۆمەڵگەیەكە تیایدا پشت بەیەكتر بەستن ئازادبوونە نەك شەرمەزاری، پەروەردەكردن گەردوونیە نەك پیادەكردنێكی چەوسێنەرانە، و تیایدا ژنان بەردەوام نابن لە پشتگیری سەربەستیە هەڵەو كۆنكرێتیەكانی پیاوان.

### *تێبینییەكان:*

*سایكیك Psychic: ئەو دیاردەو بارودۆخانەن كە لەدەرەوەی یاسا فیزیكیو سروشتیەكانن كە پەیوەندیان بەرۆحو دەروونەوە هەیە.

**میتۆدۆلۆژیای ماركسی: Marxist Methodology رێبازێكی میتۆدی لێكۆڵینەوەی ماركسیە.

***مێریتۆكراتیك Meritocratic: سیستەمێكی حوكمڕانیی یان كۆنترۆڵكردنە كە لە لایەن كەسانی خاوەن توانای پراكتیكیو رۆشنبیری بەرزەوە بەڕێوە دەبرێت.

****هێترۆسێكسی Heterosexual: كەسێك لەڕوی سێكسیەوە سەرنجی كەسەكانی رەگەزی بەرامبەری رابكێشێت.

*****هۆمۆفۆبیا Homophobia:نەخۆشیەكی دەروونیە كە كەسی نەخۆش ترسی هەیە لەكەسەكانی هاورەگەزی خۆی.

******گرووپە یەخە سپیەكان White collar groups یەخە سپیەكان رەمزە بۆ ئەو كرێكارانەی كە كاری دەس ناكەن، بەلام یەخە شینەكان نیشانەی ئەو كرێكارانەیە كە كاری جەستەیی دەكەن واتا Orerall لەبەر دەكەن بەواتای بەدلە.

** نیرۆتیك nerotic: - هەژانێكی وەزیفیە بەهۆی تێك چوونی سیستەمی دەماخەوە یان بەشی نائاگایی مێشكەوە روودەدات، نیرۆتیك بەكەسێك دەوترێت ئەم جۆرە نەخۆشیەی هەبێت (عصابي)

## سەرچاوەو پەراوێزەكان

— هەمیشە ئاوەها لێكدراوەتەوە "ژنو مێرد یەكێكن ئەو یەكەش مێردەكەیە" یاسای ئینگلیزی وای دادەنێت كە"ژنو مێرد بەهۆی هاوسەرێتیەوە لەیاسادا

یەك كەسن، ئەمە واتا، زۆرترین بوون یان ئامادەگی یاسایی ژن لەماوەی هاوسەرێتیدا مۆڵەق كراوە، یان بەلایەنی كەمەوە لەگەڵ ئەوەی مێردەكەدا تێكەڵ بووەو یەكی گرتووە"

I.Blackstone, Commentaries, 1965,pp.442-445, cited in Kenneth M.Davidson, Ruth.B Ginsburg and Herma. H. Kay, Sex Based Discrimination (st.poul, Minn: West publishing co. , 1974),p. 117.

2- Frederick Engels, The condition of the Working Class in England (Stanford, Calif: Stanford University press, 1958)

بەتایبەتی سەیری ل66-126بكە لەگەڵ ل296

3- ئەمە ئەو لێكدانەوەیەیە كەكارل ماركس نووسی: "بەردەوامی بەرهەمهێنانەوەی چینی كرێكار، و دەبێت هەمیشە، بارودۆخێكی پێویستی بێت بۆ بەرهەمهێنانەوەی سەرمایە. بەلاّم لەوانەیە سەرمایەداری بەسەلامەتی بەجێگەیاندنی ئەمە بۆ غەریزەی كرێكارانی خود - پاراستن‌و درێژەدان بەوەچە بەجێبهێڵێت"

{Capital (New york: International publishers,1967), vol. 1,p 572}

4-Harry Broverman, Laborand Monopoly Capital (New York: Monthly Review Press. 1975)

5- دەتوانیت سەیری

“Politics of Ego: A Manifesto for New York Radical Feminists” Rebirth of Feminism,ed Judith Hole and Ellen Levine (New York Quadrongle Book,1971), pp, 440-443 بكەیت. "رادیكاڵ فێمینیستەكان" ئەو فێمینیستانەن كەدەڵێن جوڵێنەری بنەڕەتی مێژوو ململانێی پیاوانە بۆ كۆنترۆڵكردنی ژنان. لەم كایەیەدا (رادیكاڵ) مانای دژە سەرمایەداری، سۆشیالیست دژەكلتور... هتد ناگەیەنێت بەڵكو مانایەكی دیاریكراوی هەیە لەبیروڕاكانی ئەم جۆرە تایبەتەی فێمینیست یان گروپە فێمینیستەكان دا. دەتوانرێت نووسینی زیاتری رادیكاڵ فێمینیستەكان، كەكاریگەرترینیان ئەوانەی رادیكاڵ فیمینیستەكانی نیویۆركە ببینرێت لە

Radical Feminism, ed. Annkoedt (New York: Quadrangle Press 1972).

6- Kate Millet, Sexual Politics (New york, Aron Books, 1971). P.25

7- یەك نمونەی ئەم جۆرەی مێژووی رادیكاڵ فێمینیستت كتێبەكەی سۆزان براون میلەرە

Aginst Our Will,Men, Women, and Rape (New York: Simon & Shuster, 1975).

8- بۆ بۆچوونی زانستی كۆمەلایەتی بۆرجواز لەسەر باوكسالاری سەیری جیاكاری ڤیبەر بكە لەنێوان دەسەلاّتی باو و دەسەلاّتی یاساییدا

Max Weber: The Theories of Social and Economic Organization, ed. Talcott Parson (New York: The Free press. 1964), pp. 328-357.

ئەم بۆچوونانە هەروەها لەلایەن Elizabett fee باسكراون لە:

“The Sexual Politics of Victorian Social Anthropology” Feminist Studies, Vol. 1. Nos 3-4 (Wintewr-Spring 1973), pp. 23-29,

هەروەها لەلایەن Robert.A. Nisbetەوە

The Sociological Tradition (New York: Basic Books, 1966(, especially Chapter 3, “Community”

9- سەیری

Viana Muller "The Formeotion of the state and the Opression of Women: Some Theretical Considerations and a case Study in England and Wales "Review of Kadical political Economics, Vol. 9, no. 3 (Fall 1977), pp7-21.

10- Gayle Rubin "The Traffic in Women", in Anthropology of Women, ed. Reiter, p. 159.

11- Himmelweit و Mohun دەستنیشانی دەکەن کەهەردوو جۆرەکەی بەرهەمهێنان (خەڵك و شتەکان) بەشێوەیەکی لۆجیکی پێویستن بۆ وەسف کردنی مۆدێکی بەرهەمهێنان چونکە بەهۆی پێناسەکردنەوە مۆدێکی بەرهەمهێنان دەتوانێت خۆی بەرهەمبهێنێتەوە. هەریەك لەجۆرەکان بەتەنها کفایەت نییە لەخۆیدا. بۆ ئاسانکردنی ئەمە، بەرهەمهێنانی شتەکان پێویستی بەخەڵکە، بەرهەمهێنانی خەڵك پێویستی بەشتەکانە. هەرچەندە مارکس پێویستی سەرمایەداری بەخەڵکی دەزانی بەڵام خۆی خەریك نەکرد لەگەڵ ئەوەدا کەچۆن بەرهەمهاتوون یان لایەنە پەیوەندیدارەکانی نێوان دوو جۆرەکە چیبوون. سەیری Himmelweit and Muhen "Damestic Labour and Capital

12- گرنگە ئەوە بێتەوە بیر کە ژنان لەماوەی پێش پیشەسازیدا بەشداریەکی گەورەی مانەوەی خێزانیان کردووە — یان بەبەشداریکردن لەپیشەیەکی خێزاندا یان بەچالاکیە کشتوکاڵیەکان. ئەم بەشداریکردنە بۆ دەستپێکردنی بەکاری کرێی ژنان یارمەتیدەرو پێویست بوو بۆ سەربەخۆبوون لەپیاوان لەخێزان دا. کەواتە جیابونەوە نوێکە لەبەرئەوە نەبوو کەژنان داهاتیان دەستکەوت، بەڵکو لەپشت کۆنترۆڵی مێردەکان یان باوکەکانیانەوە ئەو کارەیان کرد Alice Clark لەکتێبی The Working Life of Women in the Seventeenth Century (New York Kelly, 1969) دا رۆڵەکانی پێش — پیشەسازی ژنان و ئەو گۆڕانکاریانەی رویان دا کاتێك سەرمایەداری پێشکەوت باس دەکات، وا دەردەکەوێت ئەو حاڵەتە بێت کە مارکس، ئەنگلزو کاوتسکی بەتەواوی ئاگاداری رۆڵی ژنان نەبووبن لەپێش سەرمایەداریدا.

13- نمونەکان وەرگیراون لە Heidi .I. Hautmann "Capitalism, Patriarchy, and Job Segregation by Sex , Signs; Journal of Women in Culture and Socitey, Vol. 1, no. 3 pt. 2 (Spring 1976) pp.162-163

14- هەروەکو چۆن یاساکانی کارگە بەقازانجی هەموو سەرمایەداران دژ بەناپەزایەتی هەندێك دەکران، هەرواش، رەنگە بتوانرایە یاساکانی پارێزگاری لەژنان و منالان دەربکرێن لەلایەن دەوڵەتەوە لەتێڕوانینێکی بەرامبەر بەرهەمهێنانەوەی چینی کرێکار تەنها تێڕوانینێکی ئالەتیانەی رەتیدەکاتەوە کەیاساکانی کارگەو دانانی یاساکانی پارێزگاری رەوایەتی دەدەنە دەوڵەت بەدابین کردنی سازشەکان کەوەلامن بۆ داواکاریەکانی چینی کرێکار خۆی.

15- بۆ باسکردنی تەواوی دانانی یاساکانی پارێزگاری و ژنان، سەیری:
Ann c. Hill "Protective labor Legislation for Women" Its origin and Effect " (New Havn, conn: yale Law School 1970)
بکە کەچەند بەشێکی بلاوکراوەتەوە لە
Barbara A.Bacock, AnnE Freed man, Eleanon H. Norton and Susan C. Ross Sex. Discrimination and the Law: Causes and Remedies (Boston: Little, Brown & Co. , 1975)

هــەروەها ســەیری Hartmann "Job Sergregation by Sex" pp, 164-166

16- هارتمــان لــە "Women's Work"دا مناقەشــەی ئــەوە دەكــات كــەژنی كارنەكــەر وەكــو ستانداردێكی ژیانی نێر لەســەرەتایی ســەدەی بیســتەم دا سەیركراوە، ســەیری ل136 ژمــارە 6بكــە Grestein لــە "Dometic Work"دا پێشــنیار دەكــات كــە ستانداردی ژنە كرێكار دێتە ناو دیاریكردنی بەهای هــێزی كاری نێرەوە، سەیری ل121بكە

17- گرنگــی ئــەو راســتیەی كــەژنان كــاری خزمەتكردنی پیاوان لەماڵ دا بەچاكتر دەزانــن نـابێت زۆر جەخت بكرێتە سەر. هەروەك Pat Mainardi ووتــی لــە The Politics of Housework دا "پێوانەی چەوساندنەوەت لەرادەی بەرەنگاری ئەودایە" (in Sisterhood is powerful, ed. Robin Morgen {New York: Vintage Books, 1970},p451).
وتارەكەی ئەو هــەروەكو فایەرستون Firestone لەسەر خۆشەویستی گرنگە بۆ ئێمە، شیكردنەوەیەكی پەیوەندیــەكانی دەســەڵاتە لــەنێوان ژنــانو پیــاوان دا هەروەكو بەنمونە كاری ماڵ رونكراوەتەوە.

18- بۆ تێروانین لەقوتابخانەی فرانكفۆرت ســەیری ماكس هۆركهایمەر بكە لە "دەسەڵاتو خێزان" دا Max Horkheimer "Authority and the Fimily" in critical Theory (New York: Herder & Herder, 1972)
هــەروەها ســەیری پەیمانگــەی فرانكفــۆرت بــۆ لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتی "The Family" لە Aspects of Sociology (Bastor: Beacon, 1972).

19- بــۆ نمونــە، خــاوەن پیشەســازیەكانی Milwauke كرێكاران لەبەرهەمــهێنان دا بەدەرەجــەی یەك بەگوێرەی گروپــە رەگەزیــەكان رێك دەخــەن، بــەڵام دواتــر هــەموو كرێكارانیــان فــێركرد بــەئینگلیزی بدوێــن، لەبەرئــەوەی تەكنــەلۆجیاو پێویســتیە گونجاوەكــانی كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتی گۆڕاون سەیری
Cerd Korman, Industrialization, Immigrants, and Americanizers, the View from Milwaukee 1866-1921 (Madison: The state Historical society of Wisconsin, 1967)

20- Carol Brown، لــە Patriarchal Capitalism دا، بۆ نمونــە مناقەشــەی ئــەوە دەكات كەئێمە لە "پشت بەســتن بــەخێزان" ەوە بــەرەو "پشــت بەســتن بەپیشەســازی" باوكســالاری دەرۆیــن لــەناو سەرمایەداریدا.

21- Richard Sennett و Jonathan Cobb لە The Hidden Injuries of Classدا (New York: Random House, 1973) كەشفی جۆری هاوشێوەی دیــاردەی ســایكۆلۆجی پەیوەندیەكانی نێوان ریزبەندی پلەو پایەی نێوان پیــاوان دەكەن لەكاردا.

# ئاین لەنێو سیاسەتدا

• تێد. س. لیولن
• لە ئینگلیزییەوە: دانا سەردار و
ئاسۆ جبار

پێدەچێ ئەو وتەیەی "جۆرج بالاندێ - 1970" ڕاست نەبێت کەدەڵێ " هەمیشە پیرۆزی وجودی هەیە لەنێو سیاسەت دا، بەڵام بەدەگمەن دوورە لێوەی. بەهەمان شێوە "مایرۆن ئارانۆف" سەرنجی ئەمەی داوەو لەباسێکیدا ئەڵێت: هەر لەسەرەتای شارستانیەتەوە سیاسەتو ئاین ئاوێزانی یەکتریبوون". بینەرانی فیلمی کلاسیکی پرۆپاگەندە ئامێز" لیڤی ڕایفینستاڵ" کە لەژێر ناونیشانی "سەرکەوتنی ئیرادەدا - لەساڵی 1934 دا لەنۆرمبێرگ لەکۆنگرەی پارتی نازیدا پێشکەش کرا" سەیریان لەوەهات ئایا تەماشای کۆبوونەوەیەکی سیاسی دەکەن یان سرووتێکی ئاینی. بەهەمان شێوەش "بەیان"ی سەربەخۆی ئەمریکاو دەستووری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پیرۆزیەکی پەنهانیان لەنێو خۆیاندا حەشارداوە کە بۆ خۆی لەتواناییدایە ڕەوایەتیەکی سیاسی ببەخشێتە قۆناغە سیاسیەکان. ئەوڕۆکە ئەستەمە ململانێی سیاسیێ هەردوو دەوڵەتی ئێران و ئیرلەندا لەململانێی ئاینی جیابکرێتەوە. بەهەرحاڵ لەکۆمەڵگە پێش- پیشەسازیەکاندا "دواکەوتوەکان " بەپێچەوانەی کۆمەڵگە ئاڵۆزو پێشکەوتوەکانەوە سنووری نێوان سیستمە فەرعیەکانی ئاین و سیاسەت و ئابووری و خزمایەتی نزیکایەتی Kinship" کەمتر دەرئەکەوێت و لەیەکتریش جیاناکرێنەوە. هەروەها ئەفریقیەکی پاڵێوراو بۆ سەرۆکایەتیکردنی خێڵێک وەکی خۆی پەنا ئەباتەبەر ڕۆحی وەچەکانی پێشوو. وەك پشتیوانیەك ئەمەش بۆخۆی گەڕانەوەیەکە بۆ هێزەکانی سەروو - سروشت natueral Super بەڵام ئەم گەڕانەوەیە زیاتر نیە لەگەڕانەوەو ڕازیبوونی سیناتۆرێکی پاڵێوراوی

سەرۆکایەتی ولاتە یەکگرتووەکان بۆ پشتیوانی کۆمپانیایەکی گەورەی بازرگانی یان پیشەسازی بۆ بەئەنجام گەیاندنی هەڵمەتێکی سیاسی. لەتەك ئالۆزبوونی کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا ئەستەمە دەورو کاریگەری ئاین بدۆزینەوە لەنێو سیاسەت دا. هەروەها ئەبینین دەسەلات لەئاستە جیاجیاکان دا پشت ئەبەستێت بەهێزەکانی سەروو سروشت، بۆ نمونە لەلای "ئەسکیمۆکان" شامان shaman ئەو پیاوەیە کەزۆرترین دەسەلاتی هەیە بەوەی توانای پەیوەندیکردنی هەیە بەجیهانی روحەوە. هەروەها لەنێو خێڵەکانی هۆپی Hopi باشوری رۆژئاوایی ئەمریکاش دا دەسەلاتی سیاسی بەهۆی سرووتو سەماو رێکخراوە ئاینیەکانەوە دەکەوێتە نێو مشتومرێکی بەرفراوانەوە. هەروەها ئیسرائیلی مۆدرێنیش سەرەرای ئەوەی کە ولاتێکی پێشکەوتووە لەرووی پیشەسازیەوە بەلام لەرووی نێو نەتەوەییەوە بەپشتیوانی بنەمایەکی ئاینی تەقلیدی Tradition نمایشی دەولەتێکی بەهێز دەکات. ئاساییە گەر لەلایەکی دیکەوە ئامازە بەو کۆمەڵگایانەش بدەین کەسەرقاڵی راوشکارو ئەمبارکردنن "کۆکردنەوەن Hunting gatharing" وەك کۆمەڵگەی کۆنگ "Kong" و گرووپە خێڵەکانیش وەك "یانۆمامۆ" هەروەها دەولەتیش وەك "کوبا" لەنێو ئەم کۆمەڵگایانەدا ئاین دەورو کاریگەریەتیەکی نیمچە ماکەزاری ئەبینێت.

ئەو دەورەی کەئاینو هێزەکانی سەروو سروشت لەنێو سیاسەت دا ئەیبینن سێ خەسڵەتی دیاریکراویان هەیە:-

- حکومەت بەتەواوەتی پشت ئەبەستێت بەئاین وەك لەسیۆکراتیدا "Theochraty" بەرچاو ئەکەوێت.
- ئاین بەکارئەهێنرێت بۆ بەخشینی رەوایەتی بەدەستەی دەسەلاتداران "raling elite"
- لەوانەیە ئاین لەنێو بیروباوەرە تەقلیدیەکان دا نمایشی بونیادی ژێرخان بکات وە لەتواناش دایە بەکاربرێو یاری پێبکرێ لەلایەن ئەوانەی لەهەوڵی گرتنە دەستی دەسەلاتدان.

## رەوایەتی پیرۆز:- Sacred Legitimacy

هیچ جیاوازیەك بەدی ناکرێت لەنێوان دەولەتی ئاینی "سیۆکراتی" و دەولەتی علمانیدا "secular state" بەو بەڵگەیەی کەلەواقع دا بەشێوەیەك لەشێوەکان سەرجەم دەولەتە پێش -پیشەسازیەکان "دواکەوتووەکان" پێویستیان بەجۆرێك لەرەوایەتی "خودایی" هەیە. هەروەها ئیدارە ئاینییەکانیش پێویستە لەسەریان چارەسەری کۆمەڵێك لەکێشە علمانیەکان بکەن وەك بەرگریکردنو بازرگانیو دروستکردنی رێگەوبانو ئاوو ئاوەرۆ؟ بەم پێیە ئەو جەختە ئاینییە تەمسیلی باروذۆخێکی چەندایەتی ئەکات نەك چۆنایەتی. تەنانەت لەوبارودۆخانەشدا کەئاین دەورێکی کاریگەری تیادا ئەبینێت هێشتا علمانیەتو بیرۆکراتیەتی رەهمبانی لەیەکتری جیائەکرێنەوە وەك لەکۆمەڵگەی سەرەتایی "ئینکاومایا"دا بەدی ئەکرێت، لەکاتێك دا کە"رەبەنەکان" ئەو دەسەلاتە مەزنەشیان هەیە بەلام ئەو دەسەلاتە نییە بتوانرێت لەنێو چالاکیە دونیاییەکانی حکومەت دا بەکاربرێ. بۆ نمونە پادشا کاریزماتیەکان یان پیرۆزەکان "وەك پاپا" لەبۆنە دیاریکراو و رەسمییەکان دا نمایشی پیرۆزی خۆیان ئەکەن.

لەساڵی "1978"دا "جاکۆب جانسن" باسی لەوە کردووە کە بەهەمان شێوە ئەم حاڵەتە

لـەلای فیرعەونی‌یـەکانی میسـریش هـەبووە، فیرعەونـەکان یـەکێك بـوون لەوانـەی کەسیستمی گـەردوونی "مـەئاتیان Māat" پێ‌بەخشـرابوو هەروەها پارێزگاریان لێکردوەو لەهەمان کاتیشدا ملکەچی ئەو سیستمە بوون. فیرعەونەکان خۆیان "تـابۆ" بـوون "Taboo" لەگـەڵ ئـەوەی کـە نفوزێکـی گەورەشـیان هـەبووە بـەڵام توانـایی خـەلقکردنی پـەرجووەکانیان نـەبووە کـەچی ملکەچی یەزدان بوون‌و ناچاربوون بەشێوازێکی تـەواو دونیـایی کـارو فرمـانی دەسـەڵات بـەرن بەرێوە. لەنێو ئـەو میلەتانـەی کەدەولـەت تیایدا دابـەش نـەبووە بەسـەر چـەند بەشـێکدا وەك کۆمەڵگە پێشـکەوتووە پیشەسازیەکان کـەمترین گرفتیان هەیە لەمامەڵەکردنی "مرۆڤ‌و یەزدانی"، "پیرۆزو دونیای‌دا". "لوسی میر" لەسیستەمی سـەرۆکایەتی ئـەفریقادا تێبینـی ئـەوەی کـرد کەکاریگەریەتیـەکی ئـەوتۆی "دوومـەرجی بنـەرەتی" هەیە کەپێکـهاتوون لـە: پشـتیوانی کۆمەڵایەتی‌و هێزو توانایی پادشـایی هـەڵبژێردراو بـۆ پـەیوەندی‌کردن بەبوونـەوەرانی سـەرو سرووشتەوە، واتە سەرۆك پێویستی بەپشـتیوانی جەماوەر هەیـەو لەهـەمان کاتیشدا پێویسـتی بەرەوایەتیـەکی پـیرۆزیش هەیـە. یەکـەمیان سـەرچاوەکەی دەگەرێتـەوە بـۆ کەسـایەتی دانسقەو بـەتوانایی مـەلیك‌و داواکاری‌یە ڕاسـت‌و رەواکانی لەسنووری باسا تەقلیدیەکان دا لەپێناو گەیشتن بەعەرشی پاشایەتی. لەهـەمان کاتیشدا پێویستی بەدەستەبەرکردنی ڕەوایەتیەك هەیـە ئـەویش بـەهۆی بەسـتنەوەی خۆیـەوە بەئەفسـانەیەکەوە ئـەو ئەفسـانەیەش بریتی‌یـە لەپاڵـەوانێکی بـەتوانای سـەروو سرووشـت کـە لەسـەرەتاوە دامەزرێنـەی ئـەو کۆمەڵگەیـە بـووە یـاخود وەچەیـەکی بەرپرسـیار بـووە لـەرووداوە گرنگەکانی مێژووی ئەفسانەیی ئەو کۆمەڵگەیە بۆ نمونە خێڵی شایلۆك shilluk" لەسۆدان باوەڕیـان وایە کەپاڵەوانێکی "نیمچە خودایی" بەهۆی خاڵی تێپـەڕبوونی داستانەوە هەستاوە بەخـەلقکردنی میللەتەکـەیان "کۆمەڵەکـەیان" و لادێکـانی دروسـتکردوەو هـەروەها دۆزەرەوەی بەشـکاریە بنەرەتیەکانی کۆمەڵگاکەیان بووە. ئـەم پاڵەوانـە نـەمرە "نیکـانگ.. Nyikang" ئـەوەندەی نەخاياندو دیارنـەماو روحیانەتەکـەی چووە نێـو جەستەی سەرجەم ئەو پادشایانەی کەدەگەشتنە عەرشـی سـەرۆکایەتی خێڵـی شـایلۆك. "خێڵـی شـایلۆك" تەنـها کۆمەڵگەیـەکی نوێ‌بـوون کە "جیمس فریـزەر" هـەڵیبژاردن بـۆ کتێبەکـەی خۆی کـەدەڵێ: پاشـاکان سـەرچاوەی سـەرەکی پیتـو بەرەکـەتی زەوی‌وزارو مـەڕو مـاڵات بـوون، بەبڕوای "فریزەر" ئەم پادشایە پێش ئەوەی پـیر بێت لەسرووتێکی تایبەتدا کوژرا، بۆئـەوەی ئـەو هـێزو توانستە پەنهانـەی خـۆی وەك خـۆی بمێنێتەوەو بچێتە نێـو جەسـتەی هەریـەکێك لـەو سـەرۆکە گەنجانـەی کەدەگەنـە عەرشـی پادشـایەتی. هـەروەك چۆن ئـەو باوەڕە ڕاسـتە کـەدەڵێ ژمارەیـەکی زۆر لـەو پادشـایانەی لەشەرەکان دا کوژراون یان تێکشکاون، بەڵام ئـەو باوەڕەی کـەباس لـەوە دەکات کەئـەو پادشـایە لەسروتێکی تایبـەت‌و دیـارکراودا کـوژراوە وەك بەشێکی بنەرەتی لەنێو ئەفسـانەی "شـایلۆك"دا دەمێنێتـەوە. لـەکاتێك دا "فریـزەر" تـەئکید ئەکاتـەوە سـەر بـەهای رەمـزی پیتوبەرەکـەت لەهەمان کاتیشدا گەیشـتە دۆزینەوەو پشکنینی ڕەگەزێکی گرنگی سیستەمی سەرۆکایەتی ئەفریقی ئەویش دەسنیشانکردنی ڕەمزی کەسایەتی "شا" وەك هاوتای بەرژەوەندی هەموو کۆمەڵگا.

لەهـەمان کـاتدا سـروتە ئاینی‌یـەکان چـەند وەزیفەیـەکی سیاسیشـیان هەیـە ئـەوەندەش هەڵئەسن بەنمایشـکردنی یەك لەدوایـەکی ئـەو

ئەفسانانەی کەڕەوایەتی خۆیان هەیەو لەتوانایاندایە خەڵکانی کۆمەڵگە لەپشتێنەیەکی پیرۆزدا یەکبخەن و وەئەمەش بۆ خۆی بالا دەبێتەوە بەسەر سەرجەم بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی تاک دا یان ململانێی ڕۆژانەدا، هەروەها بەهۆی هێزی پەنهانی وەچەکانی پێشووشەوە پەرەئەدات بەکۆمەڵگە.

لەنێو هەندێ کۆمەڵگەی "لامرکزی"ش دا ئاهەنگە ئاینیەکان سەرچاوەیەکی بنەڕەتی جێگیربوونی کۆمەڵگەن، بۆ نمونە لەلای هندیە ڕەسەنەکان "Plain Indian" خێڵ تەنها بۆماوەی دوو هەفتە کۆئەبۆوە ئەویش لەپێناو سازدانی سەمای خۆردا "Sun -dance" هەر لەو کاتەشدا ئەنجومەنی سەرۆکایەتی خێڵ کۆئەبۆوەو لەپێناو دەرکردنی بڕیارێك دا، لەکاتێکدا کە"پریاسکەی دەرمان"، کەهەردوو گروپی ئاینیو عیلمانی گەیاندە دەسەڵات دەستاو دەستی دەکرد.

## مامەڵەکردن بەڕەمزە ئاینیەکانەوە لەکۆمەڵگەی لۆگابرادا:-

"سەروو سروشت "میتافیزیکا" نمایشی زیاتر لەکۆمەڵێ بیروباوەڕی ناکاریگەر دەکاتو وێکچووی پەردەی دواوەی شانۆیە بۆ ڕەفتاری سیاسی. ئەم بیروباوەڕانە جێگەی یاری پێکردنن لەلایەن ئەو کەسانەی لەپێشبڕکێی دەسەڵاتدانو هەروەها لەلایەن ئەوانەشەوە کەپشتیوانی پێشبڕکێکەرانی دەسەڵات دەکەن."

بەهەمان شێوە ئەم بارودۆخە لە"لۆگابرای" ئۆگەندادا نمایشی سیستمی سیاسی ئەکات.

ئەم کۆمەڵگەیە سیستمێکی خزمایەتی "نزیکایەتی - Kinship" ی کلاسیکی پۆلێنکراوی هەیەو هیچ جۆرە سیستمێکی حوکمڕانی نەبووە لەپێش زەمەنی کۆلۆنیالیزم دا. بچووکترین یەکەی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵە بریتیە لەکۆمەڵگەیەکی باوکسالاری ناوچەیی کەپێکهاتووە لەچەند دەستە کۆمەڵێکی خێزانیو چەند دەسەڵاتدارێك وە دەسەڵاتیش لەسەر بنەمایی سیستمی گەورەو بچوك بەسەر کەسەکان دا دابەش ئەکرێ. لەکاتێك دا گەنجە بەتواناکان گەورەدەبنو لەپێناو زەوی‌وزارو دەسەڵاتدا دەکەوتنە ململانێوە لەتەك پیرەکاندا. لەبەرئەوەی ڕێگە نەئەدرا توندوتیژی لەنێو خێزاندا بەکاربێت لە بەربەرەکانیەکاندا، دەبوایە ململانێی نەوەکان لەڕێگەی شێوازی ئاینیەوە چارەسەر بکرێت. ئەگەر لایەنێکی ململانێکە نەخۆش کەوتو کاهینەکان سەلماندیان کەدوژمنەکەی ڕۆحی باپیرانی لێ‌هانداوە، ئەوا ئەو کەسە "جادوگەرەی" کە ڕوحەکەی بانگهێشت کردوە پلەو پایەی زیاتر دەچەسپێت.

"لەلایەکی دیکەوە ئەگەر هاتوو دەسەڵاتداران لەوباوەڕەدا بوون کەبانگهێشت کردنی ڕۆحی وەچەکانی پێشوو تەنها بۆ گەیشتنە بەدەسەڵات یان تەنها بۆمانەوەی دەسەڵاتە بەبێ هیچ سودوو قازانجێك بۆ ئەندامانی خێڵ یان "وەچەکان" ئەوا ئەم لایەنە تاوانبار ئەکرێ بەوەی کەجادووگەرە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی شوێنگەی خۆی لەدەست بدات. هەندێك جیاوازی هەیە لەنێوان ئەم دوو ڕاڤەکردنەدا، بەلام کاریگەرێتی هەردوو ڕاڤەکرنەکە پێکهاتووە لەبەخشینی ڕەوایەتی یان لەناوبردنی دەسەڵاتی تاکە کەس" بەم پێیە شوێنگەیەك ئەدۆزینەوە، کەتایبەتە بەیاریکردن بەسیستمی بیروباوەڕەکانەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم یارییپێکردنە تەنها لەلایەن ئەو ئەندامانەوە بەڕێوەنابرێ کەتێوەگلاونو گرفتاربوون" واتە بەشداربووانی پرۆسەکە" بەڵکو ئەم یاریکردنە لەلایەن کۆمەڵانی خەڵكو پێشەنگو نوێنەری

روحەکانەوە دەگاتە بڕیارێك هەروەها ململانێی نێوان کۆمەڵە نێوخۆیی‌یەکان گرفتاری ئەم جۆرە ڕێگە چارەیە نابن لەبەرئەوەی بانگهێشتکردنی ڕۆحی (خێو)و جادوو لەدەرەوەی بازنەی تایەفەیەکەوە هیچ سوودێکی نییە. هەروەها پاڵەوانبازیو دەرەبەگایەتیو جەنگەکان ڕێگەچارەیەکی باوبوون "تقلیدی" بۆ چارەسەرکردنی ئەم ململانێو بەربەرەکانیانە. بەڵام هەمیشە بەکارهێنانی سیحر بۆتە هۆی کۆبوونەوەو لەیەکتر نزیکبوونەوەی دراوسێکانی ئەم کۆمەڵانە بۆئەوەی چیتر هەوڵی ئەوەبدەن لەململانێو بەربەرەکانیە ئاشکراکان دوربکەنەوە.

بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەرجەم بارودۆخەکان دا سەروسروشت نفوزێکی سیاسی هەبووە لەبەرئەوەی ملکەچی وەچە مردووەکانی پێشو بووەو هەروەها پاداشتو سزاش بەهەمان شێوە وەرگیراوی هەمان سەرچاوەبووە.

## هێما گەرایی "سیمبۆلیزم" و سرووت لە کۆمەڵگە مەدەنی‌یەکان دا یان "علمانیەکان"دا "Symbolism"

لەوانەبێت ئاسایی بێت تێگەیشتن لەسەرەنجامی ئەو نمونەیەی کە لە ڕەوایەتیەکی پیرۆزدا نمایشی جیاکاریەکی مێژویی کۆمەڵگە پێش - پیشەسازی‌یەکان دەکات "واتە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان"، هەتا سیاسەتە مەدەنی‌یەکانیش "علمانیەکانیش" هەنوکە ئایین تیایدا ئامادەنیە، بەڵام بەهۆی ئەو گرو تینە سۆزدارەی ئەو جیهانە پیرۆزە دیاریکراوەوە ئایین شاردراوەتەوە "واتە بەنادیاری ئامادەیە".

"دێڤید کێرتزەر" تێبینی ئەوەی کرد کەبەدەر لەخەیاڵاتی مرۆڤی مۆدێرن بۆ عەقڵانیەتی سیاسەت. بەهۆی وەرگرتنی بڕیارەکانەوە بەپێی بنەمایەکی بابەتی هێماگەرایی "symbolism" بەنێو لایەنو ڕووکارە جیاجیاکانی سیاسەت دا بڵاو دەبێتەوە، هێماگەرایی بەهۆی سرووشتی خۆیی‌یەوە کەنائاگایانەیە "لاشعوری" لەبەرئەوەی مەیل ئەدات بەمامەڵەکردن بەڕەمزەکانەوە بەوەی خۆی بۆ خۆی شتێکە لەشتەکان. لەڕاستیدا حکومەتو پارتو دەوڵەت پێکهاتێکی ڕەمزین بەپێچەوانەی بیروباوەڕی سەرجەم خەڵکەوە کەوەك بوویەکی جێگیرو سەقامگیر سەیر دەکرێن.

هەروەها بە بەردەوامی ئەو پێکهاتو ڕێکخراوانە خۆیان لەڕەمزەکانەوە وەردەگرن لەبەرئەوەی بەتەنها ڕەمزەکان لەتواناياندایە بەجێگیری بمێننەوە. هەر لەوکاتەشدا ئەو خەڵکانەی کەدروستکەری ئەو ڕێکخراو و سەرۆکانەن هەمیشە لەحاڵەتی ئاڵوگۆڕکیو گۆڕاندان.

بەپێی "کێرتزەر" هێماکان سێ تایبەتمەندیان هەیە:

1- چڕکردنەوەی ماناکان:- بۆ نمونە: بوونی ئەو بیرۆکەیەی لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە کەبریتیە لەیەکنەتەوەیی لەژێر ڕکێفی یەزداندا، هەروەها وەك ڕەتکردنەوەی حوکمی چەوسێنەرانی ئەورووپیو نیشتمان پەروەریو خۆشەویستیو سۆزی بەرگریکردن لەنیشتمان لەحاڵەتی شەڕو سەربەستیو دیموکراتیەت دا ئەمانە هەمووی تەمسیلی هێماکان دەکەنو "بەهۆی ئەمەشەوە ماناکان لەکلێشەسازی ئەستێرەو هێڵەکانی ئاڵای ئەمریکادا کۆدەبێتەوە.. ((وەك گوزارشتێکی نادیار - وەرگێڕ")).

2- هێماکان مانایی جۆراوجۆر لەخۆدەگرن، واتە پێکهاتوون لەمەودایەکی بەرفراوانی مانا

جیاوازەکان - بۆ نمونە خاچی مەسیحی وەك تاکە هێمایەك لەلای زۆربەی کەسەکان مانایی جیاجیا لەخۆدەگرێ "یان نمایشی مانای جیاواز دەکات".

3-هێماکان خاوەنی تایبەتمەندیە ئالۆزو سەرلێشێواندنەکانن بەهۆی ئەمەشەوە ناتوانرێت بەشێوەیەکی دیاریکراو دیاری بکرێتو هەروەها مانایەکی دیاریکراویشی نیە.

"سرووت" بریتییە لەرەفتارێکی پێچراو بەتۆرێکی هێما کارلێك- وەلەبونیادی تایبەت پێکهاتووەو لەشوێنگەو تەنگەژە هەڵچووە تایبەتەکان دا رووئەدات" "کێرتزەر".

لەرێی سرووتو بەشداریکردنی هاوڵاتیەکی ئاسایی لەسرووتدا هاوڵاتی بەناچاری پەیوەست ئەبێت بەو شتە مەزنە تایبەتەوە "کەتایبەت نییە بەخودی تاك خۆیەوە" ئەویش دەوڵەتە.

هێماکان دەسەڵات پیرۆز دەکەن. بۆ نمونە ئاهەنگ گێران بەبۆنەی چواری حوزەیرانەوە "جەژنو ئاهەنگێکی نیشتمانییە لەئەمریکا"، رێورەسمی بەرێوەچوونی کۆنگرەی پارتی سیاسی نیشتمانی، پێشکەشکردنی گوتاری "سەرۆك" یان "سەرۆکایەتی" چەسپاندنی دەستور.. هتد، ئەمانە هەمووی نمایشی شێوەیەك لەرەمز دەکەن. کەتیایدا بەتاسەوە دەست لەملی دەوڵەت دەکرێت "پرۆسەی وەفاداری - وەرگێڕ". سرووتەکان پێویستیان بەوەیە کەناائاسایی و نائیجابی بن، بۆ نمونە تیرۆکردنی سەرۆك جۆن کەنەدی ".Jhon F Kenedy"، هەروەها تەقاندنەوەی کەشتیگەلی فەزایی چالنجەر، کێشەی بارمتە بیانیەکان لەئێران، هەموو ئەمانە ئەو رووداوانەن کەلەئاستی نیشتمانیدانو وەلەئاستی ژیانیشدا گشتگیرنو هەروەها وەفاداری حزبو ئایدۆلۆژیا بەرهەڵستکارەکانی تێوە دەگلێو خەڵکانیش لەپەیوەندیەکی جۆشداردا جۆشدەدەنو راپێچیان دەکەن بەرەو نەهامەتیو چەرمەسەریەکی هاوبەش. ململانێیەکی گەورەی وەك شەڕی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ "عێراق" دا بەنسبەت جەنگاوەرانەوە راستیەکی هەستپێکراوە بەڵام بەنسبەت هاوڵاتیانەوە "واتە هاوڵاتیانی ئەمریکی - ئەوانەی لەسەر ماڵو حاڵی خۆیان دانیشتوون - وەرگێڕ" ئەم حاڵەتە نمایشی پێکهێنەرە ناوەکیەکانی رەمزە مەزنەکان دەکات وەك ئازایەتیو شانازیو یەکێتی. ئەو سەرتاپاگیریەی کەپێکهێنەری رەمزو سرووتە، دەبێتە هۆی ئەوەی لەتوانادا نەبێت پیرۆزیو گەندەڵی لەسیاسەت جیابکرێتەوە.

### بزوتنەوەکانی ژیاندنەوە:

Revitalization movements:

لەکاتێك دا کەنەتەوەکان بەهۆی فشاری دەسەڵاتە دەرەکیەکانەوە شکست دەخۆن یان لاواز دەبن یان ئەو کاتەی لە سروشتی ئەو بارودۆخە تێناگەن کەتیایدا ئەژین ئاین جێی رەفتاری سیاسی راستەوخۆ دەگرێتەوە. بەتایبەت لەم بارودۆخانەدا بزوتنەوەی ژیاندنەوە بەئاشکرا دەرئەکەوێت وەك "توانستێکی هۆشیاری بەرنامە رێژکراو کەلەلایەن بەشێك لەبەشەکانی کۆمەڵگەوە بەرێوە دەبرێ، ئەمەش بۆخۆی لەپێناو کۆمەڵگەیەکی ئاسوودەو خۆشگوزەراندایە "wallace 1985". ئەم جۆرە بزوتنەوانە تەمسیلی وەلام دانەوەی چاوەروانکراوی بەرفراوانبوونی رۆژئاوا دەکەن. کە بۆ خۆی ئەوە چاوەڕوان کراوە کەجۆرە پەیوەندیەك دروست بێت لەنێوان شارستانیەتو کەلتورە جیاجیاکان دا گەر لەهەر ئاستێکی جیاوازی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاشدا بن یان

لەهەر ئاستێکی جیاوازی بەکارهێنانی دەسەڵاتدا بن.

مەسیحیەت لەسەرەتاوە لەباروددۆخێك دا دەرکەوت کەسەرتاسەری زەمین لەلایەن رۆمەکانەوە داگیرکرابوو هەروەها خۆی بۆخۆی خاوەنی سەرجەم رەگەزەکانی بزووتنەوەیەکی ژیاندنەوە بووە.

چەند جۆرێك لەبزووتنەوەی ژیاندنەوە هەیە بۆ نمونە بزووتنەوەی هەزارەیی "واتە سەردەمایەتی*" و ئەم بزووتنەوەیە تامەزرۆی گواستنەوەی تێرامانییە.. کەتایبەتە بەخاڵی سەرەتایی روئیاوە - وەرگێڕ" لەکۆمەڵگەدا بەهۆی هێزەکانی سەروو سرووشتەوە، وەك سەمای خێوەکان "Ghost dance" ئەم سەمایە زیاتر لەنێو خێڵە رەسەنەکان دا "Plains" لەچارەکی کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم دا بڵاوبۆوەو هەروەها لەژێر سایەی پەروەردەو زانیارییەکانی "Wovoka"دا دامەزرا کە بۆ خۆی کەسێك بوو لەهەرێمی "نیڤادا"دا ئەژیاو پێشبینی ئەوەی کرد کەرەگەزی سپی پێستو هندیەکان لەکوورەی مەنجەنیقێك دا لەناوئەبرێن. بەڵام تەنها ئەو هندیانەی هەڵئەسن بەنمایشکردنی سەمای (خێو) ژیانێکی شەریفانە بەسەر دەبەنو دەبنە میراتگری ئەو جیهانەی کە "گاکان": تیایدا دەگەڕێنەوە بۆ دەشتاییو خەڵکانیش لەکۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و دامەزراوداو لەژێر سایەی خوو و نەریتە هندیەکاندا بەخۆشیو کامەرانی ئەژین "MOONEY".

ئەم ئاینە زۆر مەرگەساتانە کۆتایی پێهات لەو کاتەوەی کە بە سەدەها کەس لەبەندکراوەکانی سیۆکس "Sioux" بۆئەوەی نمایشی سەمای (خێو)ی خۆیان بکەن لەبەندیخانەکان هەڵهاتن بەڵام لەلایەن سوپای ئەمریکییەوە لە "Woanded knee" کە لەباشوری "دۆکۆتایە" گەمارۆدرانو گولەباران کران.

لەبزووتنەوە وێکچووەکانی مەسیحیەتیشدا مەسیحێك خۆی بۆ خۆی ئەم گواستنەوەیە لەکۆمەڵگەدا ئەهێنێتە دی. لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا کەسێك لە هندی (سینیکی) بەناوی هاندسەم لەیکەوە "Handsam lake" وەدەرکەوت، کەخاوەنی زنجیرەیەك ژیاندنەوە بووە، وە بۆ خۆی ڕێخۆشکەری بیروباوەڕێکی نوێبووە کەپێکهاتبوو لەکۆکراوەی چەند رەگەزێکی ئاینی مەسیحیو خوو و نەریتە هندیەکان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئاینە بۆ خۆی گەردوونگەرایی باروددۆخی داگیرکردنو چەوساندنەوەی ئەوکاتەی هندیەکان بووە "واتە خۆیان وەك بەرهەڵستکارو نارەزایەك دەبینیەوە - وەرگێڕ" - وە بەهۆی ڕێپێنەدانی توندی خواردنەوەی شەرابو سووربوونو پارێزگاریکردن لەخێزان، ئەم ئاینە نوێیە توانی هندیەکانی سینیکاو خێڵە هاوپەیمانەکانی "Erikos" کە لە وێرانبوونێکی شارستانیدا بوون بژێنێتەوە.

ئەوڕۆکە ئاینەکەی هاندسەم لەیك "Handsam Lake" لەنێو "ئەیریکۆسەکان"دا زۆر بەهێزەو ماوتەوەو دامەزرێنەرەکەشی بەنسبەت ئەوانەوە وەك پێغەمبەرێکی مەزن وازەن دەکرێت. "Wallace"

لەسیستمی نەتەوایەتیشدا ئەو ویستو ئارەزووە بریتییە لەرزگارکردن "یان پاکژبونەوەی کۆمەڵگە لەرەگەزە خراپو ناچیزەکان. وە ویستو ئارەزووش لەبزووتنەوەی ژیاندنەوەش دا "Revivalism" پێکهاتووە لەدووبارە دامەزراندنەوەی چەرخی بەسەرچووی خۆشگوزەرانیو ئاسودەگی. زۆربەی ئەو بزوتنەوانەی کەپێکهاتەی چەند جۆرێکن بریتین لە "ژیاندنەوە - نەتەوە پەرستی Revivalism

"nativizm and". هەر لەدوایی بنبڕکردنی ڕەگەزی سپی پێستەکانو کاریگەری خراپیان لەسەر کۆمەڵگە "شێتی ڤالیلا" وەك بزووتنەوەیەك لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا لەکینیای تازەدا بڵاوبۆوە، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە زیاتر مەیلی ژیاندنەوەو Revivalizm و نەتەوەپەرستی nativizim ی هەبوو ئەو کەسانەی باوەڕیان بەم ئایینە هەبوو ڕوحیانە دووبارە دەگەڕانەوە بۆ چەرخی زێڕینو لەگەڵ باوپیرانیان دا ئەژیان "واتە لەتەك وەچە مردووەکانی پێشوودا ئەژیان – وەرگێڕ"wallace".

"شێتی ڤالیلا" لەخێڵێکی ئاینی – بازرگانی پێکهاتووە. واتە جۆرێکن لەجۆرەکانی بزوتنەوەی ژیاندنەوە کە لەڕێگەی سیحرەوە هەوڵئەدەن بچنە نێو بازرگانی شتومەکە ڕۆژئاوایەکانەوە لەکاتێك دا داگیرکەرانو کۆڵۆنیالیزم بەهۆی توانستە پیشەسازی‌یەکانیانەوە توانیان بەئەندازەیەکی بەرفراوان شتومەكو کاڵا پیشەسازی‌یەکانی خۆیان وەك ئۆتۆمبیلو ڕادیۆو خواردنی قوتوو.. هتد لەگەڵ خۆیان دابهێنن. بۆ تەفسیرکردنی ئەو شتومەکە سەیرو سەمەرانە ناچار دانیشتوانی ڕەسەنی ئەو هەرێمانە هەوڵیان دا بگەڕێنەوە بۆ چەمکە ڕۆشنبیری‌یەکانی خۆیان. لەبەرئەوەی ئەم میللەتانە ڕاستەوخۆ بەچاوی خۆیان سپی پێستەکانیان نەبینیبوو ئەم شتومەکانە دروستبکەن بەڵام بەهۆی پاپۆڕو فڕۆکە بارهەڵگرەکانەوە دەگەشتە دەستیان بۆیە ئەمە بووە هۆی ئەوەی تەسەوری ئەوەبکەن کەبیانی‌یەکان "یان سپی پێستەکان" خاوەنی توانستێکی سیحرین، لەوانەشە بەهۆی نهێنی ئەو چەند ووشە سەیرەوە بێت کەلەسەر پارچە کاغەزی سەرشتومەکەکان دەنووسرا، یان لەوانەیە ئەو وێنانە بەهۆی سرووتی کەسایەتی سپی پێستەکانەوە دروست بووبێت، بۆ نمونە لەکاتێك دا کە سپی پێستەکان لەمارشێکی سەربازی‌دا هەڵەسن بە ڕێپێوانێکی سەربازی‌و چەکەکانیان بەدەستەوە دەگرن یان لەکاتێك دا کە بە جلوبەرگی ڕەسمی‌و بەبوینباخەوە بەکۆمەڵ لەسەر مێزی نان خواردن دائەنیشن، کەواتە ئەمانەن ئەو شتومەکانە ئەهێنن.

یان لەوانەیە ئەو فڕۆکەخانەیەی دەرەوەی جەنگەڵو یان ئەو نموونەیەی کەوێکچووی فڕۆکەیەکی ڕاستیە توانای لەئاسمانەوە ڕاکێشانی ئەو شتومەکانەی هەیە، یان لەوانەیە هەر لەسەرەتاوە ئەو شتومەکانە لەلایەن باوباپیرانەوە دروستکرابن، بەڵام سپی پێستەکان بەتەواوەتی توانیان کۆنترۆڵی ئەو هاوکێشە سحریە بکەن کەتوانای لەئاسمانەوە ڕاکێشانی هەموو ئەو شتومەکانەی هەیە، ئەمە بۆ خۆی مانایەکی بەرفراوان ئەبەخشێت بەسەرجەم ئەو وازەن‌و ئەگەرە جۆراوجۆرانەی کە خەڵکانی ئەو ناوچەیەی سەرقاڵکردووەو بۆچوونەکانیانی بەرجەستە کردووە، هەروەها بەشێوەیەکی دیارینەکراو و بەرفراوان لەهەوڵێکی نامۆدان بۆ گەیشتن بەتێگەیشتن‌و تەفسیرکردنی ئەو بارودۆخو دیاردە جۆراوجۆرو ناچیزانە. بەداخەوە هەندێ جار ئەو خێڵە ئاینیە بازرگانیانە بەشێوەیەکی ناخۆش کۆتاییان پێدێت‌و چارەنووسیان نادیار ئەبێت.

لەساڵی "1946" دا لەکینیای تازە، دانیشتوانی ڕەسەنی ئەو هەرێمە بەشێوەیەك لەشێوەکان واتە بەشێوازێکی دیکە بەرپەرچی داگیرکەرانیان دایەوە ئەویش بەهۆی سەربڕینی بەرازەکانیانەوە بوو کەتاکە سەرچاوەی ژیانیان بوو، بەبڕوای خۆیان لەهەزارەدا ". واتە لەکۆتایی هەزار ساڵەی ڕۆژمێری خۆیان دا" بەرازە

گــــەورەكان لەئاسمانـــــەوە دەرئەكـــــەون "بەوێناندنـەكانى ئـەوان ئەمـەش بـەهۆى نمونـە ڕاديۆييەكانـەوە "لاسـلكيەكانەوە" ڕووئـەدات " كەجار جار دەنگيان لێوە دێت" ئـەم ئامێرانـەش بـەدار حـەيزەرانو هەوائيەكانـەوە بەسـتراون" "worsley".

نزيـك لەبۆچوونــەكانى (ئـەنتۆنى. ف. س. والاس" wallace" وە ئەبينين كە لەگەڵ ئـەوەش دا زۆربــــەى بزووتنــــەوەكان بــــەناچارى دەوروجەرەيانى خۆيان تەواو ناكەن بەڵام بەچەند قۆناغێكدا تێئەپەڕن. قۆنـاغى يەكـەم پێكهاتووە لـەقۆناغى پێش بزاڤ لـەم قۆناغـەدا كۆمەڵگـە لــەباردۆخێكى ســــەقامگيرو دوور لەفشـــارە بـەهێزەكان بـۆ ئـەنجامدانى گۆڕانێكـى ڕەگــو ڕيشـەيى (راديكـاڵى). هێدى هێـدى سـەرەنجام بەهۆى داگـيركردنى بيـانىو برسـێتىو قـاتوقڕىو فشارە ڕۆشنبيريەكانەوە يان بـەهۆى هەرشـتێكى تـرەوە فشـارە دەرونيـەكان لەسـەر تاكـە كـەس دروست ئەبێت، لەكاتێكدا شيرازەى شارستانيەت بەشـێوەيەكى بـەرفراوان تێكئـەچێتو ڕێـژەى تـــاوانو ئـــالوودەبووانى "كـــهول" و مـــادە سـڕكەرەكان زيـاد دەكـات سـەرەنجام ئەمانـە هەمووى دەبنە هـۆى دروسـتكردنى بـارودۆخێكى ئاسايىو سادەو دواتر سەرۆكەكان لـەناودەبرێنو دەسـتيان بەسـەردا دەگـيرێت. دواتـر بـەهۆى واڵاكردنى جفرەيەكى تازەوە بۆ ژيان لەگەڵ بونى پەيامبەرێك دا .. "وەك جۆرێك لەخـەياڵ" دەبنـە هۆى سەرهەڵدانى بزووتنەوەيـەكى نـوێ. دواجار ئـەم پەيامـە بـەنێو ئـەو موريـدو ياوەرانـەدا بڵاودەبێتــەوە كــەكارى بڵاوكردنــەوەى ئــەم پەيامەيان گرتۆتە ئەستۆ بۆ بڵاوكردنەوەى لـەنێو پێكهاتـە كۆمەڵايەتيـەكانى تـردا. لەهـەمان كـاتدا بەناچارى سەرهەڵدانى ڕێكخستنو بـەڕێكخراوبون دەبێتە جێى بايەخو گرنگى پێدان.

پێويستە لەسەر بيروباوەڕى نوێ ئـەو پانتايـە برەخسێنێت كـەتيايدا سـەرهەڵئەدا، وەئەمـــەش يــان بــەهۆى شـــەڕكردنو شكســت پێــهێنانى تـەماعكارانى بيانيــەوە ڕووئـەدات يـان بـەهۆى داڕشتنەوەو چاكسـازىكردنى ئـاينزا "مذهـب" ئەسڵيەكەوە دروسـت ئـەبێت بۆ هێوركردنـەوەى گومانو دژايەتيكردنەكان. لەكاتێك دا كە زۆربـەى يان هەموو ميللەت ئـەم فيكرەيـە قبوولٚ دەكـەن دەبێتـە هـۆى ڕوودانـى گۆڕانكـارىو ئـاڵوگۆڕبونى شارستانىو ئەويش بەهۆى كۆمەڵگەوە دەخرێتـە نێـو هاوئاهەنگيـەكى زياترەوە واتـە زيـاتر لـەو بنەمايانـەى كـە ڕێخۆشـكەرى ئـەو بزوتنەوەيـە بـوون. دواجـار لـەقۆناغى پـاش بزاڤـدا ئـەو بزووتنەوەيـە وەك ئـاينێك يــان وەك حزبێكـى سياسى لەناو خەڵكدا ئاسايىو گشتگير ئەبێتەوە. "واتـە بـارودۆخێكى ئـارام دروسـت ئـەكات – وەرگێڕ".

بەشــێوەيەكى ســـەرەكى بزووتنـــەوەكانى ژياندنـەوە هـەوڵدانێكن "كـەزۆرجار هـەوڵدانێكى سـەركەوتوونين" بۆ پەيوەستبون بـەو مـەرجو بارودۆخــە تازانـــەوە، بـــەدەر لەڕووخســـارە ئاينيەكانى ئەم بزوتنەوانە بەشێوەيەكى بنەڕەتى ئەم بزوتنەوانە سياسين .

ئـەتوانين ســەرنجى ڕوئيــاى پێغەمبەرايـەتى بدەين كە بە درێژايى مێژوو وەك خاڵێكى پانتـاى ئـامێز لـەنێو مێـژووى شارسـتانيەت دا بۆخـۆى لەيەك كـاتدا لـەتوانايدا بووە هۆكارە دەرەكـىو ناوەكيــەكان، ڕابــردوو ئــايندە، خوونــەريتو گۆڕانكارىيە ناچارەكان بەيەكەوە كۆبكاتەوە.

بەهـەمان شێوەش لـەدوو سـەدەى پێشـوودا ئـەم بزووتنەوانـە هاوئاهـەنگ لەتـەك داگيركردنو كۆنترۆڵٚ كدرنى هێزە ڕۆژئاواييەكان دا دەركـەوتن. بـەهۆى ئەمـەوە ئـەتوانين ئـەم بزووتنەوانـە وەك بەرپـەرچ دانـەوەو پرۆتسـتۆيەكى سياسى، يــان

وەك هاواری ئازارو نەهامەتی یان وەك تاوانبارکردن لەنەبوونی مەعریفەدا، یان وەك ڕێکخراوێك یان وەك دەسەڵاتێکی نەیار بەخودی داگیرکەران و چەك و وشەکانیان سەیربکەین.

ڤیتۆریۆ لانتێرناری "Vitorio Lanterinari" شاهدی ئەو وتە ئەفریقیەیە کە دەڵێ: لەسەرەتادا ئێمە خاوەنی زەوی بووین و ئێوەش خاوەنی کتێبی پیرۆزی خۆتان بوون بەڵام ئێستاکە ئێمە خاوەنی کتێبی پیرۆزین و ئێوەش خاوەنی زەوین" بەتەواوەتی لەولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زۆربەی بزووتنەوەکانی ژیاندنەوە بە"Handsam lake" و ئایینی "پێوت" یشەوە زۆر شتیان لەبزووتنەوەی ڕۆشنکەرانەوە "الحركات التبشيريه" وەرگرتووە. واتە بەهۆی بەکارهێنانی ڕوئیاگەرایی خاڵی سەرەتایی مەلحەمیەوە - کە لەمەسیحیەتیەکی توندڕەوەوە وەرگیراوە – کەدژی داگیرکەرانی خانووبەرەو زەویوزار و سەربەخۆیی و شارستانیەتی خۆیان بووە. لەکاتێك دا ئەگەر ئاینێك پەیڕەو بکرێت دەبێتە خاڵێکی بەرەنگاربوونەوەی بەهێز دژی سیستەمە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا. بۆ نمونە لەشەستەکانی ئەم سەدەیەدا خێڵی African – Amrican christian بەهۆی تێکۆشانی خۆیانەوە بۆ دەستەبەرکردنی مافە مەدەنیەکانی خۆیان سەرکەوتنیان بەدەستهێناو سەرۆکایەتیان گرتەدەست - هەروەها دەرکەوتنی ڕێکخراوە مەدەنییەکانیش وەك ڕێکخراوە بازرگانیەکان و پەرلەمانە جەماوەرییەکان توانیان بزووتنەوە ئاینیەکان بکەنە سیاسەتێکی بێبایەخ.

بزووتنەوە ژیاندنەوەییەکان تەنها لەنێو کۆمەڵگە خێڵەکیەکاندا سەرهەڵنادەن، بەڵکە کۆمەڵگە پیشەسازیە پێشکەوتووەکانیش بە نیسبەت تاکە کەس و زۆرینەی کۆمەڵ و کۆمەڵگەوە لەدڵەڕاوکیو شڵەژانێکی تەواوەتیدان هەروەها ئەم کۆمەڵگایانەش وێڵن بەدوای گۆڕانکاریەکی ئاینیدا. وەك چۆن جۆن هۆڵت" مەرگەساتی پەرستگای گەل "Peoples Temple" لێکدەداتەوە کەتیایدا "900" کەس لەکوتلەیەکی ئۆرکیستڕالی خوێناویدا لەساڵی "1978"دا لە"Guyana" خۆیان کوشت، کەئەمانەش هەوادارانی بزووتنەوەیەکی ژیاندنەوە بوون و بزووتنەوەکەیان گەشتە ساڵی هەزارەیی خۆی.

سەرچاوە:

TED .S. LEWELLEN
Political anthropology
An introduction. –1993- London.
Religion in politics

پەراوێز:

* بزووتنەوەی ژیاندنەوە: Revitalization movements" یا- بزووتنەوەکانی ژیاندنەوە: بزووتنەوەیەکی ئایینی تەقلیدی کۆمەڵگە سەرەتایەکانە، ئەم بزووتنەوانە برێك لەئەفسانەو خورافەو میتافیزیکا دەوری داون بەئەندازەیەك سەرجەم پانتاییە کۆمەڵایەتیەکان داگیردەکەن و دواجار بەهۆی سرووت و سەما ئاینی و ڕۆحییەکانەوە پەیوەست ئەبنەوە بەهێزەکانی سەرووسرووشتەوە - لەم بزووتنەوانەدا پاڵەوانی ئەفسانەیی دەبێتە ئەو هێزە ڕوحیەی کە ڕابردوو و ئێستا بەیەکەوە گرێ دەدات.

# دەوڵەت

♦ جۆرج تەرابیشی
● لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



ئەرستۆ تالیس

کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکان بەدرێژایی مێژوو شێوازی جۆراوجۆری دەسەڵاتیان بەخۆوە بینیووە، هەر لەدەسەڵاتی دیستپۆتیزمی رەهاوە تا دەگاتە حوکمی دیموکراسی. بەڵام دەسەڵاتی سیاسی، یان بەواتایەکی دی دەوڵەت هەرگیز وەکی دیاردەیەکی سروشتی نەهاتۆتە پێش چاوو، لەخۆڕاو بێ هیچ مەرجێك پەسەند نەکراوە. بەڵکو بەردەوام پێویستی بەپاساو هێنانەوە، یاخود بەسەلماندنی رەوایەتی خۆی هەبووە. فیکری سیاسیش بەمەبەستی پاساو هێنانەوە بۆ دەوڵەت سێ رێگای گرتۆتەبەر. لەدەورانی یەکەمدا فیکری سیاسی بەتایبەت لەزمانی ئەفلاتۆنو ئەرستۆوە باس لەوە دەکات کە مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتیە، بەو مانایەی مرۆڤ

ناتوانێت ژیان بگوزەرێنێو گەشە بکاتو زۆر بێت تەنها لەچوارچێوەی کۆمەڵدا نەبێت. بەم پێیە کۆمەڵگە بەردەوامی نابێت، گەر دەسەڵاتێك نەبێت یەکگرتووی بپارێزێتو مانەوەی مسۆگەر بکات.

کەواتە ئەوەی پاساو بۆ دەسەڵاتی سیاسی دێنێتەوە سروشتی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤە، بەمجۆرە دەکرێت بڵێین بناغەی ئەو دەسەڵاتە سروشتییە. لەدووەم قۆناغداو، لەسەردەمانی سەدەکانی ناوەڕاستدا کە دیدگای ئاینی باڵادەست بوو، فیکری تیۆلۆژی خەسڵەتێکی یەزدانی دابووە پاڵ دەسەڵات. بەو پێیەش سوڵتان بوو بووە سێبەری یەزدان لەسەر زەوی، واتا مەشروعیەتی دەسەڵات دەکەوێتە دەرەوەی مرۆڤ خۆیو لەسەرو ئیرادەی ئەودایە. تەنانەت گەر دەسەڵاتیش بەپێی حیکمەتە یۆنانیەکە بگەڕێتەوە بۆ سروشتی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ، ئەوا یەزدان بۆ خۆی سروشتی مرۆڤی وەکی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی خولقاندووە. کەواتە یەزدان لەجەوهەری دەسەڵاتدایە، هەروەك چۆن لەجەوهەری کۆمەڵو سروشتیش دایە. لەگەڵ سەرەتاکانی نوێگەری لەسەدەی شازدەدا فیکری سیاسیو فەلسەفی نوێ بنەمایەکی مرۆڤایەتی پەتیان بەخشی بەدەسەلات. بەم پێیە دەسەڵاتی سیاسی یاخود دەوڵەت لەسەر بناغەی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی دادەمەزرێت، واتە لەسەر لێککەیشتنو ڕەزامەندی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە دێتە ئارا کە لەناو خۆیاندا دەسەڵاتێك پێکدێنن، بەو مەبەستەی ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی ئەو گرووپە بگرێتە ئەستۆ. کەواتە بوونی دەوڵەت بەندە بەخواستی هاوبەشی ئەو کۆمەڵە کەسانەوە کە بە ویستو ئیرادەی خۆیان بوونەتە هاوڵاتی، نەوەك بەندبێت بە ویستێکی یەزدانییەوە یان بە حەتمیەتێکی سروشتی یاخود کۆمەڵایەتیەوە.

تیۆریای پەیمانی کۆمەڵایەتی کە بناغەیەکی ئینسانی بۆ دەسەڵاتی سیاسی دادەڕێژێت، ئەو دەزگایە ملکەچی ڕەخنە دەکاتو دەیخاتە ژێر ڕەخنەوە. بە فیعلیش لەم قۆناغەداو بۆیەکەمین جار لەمێژووی فیکری سیاسیو فەلسەفیدا دەوڵەت دەخرێتە ژێر ڕەخنەوە، بەتایبەت مەبدەئی دەوڵەت. پێشتر ڕەخنە بەتەنها قەرەی شێوازە حوکمڕانیە دیسپۆتزمیو ستەمکارو نامەشروعەکان دەکەوت. بەڵام لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزەدا هەندێ ئاقاری فیکری وەها هاتنە ئارا کە گومانیان لەمەشروعیەتی دەوڵەت خۆیو لەپێداویستی بوونی دەکرد. گومانێکی لەم چەشنە لەسەدەی نۆزدەداو لەگەڵ پەرەسەندنی ئاقارە فەرد خوازەکانی لیبرالیەت لەلایەکو، ئاقارە گروپ خوازە ئانارکیو کۆمۆنیستیەکاندا لەلایەکی ترەوە گەیشتە تروپك.

فیکری لیبرالی لەسەرەتاوەو بەر لەهەرشتێ سەرگەرمی ئەوە بوو سنورێك بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت دابنێت، بەو پێیەی ئەم دەسەڵاتە شەڕێکە و بەناچاریش دەبێت مامەڵەی لەتەکدا بکرێت. نیکۆلۆ مەکیافیلی (1469-1527) یەکەمین کەسێك بوو کە تیۆریای سیاسی بەجۆرێك دارشت وەك ئەوەی شەڕێك بێت. لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوا ناگاتە کورسی دەسەڵاتو ناشتوانێت پارێزگاری لەمانەوەی بکات تەنها ئەو کاتە نەبێت کە ئامادەیی تێدا بێت خراپەکاری بکات.

بەبڕوای ئەو زەبروزەنگو فرتو فێڵ، تەنانەت تاوانیش پێویستن بۆ حوکمڕانی کردنی مرۆڤ.

هاوکات تۆماس هۆزبیش (1588-1679) هەمان ڕاوبۆچوونی هەبوو، بەلای ئەوەوە

دەسەڵات خراپەیەکی بچووکە بۆ ڕێگەگرتن لەخراپەکاریەکی گەورەتر. چونکە بەبێ بوونی دەسەڵات مرۆڤەکان دەکەونە کوشتوبڕی یەکتریو، ڕەنگە بەمەش مرۆڤایەتی دووچاری فەوتانو لەناوچوون بێتەوە، لەشەڕی هەمووان دژ بە هەمووان‌دا.

بۆ خۆبەدوورگرتن لەشەڕێکی وا پێویستە مرۆڤەکان دستبەرداری مافو دەسەڵاتەکانی خۆیان بن بۆ دەسەڵاتێکی بالاتر لەسەروی خۆیانەوە، بەپێویست ئەم دەسەڵاتەش دەسەڵاتێکی ڕەها دەبێت. گەر خراپەکاریو شەڕانگێزی مرۆڤ نەبوایە ئەوا پێویستیان بەخراپەی دەوڵەت نەدەبوو.

بەڵام، ئاخۆ ڕەهاکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت نابێتە مایەی هەڕەشەیەك بۆ گۆڕینی خراپەی سیاسی لەخراپەیەکی بچووکەوە بۆ خراپەیەکی گەورەتر؟

ئاقاری لیبرالیزم کە لەگەڵ جۆن لوك‌دا (1632–1704) هاتە ئارا، بایەخی بەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا. لەگەڵ سەدەی حەڤدەهەمدا ڕەخنەگرتن لەدەسەڵاتی سیاسی بووە بابەتی یەکەمی فیکری سیاسی.. دەوڵەت بەفیعلیو وەکی ئەوەی تۆماس هۆبز وەسفی کردبوو (ئەژدیها)یە، بەڵام ئەم (ئەژدیها)یە کارێکی دیکەی نییە جگە لەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی بسڕێتەوە گەر ڕێی پێ دراو دەسکراوە بوو لێرەوە ئەرکی سەرەکی دەبێتە سنووردارکردنی ئەم دەسەڵاتەو ڕێ پێگرتنی ئەو ئەژدیهایە لەڕێی جیاکردنەوەی هەر یەك لەدەسەڵاتی یاسادانانو جێبەجێکردنەوە.

نابێت هەردوو دەسەڵاتی یاسادانانو جێبەجێکردن لەدەستی یەك کەس‌دابن، ئەگەرنا ئەوا ئەو دەستە دەبێتە مستێکی ئاسنینی


مۆنتسکیۆ

ستەمکار. دوای جۆن لوك مۆنتسکیۆ بەردەوام دەبێت لە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی پێویستە دەسەڵاتەکان لێکتری جیابکرێنەوە. چونکە سروشتی دەسەڵات وەهایە کە داوای دەسەڵاتی زیاترو زۆرتر دەکاتو هەوڵدەدات تا بەلای خراپەکاری‌دا لابدات (گەر هاتوو سنوردار نەکراو دەرفەتی پێ درا).

بۆیە پێویستە بەدەسەڵات ڕێ بە دەسەڵات بگیرێت. کاتێك مۆنتسکیۆ دەسەڵاتەکانی یاساییو جێبەجێکردنو قەزائی لەیەکتر جیادەکاتەوە، لەو باوەڕەدایە کە بەم پرۆسەیەو بەلێك جیاکردنەوەی ئەو دەسەڵاتانە لەیەکتر لەباری دایە یەك ئەوی دی لەجێی خۆی رابگرێت، بەجۆرێك کە دوچاری لادان نەبێتو هاوسەنگی خۆی بپارێزێت.

ئەمەش بەپێچەوانەی حکومەتی ئیستبدایەوەیە، کە بە پێویست ڕێگای توندڕەویو زوڵمو ستەم دەگرێتەبەر، مادامەکی

تـەواوی دەسـەڵاتەکان لەدەسـتی خـۆیدانو لەبەرامبەریشدا پابەندی هیچ یاسایەکیش نابێت، لەبەر ئـەوەی خـودی یاسـا خۆیشـی ملکـەچی ئیرادەی ئەوە.

گـەر فیکـری لیـبرالی لەئاسـت بیرۆکـەی کەمکردنـەوەی دەسـەڵاتی دەوڵـەتدا وەسـتابێو بەدیسپلین کـردنو سنووردارکردنیەوە ئیکتیفای کردبێت، ئـەوا فیکری سۆسـیالیزمیو ئـەنارکی لەسـەدەی نۆزدەدا زیاتر پـێی لێ هـەڵدەبڕن تا ئەوەی داوای سڕینەوەی دەوڵەت دەکەن.

ئەگـەرچی سـان سـیمۆن (1760–1825) دامەزرێنەری ئایدیۆلۆژیای سوسـیالیزم باسـی لە پرانسیپی زەرورەتـی دەوڵـەت نـەکردووە، بـەڵام پـێی وابوو ئـەو بنەمایەی پێویسـتە دەوڵـەتی لەسـەر دابمـەزرێت نەسیاسـەتەو نەدەسـەڵات، بـەڵکو زانسـتو پیشەسـازیو بەرهـەم هێنانـە. دەوڵەت بـەو هـەزارەها فەرمانبەرانەیەوە بارێکە بەسەرشانی کۆمەڵگەوەو، دەسەڵاتیش دەبێـت بکەوێتە دەستی ئەوانەی بەرهەم هێنن، بەتایبەت ئەوانـەی لـەبواری پیشەسـازیدا کاردەکـەن، نەوەکی بدرێتە بیرۆکراسیەکان.

نـابێت ئامـانجی دەوڵـەت حوکمکـردن بێـت، بەڵکو رێکخستنی بەرهەم هێنـان بێت، دەوڵـەتی سیاسی بۆ خۆی نەیاری ئازادیە، بۆیە پێویستە وەلاوە بـنرێت بـۆ ئـەوەی دەوڵـەتی بەرهـەم هێنـەران، واتـە کارمـەندانی بـواری پیشەسـازیو زانایانو هونەرمەندان جێگای بگرنەوە. هـەر لـەم رێیەشـەوە دەتوانین پەیوەندیەکانی هـێز لـەنێو کۆمەڵدا بسڕینەوەو، دەستبەرداری ئامرازەکـانی توندوتیـژیو زەبروزەنـگ بـین کـە لـە سـوپاو پۆلیسدا خۆیان دەنوێننو، جێگـەی دەوڵـەتی سیاسەت بەدەوڵەتی زانست بگرینەوە، دەوڵەتێك کە تەنها لە باری ئەودایە ئازادی بۆ فـەردەکانو ئاشتی بۆ نەتەوەکان مسۆگەر بکات.

ئـەم تێڕوانینـە سـلبیە بـۆ سیاسـەت لای مـارکس (1818–1883) قوڵتر دەبێتـەوە، تـا ئاستی رەتکردنەوەی پرانسـیپی خـودی دەوڵـەت خۆی. هەر لە (نووسینەکانی مارکسی گـەنج)ەوە تیۆر یا رەخنەییەکانی مـارکس تایبـەت بـوون بـە دەوڵەتو سیاسـەتو داواکاریـەکی فەلسـەفیش بەسڕینەوەو لەناوبردنیان.

لـەقۆناغی دواتـردا، قۆنـاغێك کـەزیاتر خەسڵەتێکی زانستیو عەمەلی هـەبوو، مـارکس پـەیڕەوی ئیشـکالیەتێکی تـازەتری کـرد، ئـەم ئیشکالیەتە تازەیەش بریتی بوو لە گرتنەدەستی دەسـەڵات لەلایـەن پرۆلیتاریاوە، تا چینـەکانو ململانێی چینایەتی نەهێڵێتو، دواجـار مانـەوەی دەوڵەت خۆیشی شتێکی پێویست نەبێت.؟

لەبـەر ئـەوەی سـەرچاوەی دەوڵـەت لـەو دابەشـکردنە کۆمەڵایەتیـەی کاردایـە، بـەواتای لەدابەشبوونی کۆمەڵگەدایە بەسەر چینە نـاکۆكو بەشـەڕهاتووەکاندا. دەوڵەتیش بە بـەردەوامی دەوڵـەتی ئـەو چینـە بـووە کـە لـە ڕووی ئابووریەوە باڵادەست بووە. شۆڕشی پرۆلیتاریا کـاتێك هەڵدەسـتێت بـە لـەناوبردنی دابەشـکردنی کـار، ئـەو دەزگـا سیاسـیەش کـە دەوڵەتـە دەسڕێتەوە. شوعیەت تەنـها کۆمەڵگەیـەکی بـێ چینایەتی بونیاد نانێت، بـەڵکو هاوکات دەبێتـە مایەی ئـەوەی پایانی سیاسەتیش رابگەیەنێت. کۆمەڵگـەی شـوعی ئـەو کۆمەڵگەیـە کـە تیـایدا ئیـدارەی شـتەکان جێگـای حوکمـی مـرۆڤ دەگرنەوە. یاخود بە بۆچوونی ئـەنگلز (1820–1895) هاوڕێو سێبەری مـارکس پێکـەوە، ئـەوا (چارەنووسـی دەوڵـەت بـۆ نـاو مۆزەخانـەی مێژووە). بەڵام موفارەقەی مێژوو وەهـا بـوو ئـەو

دەوڵەتەی بەڵێنی سڕینەوەو لەناوبردنی دەوڵەتی دابوو، بووە بەدترین شێوەیەك لەشێوەكانی دەوڵەت كە مێژوو بەخۆیەوە ببینێ. بەڵێنی شوعیەت بە سڕینەوەی دەوڵەت، دەوڵەتێكی یۆنقز سالیو تۆتالیتاری لێكەوتەوە، كە گەر بێتو لەگەڵ ئەو وێنەی (ئەژدیها)یەی هۆبزیشدا بەراوربكرێت هێشتا هەر كەمە.. ڕەخنەكردنی ئەزموونی سۆڤیەتی ڕۆڵی هەبوو لەسەر لەنوێ بوژاندنەوەی فیكری لیبرالی لەسەدەی بیستەمدا. لیبرالیەتی ئەمڕۆ، یاخود ڕوونتر بڵێین نیو-لیبرالیزم بریتییە لە فیكرێك ڕەخنە ئاراستەی دەوڵەت دەكات. لەبەر ئەوەی ڕەخنەی سوسیالیزمی یان ئەنارکی لەدەوڵەت پاشەكشەی كرد یاخود خەریكە بەرەو نەمان بچێت، ئەوا لەبەرامبەردا ڕەخنەی لیبرالی هاوچەرخ بەگورو تینێكی وەهاوە هاتۆتە ئاراوە كە پێشتر لەئارەدا نەبووە، بەتایبەتیش لەوڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا.

لەواقیعدا ڕەخنەگرتن لەدەوڵەت لای بیریارە ئەمریكاییەكان تەقلیدێكی زۆر كۆنەو پێشینەیەكی مێژووی هەیە. هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە تۆماس جیفرسۆن (1743-1826) كە بووە سێیەمین سەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكان، ڕایگەیاند: (باشترین حكومەت ئەوەیە كە كەمترین ماوە حوكم دەكات). پاش ئەویش ڕالف ڤالدۆ ئیمرسۆنی فەیلەسوف (1803-1882) تەئكیدی كردەوە لەسەر ئەوەی (چەندێ دەستێوەردانی دەوڵەت كەمتر بێت، ئەوەندە كاروبارەكان بەباشی بەڕێوە دەچن).

بەتایبەت هنری دیڤد تورۆ (1817-1862) قوتابی ئیمرسۆن ئەو ئیشكالیەتەی گەیاندە ئەوپەڕی كاتێك جەختی لە سەر ئەوە كرد كە: (چاكترینو باشترین حكومەت ئەوەیە كە حوكم ناكات).

هاوكات تیۆرسینی لیبرالی ئەمریكی ئەلبرت جای نوك لای خۆیەوە دوودڵ نەبوو بڵێت: (دەوڵەت دوژمنمانە) ئەمە ناونیشانی ئەو كتێبە بەناوبانگەیەتی كە لەساڵی 1928دا دەرچووە. لەمڕۆشدا دیارترین كەسانێك كە لەناو فیكری ئەمریكیدا ڕەخنە لە دەوڵەت دەگرن هەردوو ئابووری ناس جیمس بۆكاناو فردریك هایكن (هەردووكیان خاوەنی خەڵاتی نۆبڵن لەئابووریدا).

یەكەمیان ئەو دروشمەی بەرزكردۆتەوە كە دەبێت (دەوڵەت نزمترین ئاستی دەسەڵاتی هەبێت)و دووەمیشیان پێی وایە كە (ڕەگوڕیشەی خراپەكاری لەدەوڵەتدایە، ئەگەرچی دەوڵەتێكی دیموكراسیش بێت). بەبۆچوونی هایك دیموكراسیەت بەهایەكی سلبییەو پەیڕەوكردنیشی تەنها بەو مەبەستەیە تا لە هەڕەشەو مەترسیەكانی زوڵمو زۆرو ستەماكاری دوورمانخاتەوە، بۆیە هەر هەوڵێك بەمەبەستی ئەوەی ناوەڕۆكێكی ئیجابی بدرێتە پاڵ دەبێتە مایەی لەبەریەك هەڵوەشانو لەناوچوونی.

بەم پێیە دەوڵەتی دیموكراسی دەوڵەتێكی سلبییەو، تەنها ڕۆڵیشی ئەوەیە ڕێگربێت لەبەردەم هەر گروپێكی تایبەت (لەوانەی خاوەن بەرژەوەندی ئابوورین یاخود خواستو ئارەزووی سیاسیان هەیە) لەوەی خۆیان لەناو دەوڵەتدا دابمەزرێننو بڕیار بەدەست بن.

گەر بێتو فردریك هایك دروشمی كەمكردنەوەو سنوورداركردنی كەرتی گشتیو لابردنی مۆنۆپۆڵكردنی دەوڵەتی بۆ كارگوزارییە گشتیەكانی وەك: خوێندنو فێركردنو

گواستنەوەو پەیوەندی کردنو راگەیاندن بەرزکردبێتەوە، ئەوا (دیڤد فریدمان)ی کوڕی ئابووری ناسی ئەمریکی (ملتۆن فریدمان)ی خاوەن خەلاتی نۆبل، زۆر لەوە زیاتر پێی لێ هەلدەبڕێتو، بانگەشە بۆ (کۆمەلگایەکی بێ دەولەت) دەکات. هەروەها داوای ئەوەش دەکات ئەو ئەرکە سەرەکیانەشی دەولەت پێی هەلدەستێت وەکی: پۆلیسو قەزاو تەنانەت بەرگری نیشتمانیو دەرکردنی دراویش، لە دەولەت بسەندرێتەوەو هەموویان بدرێتەوە بە کەرتی تایبەتو پابەندی پرانسیپەکانی ئابووری بازاڕبن.

کەواتە لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کە خاوەنی سستێمێکی سیاسی وایە بەبەراورد لەگەل سەرجەم سستمە سیاسیەکانی جیهانی نوێدا کەمترین دەست تێروەردانی دەولەتی پێوە دیارە، تیۆریزەکردن لەمەڕ (خراپەی سیاسی- کە مەبەست لێی دەولەتە) لەتوندڕەوترین فۆرمدا دەردەکەوێت.

موفارەقەیەکی وەها ئەگەری تێگەیشتنو لێ حالی بوونی هەیە گەر لەبەر رۆشنایی ئەزموونی مێژووی ئەمریکیدا سەرنجمان دایە: لەبەر ئەوەی لەئەمریکادا دروست بوونی کۆمەلگای مەدەنی پێش دەولەت دەکەوێت، هەر ئەمەشە وایکردووە تا ساتەوەختی ئەمرۆ دەست پێشخەریەکانو جلەوی کاروبارەکان لەدەستی ئەودا بێت نەك دەولەت.

*الحياة- ژ (12747)، 1998/1/25.

# وتوویژی مۆدێرنیتی و پۆست مۆدێرنیتی

# له بواری چەمکەکاندا

♦ د. حەمید عەزدانلو

● له فارسییەوە: ئاشنا

ئـــەم وتـــاره تێگەیشـــتنێکی شەخســـییە، پوختەیەکە لە جیاوازییەکانی دوو جۆر تـێڕوانین بۆ مرۆڤ و سروشت و جیهان (واتــه مۆدێرنیتـی و پاش مۆدێرنیتی) کە لە لابەلای هەندێ لەو کتێـب و وتارانـەی کـــه نوێنەرایـەتی ئـەو دوو ڕێبـازه دەکەن، دەرهێنراوە. هەڵبەتـه دەبێ بزانـین کـه لەمێژ نییە پاش مۆدێرنیتی سەنگەری لەبەرامبـەر مۆدێرنیتـی دانـاوە، فەیلەسوفانی ئـــەو ڕێبـازه فیکرییـە تـــازەپێگرتووە، وا خـــەریکن هـــەنگاوە سـەرەتاییەکانیان هـەڵدەنێن. گـەرچی دەتوانــین نیشان و شوێنپێیەکانی بیری پاش مۆدێرنیتی لـه نووسراوەکانی کەسانی وەك نێتشه و هایدگـەر و فرۆید (ئەو بیریارانەی کـه لەلایـەنی مێژوویـەوە، سـەربه قۆنـاغی مۆدێرنـن) دا بدۆزینــەوە. بـەڵام وتوویژی ڕاشکاوانەی ئەو دوو ڕێبازە فیکرییە، کە هـەردووکیان منداڵـی یـەك لـه دوایـەکی قۆنــاغی هاوچـەرخی ڕۆژئـاوان، لـه سـەرەتاکانی سـاڵانی 1980 دا لەگــەڵ وتـــاره بەبایەخدارەکـــەی (هابرمــاس) دا دەسـتی پــێ کـرد. کـه تێدایـه شمشێری تیژی خۆی ئاراستەی لایـەنگرانی پـاش مۆدێرنیتی کرد.




## ئایدیۆلۆژییە نوێیەکان

بیروباوەڕی پشتبەستن و ئومێد بە ئەقڵانییەتی فۆرمالیست – Formalist Rationality.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستە سروشتیەکاندا، بەتایبەت کیمیاو زیندەوەرناسی، پشتبەستنی مرۆڤی رۆژئاوایی بە ئەقڵی خۆی زیادی کرد و ئومێدیشی گەشاوەتر بوو لە بارەی تێگەیشتنی لەرازو نهێنی گەردوون. ئەم پێشکەوتنانە، وای لە فەیلەسوفانی رۆژئاوایی ئەو سەردەمە نوێیە کرد کە هەوڵی بەکارهێنانی میتۆدو یاساکانی زانایانی سروشتی بدەن بۆ (توێژینەوەی) مرۆڤ و کۆمەڵگا. ئەو هەوڵەش بەرهەم و درێژە پێدانی ئەو ئاوات و ئارەزووە فکرییانە بوو کە رەگ و ریشاڵەکانی بۆ سەدەی پازدەو شازدەی ئەورووپا دەگەڕێتەوە. لەسەردەمی رێنسانس و سەرەتای چوونە نێو قۆناغی نوێوە، ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کە رۆشنگەری – Enlightement – هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدا، بۆیەکەمین جار باسکران و خرانەڕوو.

لەکایەی سروشتدا، رۆشنگەری سەرەتایەك بوو بۆ زانستە سروشتییە نوێیەکان. ئەو زانستانە لە سەدەی هەژدە و لەسەر دەستی کەسانی وەك گالیلۆو کۆپلەر رێگەی خۆیان بۆ ناو قۆناغی رۆشنگەری کردەوە.

بەپێی تیۆرەکانی ئەمان، سروشت کورت کرایەوە بۆ سیستەمێکی داخراو لە هۆ (علە) و ئاکام (معلول) ەکان. جان لاك، رەگورپشەی هەموو زانستەکانی بە بەرهەمی "ئەزموونە راستەوخۆکان" دائەنا کە لە هەستە مرۆییەکانەوە بەدەست دێن، هەروەها بەرپەرچی بڕوابوون بە فیکرەی خوودی (ذاتي) و خۆرسکی (فطري) دایەوە. بەڕای ئەو مێشکی مرۆڤ، سەرەتا لە پەڕەیەکی سپی یان تابلۆیەکی بۆش بەولاوە شتێکی دیکە نەبووە، هەروەها پێی وابوو کە جیاوازی بیروباوەڕ و مەعریفەکانی مرۆڤ بەرهەمی کاریگەری دەوروبەرن.

ئەو دەرەنجامەی کە لەتیۆرییەکەی جان لاك بەدەستهات بریتی بوو لەوەی کە هەموو مرۆڤەکان لە بنچینەدا لەگەڵ یەکتردا یەکسانن. ئەقڵ Reason کورت کرایەوە بۆ هەستی گشتی Common sense و ئیمتیازات و پایەبەرز یە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵاتی سیاسی بە ئاکامی رووداوە مێژووییەکان درانە قەڵەم.

هەموو مرۆڤەکان بەشێوەیەکی یەکسان بوونە خاوەنی توانای هەڵاواردنی راست و دروست و دیموکراسی وەکو حکومەتێکی زۆرینە، بووبە تاکە فەلسەفەیەکی سیاسی، کە لەگەڵ هەستی گشتیدا ناکۆک نەدەبوو. بڕوای رۆشنگەران بەو ئەقڵەی کە بەرهەمی ئەزموونی راستەوخۆیە بەهۆی پەرەسەندنی خێرای زانستی میکانیکی نیوتنەوە زیادی کرد. هەروەها ئەو بڕوایەشیان لەناویاندا گەشەی کرد کە دەڵێ:

(دەتوانین هەموو راستییەکان لە سروشتدا بدۆزینەوە).

ئەم جۆرە بڕوایە بووە هۆی رەتکردنەوەی ئایینە کۆنەکان و پەرەسەندنی دیزم Desm (خواوەندێتی سروشتی، ئایینی سروشتی). بڕوابوون بە یەکسانیی سروشتی مرۆڤەکان بووە هۆی پەرەسەندنی چەند تیۆرێك لە بواری پەیمانی کۆمەڵایەتی و سەرچاوەی حکومەت و جەختکردنە سەر مافە سروشتییەکانی مرۆڤ. هەروەها رۆشنگەران کەڵکیان لەو بڕوایە وەردەگرت وەك چەکێك بۆ رەخنەگرتن لە رژێمە کۆنەکان. ئەوان (واتە رۆشنگەران) نەك هەر تەنیا ئایینە کۆنەکانیان رەتکردنەوە، بەڵکو دەسەڵاتی کڵێساشیان خستە ژێر پرسیارەوە و هەروەها پشتگیرییان لەو پێشکەوتنانە کرد کە بناغەکەیان لەسەر بنچینەی "لێکۆڵینەوەی زانستە مرۆییەکان" دامەزراوە. لێکۆڵینەوەی زانستە مرۆییەکان چەمکێك بوو کە رۆشنگەران بۆ زانستە کۆمەڵایەتیییەکان بەکاریان دەهێنا.؟ سەرەڕای داکۆکیکردنە سەر چەند چەمکێکی وەك پێشکەوتن Progress و ئەقڵ Reason و سروشت – Nature– و ئەزموونە راستەوخۆکان – Dirict Experiences، رۆشنگەران نەك هەر هەوڵیان دا دەرگای پەروەردەو فێرکردن بۆ هەمووان بخەنە سەر پشت، بەڵکو لە کایەی سیاسەتیشدا پشتگیرییان لە مافە



هایدگەر

سروشتییەکانی مرۆڤ، لەرێی حکومەتی یاساوە دەکرد و بەرگریان لە سیستەمی بەرەنگاریکردنی خراپ بەکارهێنانی دەسەلات دەکرد. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین خەسڵەتە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیای نوێ کە هەمان خەسڵەتی رۆشنگەرین، بەو شێوەیەی خوارەوە بژمێرین:

- پشتبەستن بە لێهاتوویی ئەقڵی مرۆڤ و زانست بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان.
- بڕوابوون بەوەی کە زیانە کۆمەڵایەتییەکان بەرهەمی رێکخراو و دامەزراوە خراپ و بەدەکان بووە، دەنا مرۆڤ لەناخ و سروشتی خۆیدا چاکە.
- بڕوا بوون بە فیکرەی پێشکەوتن.
- بەرهەڵستیکردنی ئاشکرای ئایین.
- رێزگرتنی سروشت و پەرستنی خواوەندی سروشتی.

### ئایدیۆلۆژییە پاش مۆدێرنەکان

گومانکردن لە ئەقڵی مرۆڤ و لابردنی خەیاڵپلاوی ئەو باوەڕەی کە دەڵێ مرۆڤ دەتوانێت راستیەکانی سروشت وەدەست بێنێت و پەی بە رازی بوونەوەر ببات.

ئایدیۆلۆژییەکانی پاش مۆدێرن بە ئاشکرا دژی گشتییەت دان بە هەموو جۆرە کردارێکن کە بنچینەکەی لەسەر ئەقڵ وەستابێت. لەم ئایدیۆلۆژیایانەدا، "بیری مرۆڤ" کە لە ئایدیۆلۆژییە نوێیەکاندا ئامرازێکە بۆ ناسینی نەناسراوەکان، بایەخی پێشووی خۆی لەدەست دەداتو خۆیشی دەبێت بەیەکێك لەنەناسراوەکان. ئەوەی کە لە ئایدیۆلۆژییە نوێیەکاندا پێی دەگوترێ مێژوویی – Historical –، لە ئایدیۆلۆژییە پاش نوێیەکاندا دەبێتە بەشێك لە پۆلێنکردنی فیکر و چیتر فیکر ناتوانێت هەڵی سەنگێنێت – واتە "مێژوویی" هەڵسەنگێنێت –. لەو ئایدیۆلۆژیانەدا (پاش مۆدێرن) مرۆڤ لە بەرامبەر هێڵێکی ئاسۆیی مەیدانی مەعریفەتێك راوەستاوە کە نە سنور و نە سەرچاوەکەی نابینرێن. بەو پێیە، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت شوێن پێیەك لە کەنارو سووچەکانی مەیدانی "بوون" بدۆزێتەوە. لە ئایدیۆلۆژییە پۆستمۆدێرنەکاندا، زانستە مرۆییەکان حاڵەتی جیهانیبوونی "گشتگیری" خۆیان لەدەست دەدەن و تەنیا لە چوارچێوەی هەلومەرجی تایبەتدا لێیان دەکۆڵرێتەوە. بەو پێیە، رێبازی نوێی دیکارت "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" توانای رابردووی خۆی لەدەست دەدات و مرۆڤ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە تێناگات چۆن و چ شتێك، دەزانێت.. بەپێچەوانەی ئایدۆلۆژییە نوێیەکان کە بەدوای کۆتایی هێنانی نامۆیی مرۆڤدا دەگەڕێن، لە ئایدیۆلۆژییە پاش نوێیەکاندا ئەو نامۆییە خۆی لێ‌ناپارێزرێت و دەبێتە شتێکی حەتمی.

### وتووێژی مۆدێرنیتی و پۆستمۆدێرنیتی لەبواری چەمکەکاندا

| مۆدێرنیتی | پۆست مۆدێرنیتی |
| --- | --- |
| 1- سەدەکانی 16-17-18 = قەیرانی شەرعییەتی دەوڵەتی وابەستە بە دام و دەزگا ئاینییەکان. | 1- خستنە ژێر پرسیاری هەموو ئەو ریوایەتە سەرەکیانەی کە کۆمەڵ پەسەندیان دەکات. |
| 2- دنیایی بوونی بواری گشتی. | 2- دەستکێشانەوە لە "هەمەکی گەری" وەك وتەزایەکی مەعریفی. |
| 3- چەمکی بونیادیی - ستراکچەریی - کۆمەڵگا: کۆمەڵگا = بەرهەمهێنانی روو لە زیادی هۆشیاری، ئامادەیی و لەباردابوونی ئیرادەی مرۆڤ بۆ سەربەخۆیی مێژوویی - Historical autonomy - . | 3- رازیبوون بە جیاوازییەکانی سیستەمە لاوەکییە - فرعی - کۆمەڵایەتییەکان وەك بەهایەك. |
| 4- برەودان بە هۆشیاریی رەخنەگرانەی سەقامگیر لە بەرامبەر ئەو واقعەی کە هەیەو پەیوەندیی بە پێویستە ئەخلاقییەکانەوە. | 4- کورتکردنەوەی رەهەند (بعد) ی کۆمەڵایەتی دەوڵەت بۆ سیستەمێکی لاوەکی لە ریزی سیستەمە لاوەکییەکانی تر. |
| 5- دەزگای بوونی بیرۆکراسی، کۆنترۆڵ و بەرێوەبەرایەتی بەها ئەخلاقییەکان. | 5- بەدگومانی و دوودڵی بەرامبەر بە هێزە رێکخراوە دیکتاتۆر و دەسەڵاتخوازەکان. |
| 6- بڵندکردنەوەی دەرونیکرنی میکانیزمەکانی دەسەڵات. | 6- کورتکردنەوەی دەوڵەت بۆ بیرۆکراسییێکی ئەقڵانی و رەسمی و میکانیکیی رووت. |
| 7- گۆڕانی دەوڵەت بۆ تەوەری بەشداریکردنی کۆمەڵی - جماعي -. | 7- نەرێکردنی دەوڵەت وەکو رەمزی ناسنامەی نەتەوەیی. |
| 8- ئەنجامدانی کاروبارە سیاسیەکان لەرێگەی بونیادە حیزبیەکانەوە = رێگەی سەرەکیی هاوئاهەنگی کۆمەلایەتی. | 8- نەرێکردنی پێکهاتە - بونیادە - حیزبیەکانو کاروبارە سیاسییەکانیان وەکو رێگەیەك بۆ یەکبوون و بۆچوونە کۆمەڵییەکان. |
| 9- تێگەیشتن لە دیموکراسی وەکو نیشانەی هاوسەنگیی "چونیەك بوونی" کولتووریی - کۆمەلایەتی و پێکەوە نەگونجان. جەخت کردنە سەر "چونیەك بوون" وەك دوایین پێوەر بۆ بریاردان و رێگە چارە جێبەجێکارییەکان. | 9- قەیرانی کۆمەڵایەتی کە دەگەرێتەوە بۆ بناغەی مەعریفەییێکی سەرتاپاگیر، مەعریفەیەك کە رووی لەیەك خاڵ و یەك ئامانجە. |
| 10- بەدگومانی سەبارەت بە جیاوازییە کولتوورییەکان: پلورالیزم وەك سەرچاوەیەکی لێکداپچران. | 10- رەخنەگرتن لە چەمکی (هاوبەشیی): گێرانەوەی جیاوازییە کولتوورییەکان (پلورالیزم). |
| 11- بایەخدان بە یەکگرتنی نەتەوەیی لە | 11- بەرزکردنەوە و برەودان بە رێژەیی بوونی |

| | |
|---|---|
| ڕێگەی زەقکردنەوەی ناسنامەی کەسێتی نەتەوەیی. | "ئەخلاق". |
| 12- بنیاتنانی کەسێتی نەتەوەیی بەهۆی ئەو نەریتە سەرەکیانەی کە لەلایەن دەوڵەتەوە بەرهەمهێنراون. | 12- رەتکردنەوەی بەدەزگاکردنی نەفسییەتی (زهنییەتی) کۆمەڵی لەلایەن دەوڵەتەوە. |
| 13- وەسفکردنی نموونەی مەعریفەی بالاتر لەلایەن نموونەی کۆکراوەی وەك خۆی. | 13- روخاندن و تێکدانی بەڵێنە کۆمەلایەتییەکان. لەلایەن ئانارشیستەکانەوە. |
| 14- بالا دەستی بەڕێوەبەرایەتیەکی بیرۆکراتی بە شێوازی بەڕێوەبەرایەتی تەکنیکیانە. | 14- رەتکردنەوەی کردەیی بوونی پلانە مێژووییە هاوبەشەکان. |
| 15- تێگەیشتنێکی تاکتیکی و ستراتیژی لە کاروبارە کۆمەلایەتییەکان و بزووتنەوەی مێژووییەکان. | 15- راگەیاندنی چوونە نێو قۆناغێکی نوێی "پاش مێژوویی". |
| 16- نەخشە دارشتن بۆ دەرونیکردنی بڕوابوون بە یۆتۆپیای پێشکەوتن. | 16- لەدەستدانی بڕوابوون بە یۆتۆپیای پێشکەوتن = ئایندە بەرهەمی رووداوە چاوەڕواننەکراوەکانە. |
| 17- دەرککردنی زەمان (سات) وەك رابردوو - داهاتوو، کە بەهۆی پردی دابڕانە ئازادیبەخشەکانەوە بەردەوام دەبێت. | 17- مێژوو = پەیوەندیی کاردانەوە یەك لە دوایەکەکانی رووداوەکان. |
| 18- ئارەزووبوون لە دوورخستنەوەی هۆشیاری لە ئێستایێکی ناتەواودا بەرەو ئەو بەڵێنانەی کە لە ئایندەدا دێنە دی. | 18- پیرۆزکردنی سنوورداربوونی ساتی ئێستا، ریالیزم و پراگماتیزم. |

**سەرچاوە:**

اطلاعات سیاسی - اقتصادی، (د. حمید عزدانلو، مناظرة مدرنیته و فرامدرنیته در زمینهء مفاهیم)، شمارة 83-84، ص (28-29).

# رەخنەو تۆژینەوە



▪ دانەرو دانەرێتی



▪ دەنێو دڵی چیرۆکدا مرۆڤ هەیە



▪ سۆسێرو تیۆرە زمانەوانییەکەی

# دانەرو دانەرێتی

♦ رۆجەر وێبستەر

● لە ئینگلیزییەوە: پەیوەند فایەق

چەمکی دانەر هەر لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمەوە لەرەخنەی ئەدەبیو سیستەمی ئەدەبی ئینگلیزیداو هەر لەوکاتەوە کە ئەم دوو بوارە وەکو بواری مەعریفە ناسراون چەمکێکی بنەڕەتی بووە. رەخنەو بایۆگرافیا لەو سەردەمەوە بەشێوەیەکی تەواوەتی لەیەکتر جیابوونەتەوە. واتە سەرجەم ئەوەی لەبارەی ژیانی دانەرێکەوە دەیزانیت. جیاوازە لەسەرجەم ئەو شتانەی کە حەزت کردووە لەبەرهەمی ئەدەبی کەسێکدا تێیبگەیت. پێشتر ئەدەب بەوجۆرە سەیر نەکراوە کە شتێکی جیاکراوەو دابراو بێت لەو کەسەی بەرهەمی هێناوە، ئەو هەولانەی بۆ خوێندنەوەی شکسپیر دراون ئەوە دەسەلمێنن ئەی. سی. برادلی لە سالی 1904دا محازەرەی لەسەر شکسپیرداو لە محازەرەکەیدا هەولیدا وێنەی هەستیارێتی شکسپیر لەخوێندنەوەی شانۆگەریەکانیدا بنیادبنێت. هەرچەندە برادلی بەوە رازی دەبێت کە زانیاری ئێمە لەبارەی بایۆگرافیای شکسپیرەوە کەمە بەلام ئەوە رێگامان لێناگرێت کە هەولی هەلسەنگاندنی لایەنە بەهێزو چەسپاوەکانی فیکرو هەستی ئەو بدەین یان رێگامان لێناگرێت بۆ تێگەیشتنی کەسێتیو هەلوێستی ئەو بەرامبەر ژیانی مرۆڤ کە لای ئێمە وا دەردەکەوێت ئەو بەچاکترین شێوە سروشتی ئاسایی مرۆڤانەی ئێمە تێگەیشتبێت. سیو پێنج سال دوای برادلی دەروازەیەکی تری هاوشێوەی ئەو بۆ ئاخاوتن لەسەر شکسپیر دەبینین کە ئەویش قسەکردنە لەسەر شکسپیر لەدەروازەی ژیانو ئەدەبەکەیەوەو ئەویش لەلایەن پیتەر ئەلێکسەندەرەوە لەسالی 1939 ئەنجام دراوەو شانۆگەرییەکانی شکسپیر دەخاتە ژێر

هەڵسەنگاندنەوە بەپێی پێودانگێکی بایۆگرافیانە کە ئەوەش یارمەتی گفتوگۆکردنی رەخنەییانە دەداتو بەوێنەی شکسپیر دەست پێدەکات تا دەگات بە پەروەردەو رۆشنبیری ئەم نووسەرە. ف. ئار. لیڤز زۆر دواتر لەسەر گاڵتەئامێزی بەرهەمی (سویفت)ی نووسیو تیایدا جیاوازی لەنێوان بایۆگرافیاو رەخنەی ئەدەبیدا دەکات بەڵام لەهەمان کاتدا هەوڵدەدات جارێکی تر ئەم دیوارە پێکەوە ببەستێتەوە کاتێ دەڵێت:

حەز دەکەم بەرهەمەکانی سویفت گفتوگۆ بکەم بۆ ئەوەی هەڵیان بسەنگێنم و بزانم چین. ئەو بەرهەمانەش بریتین "لە بەرئەوەی تاکو ئێستا ماونەتەوەو شایەنی گەواهی بۆ دانن" لەو جۆرە نووسین یان بەرهەمەی کە بەشێوەیەکی تایبەتی گفتوگۆکردنیان گران و زەحمەتە ئەگەر بێت و ئاراستەی گفتوگۆ بەرەو جۆری کەسێتی سویفت خۆی نەکرێتەوە. لەهەوڵداندا بۆ دەربرینی ئەو هۆکارەی کە نووسینێك دەکات


میشێل فۆکۆ


ڤان کوخ

بەنووسینێکی بەرزو نایاب ئاماژە کردن و گەڕانەوە بۆ ئەو کەسەی کە نووسیونی لەراستیدا کارێکی پێویستە.

لەکاتێکدا لەدوا ساڵەکانی چل و ساڵانی سەرەتای پەنجاکاندا هەندێ گفتوگۆ لەسەر پەیوەندی نێوان دانەرو بەرهەم کرا، ئەو گفتوگۆیانە بەتایبەتی لەسەر مەسەلەی "ئامانجدارێتی" بوو، بەڵام وەکو دواتر دەیبینین لەساڵانی شەستەکاندا زۆر گۆڕانکاری رادیکاڵانە روویانداو لەرووی پێودانگە تەقلیدیەکاندا وەستان و وایان دانا دانەر خولقێنەرو بەرهەم هێنی بەرهەمی ئەدەبیەو ئەو گۆڕانکارییانە مەسەلەی دانەرو دانەرێتیان لەدەقدا خستە بەردەم پرسیارەوە.

باشترین نموونەی ئەو گفتوگۆیانە وتارەکەی رۆلان بارتە دەربارەی "مەرگی دانەر" کە ساڵی 1968 بڵاو بووەوە، لەم وتارەدا ئەوەی کە بە "بیرۆکەی هەڵەی بایۆگرافی" ناوی دەبەین هێرش دەکرێتە سەری:

ئەو وێنەی ئەدەب کە دەشێ لە رۆشنبیری ئاسایدا بدۆزرێتەوە بەشێوەیەکی نابەجێی توندوتیژ گرنگی دەدات بە دانەرو کەسایەتی دانەرو کەسایەتی دانەرو ژیانیو چێژوەرگرتنیو سۆزو عاتیفەی، لەهەمان کاتدا رەخنە هێشتا لەو شتانە پێکدێت کە دەڵێت بەرهەمی بۆدلێر بریتی‌یە لە شکستی کەسێتی بۆدلێر، بەرهەمی ڤان کوخ بریتی‌یە لە سێتێتی ڤان کوخ. بەرهەمی تکیاکۆفسکی بریتی‌یە لە رسوایی خۆی.

بۆ لێکدانەوەی بەرهەمێك هەمیشە لەکەسێتی ئەو پیاو یان ژنە دەکۆڵنەوە کە ئەو بەرهەمی خولقاندوە، وەکو ئەوەی کە هەمیشە لەکۆتایدا لەمیانەی مەجازێکی کەم یان زۆر ئاشکرای ئەدەبیەوە دەنگی تاکە کەسێك ببێتە دەنگی بڕوا پێکراوی دانەر لەئێمەدا.

بارت گفتوگۆی ئەم بابەتە دەکات و دەڵێت: ئەوەی دەدوێت زمانە دانەر نیە" لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە رێگا لەدەروازەو ئاراستەی بەناوەندکردنی دانەر بگرین ئەگەر بمانەوێت پەی بەمەودای تەواوەتی ئەو مانایانە ببەین کە دەقێکی ئەدەبی لەسنووری خۆیدا هەڵیان دەگرێت. جارێك دەق سوورێکە، مێلێکە ئامادەکراوە بۆ قسەکردن لەنێوان دانەرو دەقدا، ئەم هێڵە دەبڕێت و دەق وەکو بوویەکی سەربەخۆی لێدێت. دیسان پارت ئەو پرسیارانە بەرز دەکاتەوە کە ئێمە لەبارەی "تاکێتی" دانەرەوە لەپرۆسەی نووسیندا دواتر تاقییان دەکەینەوە پارت بەگفتوگۆکردن دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە جۆراوجۆرێتی مانا وا لەدەق دەکات تیایدا قورسی نەخرێتە سەر دانەر بەڵکو قورسی بخرێتە سەر خوێنەر. یەکێتی دەق ناخرێتە سەر ئەسڵ و بنەمای دەقەکە بەڵکو دەخرێتە سەر ئامانجی ئەو دەقە. لەبەر ئەوە دەبێ ئێمە

ئەفسانەی "دانەر" بروخێنین و "دەبێ لەدایکبوونی خوێنەر لەسەر حسابی مەرگی دانەر بێت" پێویستە وتارەکەی پارت مان لەیاد نەچێت، ئەو وتارە خۆی دەقێکە لەساتەوەختێکی مێژوویی تایبەتدا بەرهەم هاتووەو ساڵی 1968 لەراستیدا ئەو کاتەیە کە گەلێك دژایەتیو لەروودا وەستان بەرامبەر بە دامەزراندنی دانەرێتی "یان سەرکردایەتی" لەبواری پەروەردەو رۆشنبیریدا سەری هەڵدا. وازهێنان و بەلاوەنانی دانەر لەم سیاقەدا گرنگیەکی تایبەتی هەیە وەکو جێبەجێکردنی تێروانینی سەرەتایی دانەر دەخاتە جێگایەکەوە کە خاڵی ناوجەرگەیی بەرهەم هێنانی ئەدەبیە. ئاماژەکردنی پارت بۆ دەسەلاتی توندی دانەر دەشیا بەهەمان نموونەی گفتوگۆکەی پێشتری خۆم پیشان بدرایە. زۆر لە رەخنەگران و تیۆر دانەران بەهوشیارییەوە دوور دەکەونەوە لەقسەکردن دەربارەی هەڵوێستی دانەرێك یان تێروانینێك لەپەیوەندی بوونیەوە بە دەقێکی ئەدەبیەوە، لەبەر رۆشنایی ئەم بیرۆکانەدا ئەم جۆرە پەیوەست بوونە بوونی نیە، دەشێ ئەوەش لەئاخاوتن لەبارەی رەخنەگران یان تیۆردانەرانەوە وەکو دانەرانی لەجۆری لیڤز یان رۆلاند پارت دا دەربکەوێت. (لەبارەی دەقەوە وەکو شتێکی گونجاوی هەر جۆرە نووسینێکی ئەدەبی یان غەیری ئەدەبی بروانە بەشی پێنجەم واتە پەیوەندییە ناوکۆییەکانی دەق). دوورکەوتنەوە لە نەریتەکانی گوتارێکی تایبەتی کارێکی زۆر گرانەو گومانیشی تێدا نیە کە هێشتا خەڵك دەگەڕێنەوە بۆ ئاماژەکردن بۆ دانەران کاتێ قسە لەبارەی ئەدەبەوە دەکەن. گرنگترین خاڵ کە دەبێ لێی بەئاگا بین بریتیە لە بایەخی "دانەر" کاتێ ئاخاوتن لەبارەی ئەو زاراوەیەوە دەکەین تەنانەت ئەگەر نەتوانین یان حەزنەکەین ئەو زاراوەیەوە بەلاوە بنێین.


بۆدلێر

هەولێکی زۆر مێژووییانە سەبارەت بەدانەرێتی لەلایەن میشیل فۆکۆوە لەوتارێکدا بەناونیشانی "دانەر

چیـیـە؟"دا دەدرێـت کـە سـاڵی 1979 نووسـیوویەتی.

لەگفتوگۆیـەکدا فۆکـۆ سـەبارەت بەکەسێتی دانەر پەیوەست دەبێت بەدەرکەوتنـەوە کـە لـە ڕۆشـنبیری ڕۆژئـاوادا فۆکـۆ نـاوی دەبـات بـە "بەتاکبوون"، کە ئـەوەش ناوەندە شـوێنەو بـەناوە تاکـەکان داگـیر دەکرێـت، ئـەویش بەڕێگایـەك کـە جۆرەکـانی مەعریفـە بـەپێی ئـەو ڕێکدەخرێـت. بـەم جـۆرە دانـەر ناسـنامەو شـوێنی تایبـەت دەبەخشێت بەجۆری هەمە چەشنی نووسین وەکـو ئـەوەی لەکۆمـەڵدا دێـت و دەڕوات لەشـێوەی سوڕانەوەدا.


ڕۆلاند بارت

دانـەر (پیـاو یـان ژن) خـاڵی ناسینەوەو جیاکردنـەوە پێشـکەش دەکات کە ئەویش یەکەیەکی توندو تـۆڵو بنەماییـە. فۆکـۆ داوای ئـەو ڕێگایانە دەکـات کـە نـاوی دانـەرێکی تێدا بـەکار دەهێـنرێت بەمەبەسـتی کۆنـترۆڵکردنی دەورانـی ئـەدەب واتـە "وەزیفـەی دانـەر". هـەروەها پێشنیاری ئـەوە دەکـات کـە بەراستی ڕێگایـەك هەیە بۆ سنووردارکردنی ڕێبازەکانی خوێندنەوەو ئەو مانایانەی کە دەتوانن لەدەقێکدا دەربکـەون. فۆکۆ گفتوگۆی ئەوە دەکـات کـە کەسێتی دانـەر لـەپێش سـەدەکانی حـەڤدەو هـەژدەدا ئـەو گرنگیـەی نـەبووە بـۆ بەرهەمـە ئەدەبیـەکانی لـەکاتێکدا کـە جێپەنجـەی دانـەری تـاك لەچاککردندا پێویست نـەبووە بۆ شـەرعیەت دان بـە "ڕاستێتی" یـان دانـەرێتیان و بەرهەمـەکان بەبێ ئـەوەی ناویان پێوە بێت، پەسـەندکراون.

لەگـەڵ دەرکـەوتنی کۆمـەڵگای بۆرجـوازیو فشاردانانی نوێ لەسەر یاسـاکانی خاوەندارێتیو خاوەندارێتی یەکگرتن لەگەڵ پەرەسەندنی بواری مەعریفەی زانستیدا وەکو ڕێگایـەکی لێکدانـەوەی دنیـا، دەقـە ئەدەبیـەکان بایـەخێکی زیاتریـان بەدەسـت هێنـا وەکـو بەرهـەم و ئاماژەکـانی تاکگەراییو بوارێکی هێجگار جیاوازیان داگیرکرد.

تێڕوانینی فۆکۆ بۆ وەزیفەی دانەر ئەوەیە کە خزمەتی مەبەستێکی ئایدیۆلۆژی دەکات: ئەویش ئەوەیە کـە دانـەران بەشێوەیەکی گشتی وەکـو ئـەوە نیشـان دەدرێـن کـە سـەرچاوەی بـەهرەی ئـەفراندن و عەبقەریـەت و خـەیاڵن بـەڵام بەڕێگەیەکی دژی ئەم بۆچوونە کاردەکەن. دانـان

و وەسفکردنی بەرهەمەکان بەپێی دانەرەکان دەشێ وەکو بەربەستێك لەبەردەم "سووری ئازادی" مەعریفەدا ببینرێت کە تیایدا بەرهەمەکان ئاسایی لە سیستەمێکی تایبەتی مەعریفی بەهادارادا دادەنرێن کە لەلایەن چەمك و نەریتەکانی دانەرێتیو بایۆگرافیاوە دەجولێنرێن. ئەوەی بەلای لیڤزەوە وادەردەکەوێت کە پرسی هەڵسەنگاندن و ئەزموون و بەڵگەنەویستی زانین یان دانانی بەرهەمی ئەدەبی بێت، لای فۆکۆ دەبێتە پرۆسەیەکی بەربلاوی ئایدیۆلۆژی پێشتر دیاریکراو کە کاردەکات بۆ پاراستنی مەعریفە لە ئەنجامیشدا بۆ پاراستنی دەسەلآت لەبوارە تایبەتیەکانی کۆمەڵدا. بەم شێوەیە وەزیفەی دانەر بریتییە لە ستراتیژیەتی پێکەوە کۆکردنەوەیەك کە ئەدەب و خوێنەر پێکەوە دەبەستێت و بوار بەئازادی وەلآمێك دەدات کە بەشێوەیەکی گشتی لەمیانەی دەستەواژەکانی وەکو "خەیاڵی دانەر" ەوە دانراون. خاڵێکی تری کۆتایی کە فۆکۆ بنیادی دەنێت ئەوەیە کە نەریتی دانەرێتی ناکەوێتە پێش دەقێکی ئەدەبیەوە، بەڵکو بەتەواوی دەکەوێتە دوای دەقەوە. ئەمەش هەڵگەڕانەوەی روویەکی پرۆسەی بەرهەمهێنانی ئەدەبیە وەکو ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی بنیاد دەنرێت. ئەوەی فۆکۆ لەمە مەبەستیەتی ئەوەیە کە ئەو بیرۆکەی ئێمە لەبارەی شکسپیر یان وردزۆرسەوە هەمانە لەپشتی بەرهەمەکانی ئەو دانەرانەوە بەرزی دەکاتەوە کە لەناوەندێکی گشتیدا بوون. بەشێك لەرێکسختن و شەرعیەتدان بە بەرهەمە ئەدەبیەکان لە رۆشنبیری ئێمەدا لەرێگای پێکهێنانی کەسێتی دانەرەوە لەروانگەی پەیوەندی بوونیەوە بە بەرهەمەکەیەوە ئەنجام دەدرێت. دەرکەوتنی سەرجەم زنجیرەی بایۆگرافیای ئەو نووسەرانەی بەناوی گەورە ناو دەبرێن و لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوتووە بۆ نموونە زنجیرەی نووسەرانی ئینگلیزو فەرهەنگی بایۆگرافیای نەتەوەیی کە هەردووکیان لەلایەن (لیسلای ستیڤن)ەوە چاپکراون نموونەی باش و پەسەندن، کە هاوشان لەگەڵ ئەدەبی ئینگلیزیدا وەکو بابەت و گوتاری رەخنەی ئەدەبی دەردەکەون.

لەوانەیە گفتوگۆکانی پارت و فۆکۆ توندو ناپەسەند دەربکەون. منیش نەمویستووە پێشنیاری ئەوە بکەم کە ئەم گفتوگۆکردنانە حسابکردنێکی رەتنەکراوەن لەبارەی کەسێتی دانەرەوە. هەروەك پارت و فۆکۆ خۆیان دانیان پێداناوە، کەسێتی دانەر جێگایەك بۆ گفتوگۆی گشتی دروست دەکات و لەزۆر بواری جۆراوجۆری پڕبایەخی مێژووییەوە ئەو کەسێتیە دەخرێتە بەردەم لێدوانەوە.. ئەمەش دیسان پێویستە بخرێتە سنووری گفتوگۆکانی ئەوانەوە. هەرچەندە بیروبۆچوونەکانی پارت و فۆکۆ مایەی هەڵچوونن و بەرەو ئەو پرسیارەمان دەبەن کە داخۆ چ شتێ وەکو راستییەکی بەڵگەنەویست کە پەیوەستی ئەدەب بێت وەرگیراوە. وتارەکانی ئەم بوارە بەدوای بەتیۆرکردن و بەگرفتکردنی دانەردا دەچن و دەکۆڵنەوە. بۆ ئەوەی ئیتر وەکو رەگەزێکی دانراو یان سروشتی دەربکەوێت.

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئاخاوتن لەسەر رێگاکانی تێگەیشتن لەدانەر ئەویش لەبەشی پێنجەمی "ئەم کتێبەداو لەبابەتی پەیوەندییەکانی دەق دا".

سەرچاوە:

Roger Webster. Studying Literary Theory- London. 1990- pp. 18-21.

# دەنێو دڵی چیرۆکدا مرۆڤ هەیە

◆ رۆبێرت گۆرهام دەیڤس
● لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

لەرەخنەی ئەم سەردەمەدا بۆتە باو کە قسە لەسەر ئەوە بکرێ پلەو پایەی ئەدەب؛ بەگشتی، بەرزو بڵند راناگیرێ، بەتایبەتیش ئەدەبی گێڕانەوە (کە چیرۆکو رۆمان) دەگرێتەوە. بیانووەکەش ئەوەیە کە ئەم جۆرە ئەدەبە نەیتوانیوە "چەند بەهایەکی پیرۆزو جێگیر" دەنێو نووسەرانی ئەم سەردەمەدا بخولقێنێ. بڕواهێنان بە هەر بەهایەك لەلای نووسەر دەکرێ ببێتەوە بە بەهایەك لە نێو خودی کۆمەڵگادا.

رەخنەگرە زۆر دڵگەرمو رشتەکان وشەی "بەهاکان" زۆر بەکار دەهێنن، بەڵام ئەوەندە لەخەمی ئەوەدا نین کە پێناسەی ئەو بەهایانە بکەن یان هەتا دەست نیشانیان بکەن.

بۆ ماوەی چەندین سەدەش وشەی "بەهاکان" گرفتی گەورەی بۆ فەیلەسووفەکانیش دروست کرد. هەندێ لەرەخنەگرەکان وای دەبینن کە دابەزینی کێرڤی ئەدەبی رۆمان یان ئاوابوونی خۆری ئەدەبی گێڕانەوە پەیوەندی بە نەمانی یان ناجێگیربوونی بەهاکانەوە هەیە. کەچی هەر ئەو رەخنەگرانە ناچنە بنجو بنەوانی ئەم روانینەی کە خۆیان بڕوایان پێیەتی، تێمان بگەیەنن کە لەرابردوودا ئەم بەهایانە چی بوونو چۆن لەنووسەرەکانەوە گوازرانەوە بۆ نێو کۆمەڵگا چۆن لەنێو رۆمانەکاندا وەدەرکەوتوون، بەتایبەتی بەر لەهاتنی "ئێرنست هێمنگوای، هێنری جەیمز، یان جێن ئۆستن".

گەر مەسەلە نەبوونی "بەهاکان" بێ، یان لەقبوونیان ئەوە دەبێ بڵێین دەمێکە بەهاکانی مرۆڤ وەکو خۆیان نەماون، رەنگە نووسەری ئیتاڵی "بۆکاشیۆ" بەر لەسەدەها ساڵ قسەی لەسەر ئەو داڕووخانە کردبێ، بۆ ئەوەش دەکرێ یەکەمین نووسەری واقیعی بێ کە قسەی خۆی


هێنری جەیمز

لەسەر گەندەڵ بوون کردووە. نووسینی، بەنزیکەی شەش سەدە، لەمەوبەر، بەرلەوەی سەدەکانی ناوەڕاست بەرەسمی کۆتایی بێ، لەم دارزانە ڕۆحی‌یە دواوە. بۆکاشیۆ باس لە جیهانێك دەکا کە تیایدا قەشەکانو بگرە زۆرینەی ناو چینەکانی ناوەڕاست لەمەڕ ڕوانینیان بۆ بەهاکان تا ئەوپەڕی ماددییانە بیریان کردۆتەوە، بۆ گەیشتن بە خەونو ئامانجەکانیان هەموو ویژدانو ئەخلاقێکیان پێشێل کردووە، لەهیچ شتێك سڵیان نەکردۆتەوە.

ئەدەبی ڕۆمان لە ئیسپانیا سەری هەڵدا ئەوکاتەی کەڵکەڵەی گەشتو سەفەرو بازرگانیو سەرکێشیو مەیلی بە کۆلۆنیالکردنی دونیای دەرەوە لای خەڵکەکانی بوو بەهەواو هەوەسێکی کوشندە.

هەموو ئەو مەیلانەو پەیدابوونی شارە گەورەکان وایان کرد ئەو قاڵبگرتنو جێگیربوونەوەی سەدەکانی ناوەڕاست بەتەواوی دارمێو هەڵتەکێ.. وا دەرکەوت کە ئەو هەڵتەکاندنە یەکجارەکی بێ. ڕۆمانی "دۆن کیشۆت"ی (سێرڤانتس) نموونەیەکی زۆر بەرجەستەیە. پاڵەوانەکانی نێو ڕۆمانە فەرەنسیو ئیسپانی‌یەکان، بەتایبەتی پاڵەوانە وێڵ گەردو بێ لانەکان، ئەوانەی گوایە سوارچاك بوون، هەر هەموویان خەڵکانێکی بێکەسو مایە پووچو نارەسەن بوون، واتە کوڕی کەس نەبوون، بەڵام نەوە لەدوای نەوە بزرەکان کە بێ سەرمایەو بێ مایە بوون لەخێری ئەو کەسانەین دەخوارد، ئەو کەسە وێڵ گەردو بێ لانانەو کەسانێکی زۆڵو زیرەك بوون، هەموو ئەو کەسانە توانیبویان کۆمەڵێ (بەها) بۆ خۆیان دامەزرێنن، لەدونیایەك کە ئالۆزەو پڕە لە تەماعو فروفێڵ.

ئەوکاتەی "ریچاردسن" و "فیلدنگ" و "سمۆلێت"و "ستێرن" ڕۆمانی ئینگلیزییان دامەزراند، لەچارەکی سێیەمی سەدەی هەژدەهەم، هەر ئەوکاتە پێویستی بۆ "گەڕانەوەی بەهاکان" زۆر کوشندە بوو. گەندەڵ بوونی جیهانی رامیاری، بەرتیل خواردن، پایەو پلە کڕینو فرۆشتنی بێ ئەندازەی تەشەنەی کردبوو. شارەکانی نوقمی هەژاریو بەدڕەوشتیو پیسیو تاوانو بەرەڵلایی سێکسی بوون. نموونەی پاڵەوانی وەك "تۆم جۆنز"ی "فیلدنگ" زۆر باو بوون دەنێو خەڵکانی خاوەن موڵکو ماڵو درندە ئاسا، کەسانی شەڕخواز پتر بوون لەخێرخوازەکان. زانکۆکانو کڵێسا چاك دامەزراوەکان لەدۆخێکی زۆر مت بووندا بوون.

لەم کۆمەڵگایەدا کە تیایدا مەسەلە ڕەهاو جێگیر بووەکان کەم بوون. ئەو چوار ڕۆماننوسە کە پێیان دەوترا "چوار شکۆدار"ەکە، هەر ئەوە نەبوو کە بەتەنها بناغەی ڕۆمانی ئینگلیزی دابمەزرێنن، بەڵکو توانیان ببنە خوڵقێنەری

بەهاکانو پتر بەرفراوان کردنیان. ئەو چوار رۆماننوسە گەلێ وانەیان بەخوێنەرانی خۆیان وتەوە: هەر لەدەستو دڵ فراوانی‌یەوە، سۆزو بەزەیی، رۆحی خۆش مەشرەفیو مەزاق تا دەگا بە چاندنی هەستێکی بەرزی رەوشت پەروەریو جوانپەرستی.

ئەوان توانیان ئەو رۆحە وەئاگا بێنن کە بیر لەچاککردنی دەزگاو دامەزراوەکان بکاتەوە، بیر لە باشکردنی هەلو مەرجە کۆمەڵایەتی‌یەکان. لەگەڵ ئەوەشدا نەچوونە پاڵ ئەوەی خۆ بە بەها باوەکان ببەستنەوە. هەرچەندە (فیلدنگ)و (ریچاردسن) دوو نووسەری مۆرالیست (ئەخلاقی) بوو، بەڵام کەمتر کەڵکیان لەو ئەخلاقییەتەی یەکدی دەبینی. (لۆرانس ستێرن) کە خۆی قەشە بوو، لەنێو ئەو سێ رۆماننووسەی دیکەدا لەهەمووان زیرەکترو وردترو هەستیارتر بوو، جگە


جۆرج ئیلیۆت

لەوەی کە تاسەر ئێسقان پیاوێکی ئەزموونکار بوو، بەپێی پێوانەی ئەخلاقیەتی سەدەی نۆزدەم کەسێکی تابڵێی بێپەردەو حەیا بەرە بوو.

ئەگەر بگەڕێینەوە ناو رۆمانەکانی سەدەی نۆزدەم بۆ نموونە: لای نووسەرانی وەك (جێن ئۆستن، ئێملی برۆنتی، جۆرج ئیلیۆت، جۆرج مێریدث، تۆماس هاردی، جۆرج موور) قەت ئەم رۆمانووسانە تائەو ئاستە رێكو كۆك نین لەسەر ئەو (بەها) یانەی کە دەکرێ پێیان بوترێ بەها گەوهەریو رەهاکان، ئەو بەهایانەی کە ئێمە چاوەڕوانی دەکەین، کەواتە بە بەراورد چوار رۆماننووسە شکۆدارەکان رێکو کۆکتر وەدەر دەکەون لەسەر خولقاندنی ئەو بەهایانە، ئەگەر بچینەوە لای ئەو نووسەرانەی کە ئینگلیز نین. وەك: (هێنری جەیمز، مارك توێین، گۆستاف فلۆبێر، زۆلا، دۆستۆیڤسکی) ئەوسا هەست دەکەین کە نەك رێکو کۆك نین لەسەر (بەها) کان، بەڵکو زۆر لەیەکدی دوور دەکەونەوەو جیاوازن. ئەو شتەی کە هەر هەمویان کۆ دەکاتەوە: بایەخدانێکی زۆرە بەخەڵکو عەوام، بەحاڵەتە جیاکانی خودی مرۆڤەکان، بەرکارو ئاکامی جۆرەها کارو کردەوە، ئەو بەرئەنجامانەی رەفتاری ئادەمیزادەکان کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گەر بەکەمیش بێ دەگۆڕێ.

هەتا گەر مرۆڤ بۆ خۆی لەبارێکی جێگیریشدا بێ، واتا شتەکانو حاڵەتەکان هەر لە بناغەوە وەکو خۆیان بمێننەوە کەچی لەولاوە سەیر دەکەین روانینو گۆشەنیگای رۆماننووسەکان زۆر دەگۆڕێن. لەرۆماندا گۆشەنیگا یان روانگە یان بگرە جیهانبینی زۆر گرنگە، چونکە (بەهاکان) — قیەم— وەك (نیتشە) دەڵێ: بە روانگە دەگۆڕێن.



دۆستۆیڤسکی



فلۆبێر

ئەوەش وەستاوەتە سەر ئەوەی کە تۆ چۆن سەیری شتەکان دەکەی، ئەوەش بەدەوری خۆی پەیوەستە کە تۆ خۆت چیتو کێی. ئەوکاتەی ژیان (مانا)ی خۆی یان (بەها)ی خۆ دەدۆڕێنێ، ئەوە بزانە کە شتێك لەخاوەن بەها گۆڕاوە، نەك لەخودی ژیان، بەهاکان دەبێ چی بن جگە لە بەرئەنجامێکی نرخاندنو هەڵسەنگاندن، خەڵکی جیاواز لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی جیاوازدا کۆمەڵێ بەهای جیاوازیان هەیەو شتی جیاوازیش دەنرخێنن.

لەو ئەگەرە قورسانەی کە ژیان هەمیشە پێش کەشی دەکات، ئادەمیزادەکان دەتوانن جۆرێك لە بەهاکانی خۆیان هەڵبژێرنو دەست نیشانی بکەن، بەپێی ئەو قوربانی‌یەی کە ئامادەن پێش کەشی بکەن لەپێناو هەر خێرو هەقو جوانی‌یەك کە دەزانن هەر هەموو ئەو بەهایانە مەزننو دەبێ بەرزیش رابگیرێن. مادامەکێ کەسەکان دەتوانن ئارەزوویان هەبێو لەولاوەش دابین کردنو رەزامەندی، لەم حاڵەتەدا ژیان دەتوانێ لەناو ئاخنی خۆیدا بەهای دیکە بەرهەم بێنێ. مادامەکێ رۆمان دەتوانێ هەموو جوانیو نهێنی‌یەکانی ژیانمان بۆ وەدەربخات، کارێکی هەڵەیە وا بزانین نووسەر هیچ بەهایەکی نی‌یە. هەرچەندە خوێنەر وابزانێ ئەو بەهایانە گونجاوو جێگیر نین.

کۆنتراستی (دژواری) نێوان (ڤایکنیگ- پاڵەوانی) "گراهام گرین" لە رۆمانی "کۆتایی عیشقبازی" لەبەرامبەر "چارلز سکرینەر" لەرۆمانی "هەروەها خۆریش هەڵدێتەوە"ی هێمنگوای ئەم راستیە دەردەخات. رۆمانەکەی "گراهام گرین" لەسەر بەها رەهاکان دامەزراوە، بەگەڕانەوە بۆ "ئۆرثودکسی‌یەتی ئایینی" کە لەو سەردەمەدا جێی بایەخ بوو. رۆمانی "دیسانەوە یان هەروەها خۆریش هەڵدێتەوە" لەساڵی

(1926)دا بڵاو بۆوه، ئەو دەربڕینە لەو وەختەدا زۆر کاریگەر بوو، دەربڕینێك بوو بۆ خۆرزگارکردن لەخەونی پووچو درۆ کە دیارە ئەو نەوە بزرەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەسەری دەلەوەڕان.

لەگەڵ ئەوەشدا پڕ بەمانای وشە بەهاکانی نێو رۆمانی "دیسانەوە خۆرهەڵدێتەوە" گەلێ زۆرترن لەو بەهایانەی کە لەرۆمانی "کۆتایی عیشقبازی" یەکەدا هەن. هەر چەندە هەردووکیان پڕن لەو ساتەوەختە زۆر تاڵانە. کارەکتەرەکانی "هێمنگوای" هەمیشە سوپاسگوزارنو زۆر شت بەرز دەنرخێنن. ئەوان پاریس -یان لەبەر دڵە، ئیسپانیا، ئەوان سەرسامن بە جووتیاران، شەراب، ماسیگرتن، شەڕ لەگەڵ گا، ئەوان زرنگیو زۆڵیەتیو ئازایەتی دەفامن، هەتا گەر بەزمانێکی سادەش بێ تەعبیر لەم حاڵەتانە کراوە.

لەرۆمانەکەی "گراهام گرین"دا هەموو شتێك غەمهێنو سواوە.. تا ئەوپەڕی. بۆمبارانکردنی (لەندەن) هەموو شوێنێکی وێران کردووە، بەردەوام باران دەبارێ، پاڵەوانی رۆمانەکە کە کارەکتەرێکی مێیە بەردەوام دەکۆکێ، ژەمە خۆراکەکان هی ئەوە نین هەرس بکرێن، هەتا دێ خراپتریش دەبێ، خەڵکەکەی وەڕسو بێزارن، یەکدی هەراسان دەکەن، خۆشەویستی مانای خۆی دۆڕاندووەو لەرێی زاراوەو دەستەواژەی (فیزیکی) پێناسە دەکرێ... یان لەرێی تەعبیری پیسو بێزەوەر. کارەکتەرەکان روو لەکڵێسا دەکەن چونکە بەرگەی ئەو ژیانە دۆزەخییە ناگرن. پاڵەوانەکە خۆ بە (بڕوایەکی ئایینی)یەوە دەبەستێتەوە تا ئاستێك کە پتر لە نەخۆشی بچێ تا خواپەرستی بێ، ئەو بەدوای بەزەیی خودا-دا دەگەڕێ، بەڵام کە دێ پتر لەسزا دەچێ.

هەڵبەتە لەدواجاردا مەسەلەکە دەرك کردنە بەشتەکانو حاڵەکان، دیارە وتو وریاییو دەرکردنی "گراهام گرین" لەمەڕ مەسەلە رۆحییەکان، بێگومان، زیاترەو، وردترە لەوەی کە لای "هێمنگوای" هەیە. "هێنری جەیمز" سەبارەت بە کارەکتەرەکانی ناو رۆمانەکان وتوویەتی (ئەوان کە زۆر بەجوانی "هاملێت" و "شالیر" کە هەردووکیان زۆر هوشیارن بەشتەکانی دەوروبەر؛ وادەکا کە ئەزموونی سەرکێشیو ململانێیان تێروپڕو تەواوبێ، دواجاریش لەزەخمی ئەو کارەساتانە زیاتر دەکا کە لە کۆتاییدا رووبەرووی دەبنەوە؛ واتا هوشیاری وا دەکات جەرگبڕانە هەست بەو کارەساتانە بکەن). بەڵام دەرك کردنو وتو وریایی گەلێ دیوی هەیە. ئایینە مەزنەکان هەروەکو فەلسەفە مەزنەکانی دونیا بەشێوەیەکی بەرفراوان زۆر لەو بیروڕایانە، حاڵەتانە رەت دەکەنەوە کە پێشتر هەر خۆیان جەختیان لەسەر کردبوو. ئایینەکانو فەلسەفەکان، هەر خۆیان دوودڵن، لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە پێشتر بڕوایان پێیان هەبووە، یان ئەوەتا نکوڵیان لێ کردووە.

هەرچەند لەرۆمانی "کۆتایی عیشقبازی" یەکە مەرج نییە کە بڕواو ئیمان دژ بە نەخۆشیو لەزەت وەستابێتەوە لەناوئاخنی ئەو جیهانە خوڵقاوەو لەنێو خودی ئەو خۆشەویستییە مرۆڤانەیە. بینینی (مونتانا) یان شەرەگا لەچاوانی "هێمنگوای"، یان سامانەکانی (ناڤاجۆ) یان شوێنە دێرینەکانی (ئیترۆریا) -کە کەوتۆتە رۆژئاوای ئیتالیا- لەچاوانی "دی. ئێچ لۆرانس" وا دەکات کە (بەهاکانی) خوێنەران زیاد بکەن. بەڵام ناکرێ داوا بکرێ لەخوێنەر ئەو هەموو بیروبۆچوونە پڕ لەگومانانەی کە لەرۆمانی

"مـەرگ لـەنیوەرۆ"داو رۆمـانی "فانتازیـای نەست"دا قەبووڵ بکات. وێڕای ئەو شتانەش، زۆر گرنگە کە لەبیرمان نەچێ ئەو وەختەی قسە لەسەر پەیوەندی نێوان ئەدەبو بەهاکان دەکرێ، کە دەبێ خەیاڵ زەدە خۆی لە خۆیدا (بەها) یەکە، بەڵکو بۆخۆی هەم مەبەستەو هەم ئامانج، بەوەی کە داوا رۆحیو فیکرییەکانی نووسەرو هەم خوێنەر تێر دەکات.

دیمۆکراسی وا دامەزراوە کە رێ بدات هەرکەسێك سەربەستانە رۆڵی خۆی ببینێو ئەگەر هەڵبژاردنی ئازادەی شتەکانو حاڵەتەکانو بیروبۆچوونەکانی هەبێ، دیمۆکراسیو فەزای ئازاد وا دەکات کەسەکان بەو بەها جیاوازانەی خۆیانەوە زۆر ئازادانە، بکەونە دوای ئامانجو مەبەستەکانی خۆیان تا بتوانن بیهێننە دی، تاوەکو بواریان هەبێ ئەگەری بەشداری بوونێکی مەزنیان هەبێ بۆ خێرو خۆشی کۆمەڵ. لە راستیدا رۆمان، لەم رووەوە، یارمەتیمان دەدا بەوەی کە بتوانین جوانترو لەچەندین گۆشەنیگای جیاوازەوە شتەکان ببینین، وادەکات هەستو سۆزو بەزەیی، رۆحی بەخشندەییو لێ پرسراوێتی تاکە کەسیمان پڕ زەخمو زیاتر بێ. گەر لە روانگەی مێژووییەوە ئاوڕ لە رۆمان بدەینەوە هەست دەکەین کە سەرهەڵدانی رۆمان بە نەشو نومای رۆحی تاکرەوی (فەردانیەت) پەیوەستە کە لەژێر باڵی دیموکراسیدا پترو پتر رسکاوە، لەسەدەی نۆزدەمیدا پتر گەشەی کردو لەوە دەچێ پێ بەپێ لەسەدەی بیستەمیشدا ئەو پەیوەست بوونی دیمۆکراسیو تاکرەویو گەشەی رۆمان زیاتر وەپێش کەوتبێ.

بەهەرحاڵ، دەکرێ بڵێین بۆ مەسەلەی گەشەو پەرەسەندنی نێودونیای ئەدەب یاسایەکی ئەوەندە زۆر لەبەر دەست نییە. بۆ شێوازو تەکنیکی رۆمان فەزایەکی ئەوەندە فشو فۆڵە کە زەحمەتە یاساو دەستووری رێك دامەزراو پەیڕەو بکەین، لەو فەزا کراوەیەدا ناکرێ دیمەنەکان تاریکتر ببینین لەوەی کە لەسەردەمی نووسینی رۆمانی "تریسترام شاندی"-ی (شێرن)دا هەبوو، یاخود رۆمانی "جودی پەنهان"ی (تۆماس هاردی) لەوە دەچێ رۆمانی (تریسترام شاندی) سەرەتایەك بووبێ بۆ لەناوچوونی شێوازی تەقلیدی رۆمان. لەولاوە رۆمانی "جودی پەنهان" کۆتاییەکی تاریکی بۆ ئەو (فەردانیەتە- تاکرەوییەتی)یە هێنابێ کە لە سەردەمانێکی زۆرتردا رۆمان هەلهەلەی بۆ لێ دەدا.

هەنووکە، لەمیانەی ململانێدا دژ بە (تۆتالیتاریانیزمی کۆمۆنیست)دا کە دەکا دەستەڵاتی رەهاو سەراپاگیری کۆمۆنیستی: سیاسەتو ئایینو فەلسەفە جارێکی دیکە لەهەوڵی ئەوەدان کە سەرلەنوێ مانای فەردانیەت -تاکرەوی- بدۆزنەوە، جەخت لەسەر ئەوە بکەن کە هەرکەسەو لەگەڵ ئەوی دیکەدا جیاوازە، لەهەست کردن بە لێپرسراوێتی ئەخلاقی لەبەرامبەر ئەوانی دیکەدا کەس لەکەس ناچێ، هەتا لەوەشدا جیاوازن کە هەریەکەو توانایەکی هەیە لەمەڕ گۆڕینی چارەنووسی خۆی یان هی نەتەوەکەی. هەر ئەو شتانەیە وادەکات کە فەزایەکی کراوەو گونجاو بۆ نووسینی رۆمان دابمەزرێ. رۆماننووس، لەکۆمەڵگایەکدا کە بڕوای بە -تاکرەوی- هەیە، فەزڵی بەسەر زانایانی کۆمەڵناسەوە هەیە کە دەڕواننە خەڵك کە هەریەکەیان ئەندامی گروپێك بێ. سروشتی هونەری رۆماننوس وا داوا دەکات کە هەموو جۆرە بەگشتی کردنێك (تعمیمات)ێك، هەر بەهایەك، یان هەر کاروکردەوەیەك بخرێنە ژێر

چاودێری‌و تاقیکردنەوەو لۆردبوونەوە بەپێی ئەو مەغزا مانایانەی کە دەیبەخشن بەتاک.

گرفتی تاکڕەوی پابەستە بە هەستکردنی مرۆڤ بە غوربەتو تەنیایی، تاکڕەوی لەو جۆرە هەستانەدا جێگیرە. هەر لەڕێگای "گۆشەنیگا"وە کە ڕەنگدانەوەی هوشیاری‌یە ڕۆماننوس دەتوانێ بەسەر ئەو غوربەتو تەنیایی‌و لێک ترازانەدا زاڵ بێت، کە دیارە بەهەمان شێوە بۆ نووسەری دراماو ژیاننامە (بایۆگرافەر) نارەخسێ. بەدیتنی ژیان لەچاوی کەسێکەوە، هەست کردن بەوەی کە ئەو هەستی پێ دەکات، بە بیرکردنەوە لەو شتەی کە ئەو بیری لێ دەکاتەوە: ئێمە دەتوانین لەماناو بەهای ئەو ئەزموونە حاڵی بین کەئەو کەسە پیایدا تێدەپەڕێ، سەرەڕای ئەو هەموو شتانەش.. کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکان بەتەنیا ئەوە نی‌یە کە کەسانی ڕاستەقینە بن کە خوازراوی ناو ژیانی واقیعین، لەوێ گوێزرابنەوە سەر کاغەز، بەڵکو ئەو کارەکتەرانە کەسانێکن کەلە دەرەوەڕا دەبیندرێن. ئەوان مەزنترن لەوەی کە لەژیاندا هەن، "ڕاستترن لەوەی کە لە واقیعدا هەن" وەك "هاردی" وتوویەتی، ئەوان لەدیدو بەرۆحی نووسەرەوە دەبیندرێن، کە لەگەڵیدا خوێنەر هۆشیارە بەو بەشدارییبوونەو بگرە لەگەڵ نووسەردا دەکەونە داداگایی کردنی کارەکتەرەکان. کەواتە نووسەر لەدەرەوەی پاڵەوانەکانی‌دا ناژی، بەڵکو ژیانیان، کەسایەتیان ڕاستەوخۆ لە نووسەرەوە قەرز دەکەن. "گۆستاف فلوبێر"ی ڕۆماننووس دەمێکە ڕایگەیاندووە "مەدام بۆڤاری منم"

خوێنەری ڕۆمان لەگەڵ کارەکتەرەکان بەشدارە، لەگەڵ ڕووداوەکان تێکەڵە، دەچێتە ناو تان‌و پۆو بنج‌و بناوانی ڕۆمانەکەش. خوێنەر شان بەشانی نووسەر دەڕوابەڕێوە، نووسەریش وا دەکا خوێنەرانی خۆی لەتەك کارەکتەرەکان‌و ڕووداوەکان تێوە بگلێنێ، چ بۆ هەنووکەو چ بۆ ڕابردوو. ڕۆمانەکان‌و کارەکتەرەکان لە ناوەوەی مێژوودا هەن، هەروەها لەدەرەوەش هەر هەن: وەکو کۆمەڵێك سەرچاوەی بابەتیانە کە مەیل‌و هەوڵی ئاسایی ئێمەیەو بۆ تێگەیشتن‌و هەڵسەنگاندن‌و کۆنتڕۆڵ کردنی ئەزموونەکانمان.

"فیلدنگ"ی ڕۆماننووس وتوویەتی "پارێزەرەکەی من هەر ئەوە نی‌یە کە زیندووە، بەڵکو لەوچوار هەزار ساڵەشدا هەروا بووە. کارەکتەرەکانی نێو ڕۆمانەکان جۆرێك لەو کەسانەی تێ دەکەوێ کە دەکرێ بۆ هەمیشە خولقو ئەتوارێکی جێگیریان هەبێ، هەروەها دەکرێ لەو تایپانە بن کە لە حاڵەتێکەوە بگۆڕێن بە حاڵەتێکی تر، واتا لەسەر هەمان ڕەوشت‌و خوو نامێننەوە، هەروەها ئەزموونی جیاواز لە باروزرووفی کۆمەڵایەتی وادا کە لە گۆڕاندا بێ. ئەوان تاکەکان بەگروپەکان دەبەستنەوە بێ ئەوەی داوایان لێ بکرێ قوربانی بە (فەردانیەتی-تاکڕەوی) خۆیان بدەن. ئەوان دەبنە ئامرازێکی سەرەکی بۆ تێپەڕاندن‌و پەڕینەوە لەبازنەو سنووری ئەزموونی تاکە کەسەکان، پاشان زانینی ئەو حەقیقەتەی کە بوونە مرۆڤ چ واتایەك دەگەیەنێ.

ڕەخنەگران لەهەموو قۆناغەکاندا گلەیی‌و گازاندەیان لەو کارەکتەرو کردارانە هەبووە کە ڕۆماننووسە ریالیستی‌یەکان ئیشیان لەسەر کردوون، واتا پاڵەوانەکان‌و ڕووداوەکان زادەی ئەو واقیعە بوون کە نووسەر تیایدا ژیاوە. بەڵام خۆ ڕۆمان فیلی لەواقیع نەکردووە. ڕۆمانیش هەروەك ژیان پڕ لەکەسانی سەیرو سەمەرەو لەڕێلادەر، لەلاتو لەوارو کەسانی پەرپووتو

پەراگەندە، لەکەسانی کێویو دڕندە ئاسا، لەتاوانکارانو خەڵکی لاکەوتەو گۆشەگیرو رەشۆکی، ئەو ساختمانە خەیاڵیەش کە لە ئەدەبی رۆماندا بونیات دەنرێ بۆ قەرزکردن لەژیان ناگاتە کەماڵی ئادەمیەتی خۆی، ناگاتە رۆح پەروەری، ناگاتە دۆخێك کە لەسروشتی ئادەمیانەی زۆر کەسدا بەرجەستە بووە.

لەبەر ئەوەی هەمووان ئەو روانینەیان لەلا گەلاڵە بووە سەبارەت بە بایەخو گرنگی رۆمان، جا گەر ئاگایان لە خۆیان بێ یان نا، بەتایبەتی رەخنەگرانو خەمخۆرانی داهاتووی رۆمان، هەر لەبەر ئەوەشە کە بەئاشکرا دیارە خەڵکێکی یەکجار زۆر پەرۆشی ئەوەن بزانن هەنووکە رۆمان بەچی گەیشتووەو لەداهاتوودا بەکوێ دەگات. ئەمەیان نیشانەیەکی چاکە، بەڵام لەمێژووی رۆماندا هیچ شتێك نییە وامان لێ بکات رەشبین بین، بەتایبەتی ئایندەی رۆمان، تا ئەو کاتەی کە سەربەستیو شکۆمەندیو لێپرسراوێتی تاکەکەس یەکەم خەمی سەرەکی کۆمەڵگا بێ، هیچ ترسێك بۆ داهاتووی رۆمان لەپێشدا نییە. مادامەکێ نووسەران خۆیان بڕوایان وایە کە هێزی ئەوەیان تیایە خولقێنەری (بەهاکان) بن؛ پێویست ناکات لەئایندەی رۆمان بترسن. بەڵکو پێچەوانەی ئەوە راستترە. زۆر هۆو نیشانە هەن کە مرۆڤ گریمانە لەسەر ئەوە بکات رۆماننووسانی نەوەی تازە کە پتر هەست بەرۆحی سەردەمی خۆیان دەکەن، بەخۆشییەوە ئاگاداری ئەوەن کە هونەری رۆمان توانای کردنەوەی دەیەها دەروازەو ئەگەری هەیە، لەداهاتووشدا دەتوانن دەیەها رێگەو شێوەی تازە بدۆزنەوە تاوەکو پیشانی ئێمەی بدەن: بوون بەمرۆڤ چی دەگەیەنێ؛ لەژێر سایەی نەمریدا. بیرمان نەچێ کە رۆمان جۆرە مەعریفەتێکمان پێ دەبەخشێ کە لەوانەیە بەتەنها رۆمان بەو تێریو پڕییە بتوانێ بیبەخشێ.

سەرچاوە:

Highlights Of Modern Literature
Edited by: Francis Brown
A mentor Book First Printing, 1954 Pages (57-61)

# سۆسێرو تیۆرە زمانەوانییەکەی


- فیلیپ رایس و پاتریشا وۆف
- لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد


پێشەکی:-

ئیشەکەی فێردیناند دوسۆسێری زمانناسی سویسری رۆڵێکی زۆر گرنگو پێکهێنەرانەی بینی لەو گۆڕانکاریەی کە لەم دواییەدا تیورەی ئەدەبی بەخۆیەوە بینی. کاریگەری سۆسێر دەوەستێتە سەر تاکە کتێبێك بەناونیشانی (کۆرسێك سەبارەت زمانناسی گشتی) کە تۆماری تیۆرە زناکی‌یەکەیەتی سەبارەت زمان. ئەم کتێبە لەلایەن قوتابیان‌و هاوەڵانی سۆسێرەوە پاش مردنی لەساڵی 1913دا، لەو تێبینی‌یانەی کە لەکاتی پێشکەشکردنی سیمینارەکانیدا لەنێوان ساڵانی 1907 تا 1911، کاتێك لەزانکۆی ژنێف وانە بێژ بووە، گەڵاڵەو ئامادەکراوە.

هەرچەندە سۆسێر ناوبانگی مارکس‌و فرۆیدی نی‌یە، بەڵام لەرووی کاریگەرییان لەسەر ئەو سیستمانەی فکر کە لەسەدەی بیستەمدا سەریانهەڵدا، لەریزی ئەوان دادەنرێت. سۆسێر وەکو فرۆید و مارکس، وا دادەنێت کەسیستم و بونیادە ژێرخانیەکان (Underlying Systems and Structures) بناغەی دەرکەوتنی ئاشکرای دیاردەکان (دەرکەوتەکان) یان پێکهێناوەو مومکینیشیان کردون.

لای مارکس ئەو دەرکەوتنە ئاشکرایە سیستمی پەیوەندی‌یە ئابووری‌و کۆمەلایەتییەکانە: لای فرۆید نەستە (Unconsious): لای سۆسێریش سیستمی زمانە. رادیکاڵترین مانا ناوەکیەکانی ئیشەکەیان ئەو


سۆسێر

ویناکردنە زاڵو مرۆڤ دۆستانەیەی بۆ جیهان هەیە، لەبنەڕەتەوە هەڵدەوەشێنێت بەو پێیەی ئەوان ئەو بۆچوونەی گوایە "مرۆڤ" سەنتەرو سەرچاوەو بنەچەی هەموو مانایەکە لەبناغەوە هەڵدەتەکێنن. کاریگەری سۆسێر لەسەر تیۆرەی ئەدەبی لەبونیادگەریو پاش بونیادگەریدا بەشێوەیەکی بەرچاو بەدەرکەوت، هەرچەندە ئیشەکەی لەوەو پێشتر کاریگەری گەورەی هەبوو بوو و زیاتر لەسەر زمانناسی بونیادگەری بازنەی پراگو ئەنسرۆپۆلۆژیای لیڤیشتراوس.

جێی خۆیەتی بەپرەنسیپە (tenets) سەرەکیەکانی تیۆرەی سۆسێردا بچینەوە بەو پێیەی زەمینەی پێویست بۆ زۆری ئەو تیۆرەیەی لەم کتێبەدا نیشاندراوە، پێکدەهێنێت. سۆسێر بەڵگەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە کە مادەی لێکۆڵینەوە لەزمانناسیدا سیستمی ژێرخانی دراوەکانە (الاعراف) کە لەسایەی سیستمەوە

زناك (sign) (وشە) دەتوانێت مانا ببەخشێت". زمان سیستمی زناکەکانە؛ زناك یەکەی بنەڕەتی مانایە زناك لەدالو مەدلول پێك دێت، دال "وێنەی وشە"یە(wordimage) (بینراو بێت بان بیستراو)، وە مەدلول "بیرۆکەی عەقڵی یان زەینی".

بەم شێوەیە دالی "درەخت" مەدلولێکی هەیە کەبیرۆکەی عەقڵی درەختە (واتە ئەو وێنەیەی لەزەیندا دروستی دەکات – و.ك – ) گرنگە تێبینی ئەوە بکەین کەسۆسێر لێرەدا مەبەستی جیاوازیکردن نییە لەنێوان ناوێكو شتێکدا بەڵکو مەبەستی جیاوازیکردنە لەنێوان "وێنەی وشە"و "بیرۆکەدا (concept)". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دالو مەدلول تەنها لەسەر ئاستی شیکاری قابیلی لێك جیاکردنەوەن، لەسەر ئاستی بیرکردنەوە قابیلی لێك جیاکردنەوە نین ناتوانرێت وێنەی وشە لەبیرۆکە زەینیەکەی جیابکرێتەوە، وە بەپێچەوانەشەوە هەمان شت راستە. یەکەم پرەنسیپی تیۆرەی سۆسێر ئەوەیە کەزناك (هەڕەمەکییە) (واتە پەیوەندییەکی لۆژیکی لەنێوان وشەو ماناکەیدا نییە– وەرگێڕی کوردی). وا چاکە ئەمە لەسەر دوو ئاست رەچاو بکەین: یەکەم لەسەر ئاستی دال، دووەم لەسەر ئاستی مەدلول. لەسەر ئاستی دال، زناك هەڕەمەکییە چونکە پەیوەندیەکی پێویست لەنێوان دالی درەختو مەدلولەکەی بیرۆکە یان وێنەی عەقڵی درەختدا نییە: دەتوانرێت هەر شکڵێکی دەنگییان نوسراو بەکاربهێنرێت بۆ دەلالەتکردن لەدرەخت – بۆ نمونە arbre، baum، arbor یان تەنانەت fnurd(1)

(نمونەیەکە لەلایەن (هۆکس)ەوە بەکارهێنراوە 1977). مەسەلە پەیوەندی نێوان دالو مەدلول مەسەلە دراو (واتە عرف)ە. لەزمانی ئینگلیزیدا وەکو دراو (وەکو عرف) وشەی "tree" (درەخت) دەبەستینەوە بەبیرۆکەی "tree" (درەخت)ەوە. لەم ئاستەدا سروشتی هەرەمەکی زمان زۆربەئاسانی درکی پێدەکرێت. بەلام ئەوەی تێگەیشتنی زەحمەتترەو مانای ناوەکی (ناوکۆیی) جەوهەرییترمان سەبارەت تیۆرەی سۆسێردەخاتە بەردەم، سروشتی هەرەمەکی زناکە لەسەر ئاستی مەدلول.

نەتەنها زمانە جیاوازەکان دالی جیاواز بەکاردەهێنن، بەلکو جیهانی هەستپێکراو بەشێوەی جیاواز دایدەبڕێتو لەڕێگەی زمانەوە - واتە بیرۆکەی دیاریکراوەوە - گوزارشتی لێدەکەن، واتە ئەو زمانە جیاوازانە مەدلولی جیاواز بەکاردەهێنن. ئەو خاڵەی گرنگە لێرەدا درکی پێبکەین ئەوەیە کەزمان پرۆسەیەکی سادەی ناولێنان نییە. زمان بەناولێنانی شتەکانو ئەو بیرۆکانەی بوونێکی واتاداری سەربەخۆیان هەیە، ئیش ناکات. سۆسێر ئاماژە بەوە دەکات کە "...گەر وشەکان وجودی لەوەو بەریان (pre-existing) بنوێنن ئەوا هەموویان کتومت هەمان هاوتایان دەبێت لەماناکانی لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر. بەلام ئەم رایە راست نییە "(1974– لا116) یەکێك لەباوترین ئەو وێنە روونکارییانەی کەبۆ ئەم مەبەستە ئاماژەی پێدەکرێت، شەبەنگی ڕەنگە (colour spectrum). ڕەنگەکانی شەبەنگ لەواقیعدا یەکبەدوا یەك (continuum)یکی بەردەوام پێك دەهێنن (2) لەبەرئەوە، بۆنمونە، ئەو بەشەی شەبەنگەکە لە شینەوە دەست پێدەکاتو دەچێتەوە سەرسوور لەزنجیرەیەك ڕەنگی جیاواز - شین، سەوز، زەرد، پرتەقاڵی، سور - پێك نایەت کەهەریەکەیان سەربەخۆ لەوی دیبوونی هەبێت. شەبەنگ، زیاتر یەکبەدوایەکێکی بەردەوامە کەزمانەکەمان بەشێوازێکی دیاریکراو بەشبەشی دەکات.

هەروەکو چۆن ئەو شێوازەی ئێمە یەکبەدوایەکی ڕەنگەکانی پێ بەشبەش دەکەین شێوازێکی سروشتی نییە (چونکە لەڕاستیدا زمانەکانیتر بەشێوەی جیاواز بەشبەشی دەکەن) هەربەو تەرحە ئەو شێوازەی ئێمە گوزارشتی لەجیهان پێدەکەینو جیهانی پێبەشبەش دەکەین بەشێوازیتر، شتێکی سروشتیو حەتمی نییە. هەرزمانەو بەشێوەیەکی جیاواز جیهان کەرتکەرت دەکات بەمەش وتەزاو بیرۆکەی واتاداری جیاواز بنیات دەنێت. هەندێك جار زەحمەتە درك بەوە بکەین بیرۆکەکان (افکار)ی رۆژانەمان هەرەمەکینو زمان تەنها ناونانێك نییە بۆ شتە لەوەوپێش هەبووەکان (pre-existing). وا دیارە هێند دەقمان بەو جیهانەوە گرتووە کەسیستمی زمانەکەمان بۆی بەرهەمهێناوین کەسروشتی بێت بەلامانەوە - واتە شێوازی راستو دروستو حەتمی بێت بۆ بینینی جیهان. بەلام لۆژیکی تیۆرەی سۆسێر نیشانی دەدات کەجیهانەکەمان لەلایەن زمانەکەمانەوە بۆ بنیاتنراوە، کە "شتەکان" جەوهەری جێگیریان کرۆکی مانای جێگیریان نییە کە لەپێش نواندنی یان وێناکردنی زمانەوانییەوە (linguistic representation) بونیان هەبێت. پاش گەڕانەوە بۆلای شەبەنگی ڕەنگەکان، دەبینین پرتەقاڵی ڕەنگێك نییە بوونێکی سەربەخۆی هەبێت، خاڵێکیش نییە لەسەر شەبەنگەکە، بەلکو

مەودایان روبەرێکە (range) لەسەر یەکبەدوایەکە کە. هەروەها تێدەگەین چۆن بوونی رەنگی پرتەقاڵی پشت دەبەستێت بەرەنگەکانی دەوروبەری.

دەتوانین رەنگی پرتەقاڵی بەوەی کەچی نییە بناسێنین و دیاری بکەین (whatitisno) جەوهەرێك نییە بۆ رەنگ تەنها جیاوازبوون (جیاکاری) "differential" هەیە. دەزانین ئەو رەنگە پرتەقاڵییە، لەبەرئەوەی زەردیان سور نییە. پرتەقاڵی بۆ ماناکەی پشت دەبەستێت بەوەی کە نییە (واتە چ شتێك نییە (what it is not)، واتە ئەو سیستمی جیاوازییەی ئێمە بەکاری دەبەین لەبەش بەشکردنی شەبەنگی رەنگەکاندا، رەنگی پرتەقاڵی بەرهەمدەهێنێت. لای سۆسێر سەرتاسەر زمانەکەمان بەم شێوەیە ئیشدەکات. زمان سیستمێکە لەجیاوازی کەتیایدا هەر رەگەزەو بەسایەی شوێنی جیاوازی لەناو سیستەمەکەدا مانای هەیە.

ئەگەر زناکی "خۆراك" (food) وەربگرین، دەشێت هیچ مانایەك نەگەیەنێت بەبێ بیرۆکەی یان بیرکردنەوە لەوەی غەیری خۆراکە (not food) بۆ کەرتکەرتکردنی جیهان تەنانەت لەسەر ئەم ئاستە خام و سەرەتاییەش پێویستمان بەسیستمێکی جیاوازی هەیە، واتە سیستمێکی دوالیزمی بنەڕەتی خۆراك / غەیری خۆراك (food/not food). زمان نمونەیەکی ئێجگار ئالۆزتری ئەم سیستمە دوالیزمە سادەیەیە. ئەمە پاڵی بەسۆسێرەوە نا جەخت لەسەر سیستمی زمان بکات، چونکە بەبێ سیستم ناتوانرێت وا لەتوخمە سەربەخۆکان (زناکەکان) بکرێت مانا ببەخشن ئەمە جیاوازیکردنێکی گرنگی لێدەکەوێتەوە. جیاوازیکردن لەنێوان زمان (Langue) و ئاخاوتن (Parole). (langue) سیستمی زمانە، سیستمی فۆرمەکانە (رێساکان، دەستورەکان، دراوەکان) ئاخاوتنیش (parole) ئاکاری فیعلی قسەکردن دەگەیەنێت کە (langue) سیستمی زمان مومکینی کردووە. وتەکان (utterances) زۆرو جۆراوجۆرن و هیچ زمانناسێك ناتوانێت لەهەموویان تێبگات. ئەوەی زمانناسان توانیویانە بیکەن لێکۆڵینەوەی ئەوەبووە چی مومکینی کردوون - کەئەویش سیستمی شاراوەو ژێرخانییە، یان کۆمەڵێك دراوە (conventions). سۆسێر جیاوازیکردنێکی‌تر زیاد دەکات، جیاوازیکردن لە نێوان لایەنی سینکرۆنی و دایکرۆنی(3). لایەنی سینکرۆنی لایەنی بونیادگەریانەی زمانە، واتە سیستەمەکە لەساتەوەختێکی دیاریکراو دا، لایەنی دایکرۆنی پەیوەندی بەمێژووی زمانەوە هەیە - واتە ئەو گۆرانانەی کە لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا بەسەر فۆرمەکان و دراوەکانیدا دێت. لەبەرئەوەی زناکەکان کرۆکێکی جەوهەری مانایان نییە ئاوالآن بۆ گۆران، لەگەڵ ئەوەشدا، بۆئەوەی زناك "مانابەخشێت" پێویستە لەناو سیستمێکدا بوونی هەبێت، سیستمێك کە لەهەر ساتەوەختێکدا کامڵ بێت. ئەمە وای لەسۆسێر کرد جەخت لەسەر ئەوە بکات کەمادەی گونجاو بۆ لێکۆڵینەوە لەزمانناسیدا سیستمی زمانە (langue) (ئەو سیستەمەی کەهەریەکێك لەئاکارەکانی قسەکردنی مومکین کردووە) لەلایەنە سینکرۆنییەکەیەوە. بەشی هەرەزۆری ئەو بەشەی هەڵمانبژاردووە بۆئەوەی ئیشەکەی سۆسێر بنوێنێت لەسروشتی هەرەمەکی مەدلول و ئەو لایەنەی مانای زناك کەلەسایەی شوێنەکەیەوە لەسیستمدا هەیەتی، دەکۆڵێتەوە.

**فێردیناند دو سۆسێر،**

**لەکتێبەکەی؛ کۆرسێك لەسەر زمانناسی گشتی**

1- *زمان وەکو بیرۆکەیەکی رێکخراوی وا بەستە بەدەنگەوە:*

بۆ سەلماندنی ئەوەی زمان تەنها سیستمێکە لەبەهای پەتی ئەوەندە بەسە ئەو دوو رەگەزە رەچاوبکەین کەبەشدارن لەئیشکردنیدا: بیرۆکەکان (ideas) و دەنگەکان (sounds). **لەڕووی سایکۆلۆژیەوە بیرکردنەوەمان - بەچاوپۆشیکردن لەدەربڕینی بەوشە - تەنها** بارستاییەکی بێشکڵو شێوەو لەجیاکردنەوە نەهاتوە. فەیلەسووفانو زمانناسان هەمیشە لەسەرئەوە کۆك بون کەبەبێ یارمەتی زناکەکان ناتوانین جیاوازیکردنێکی روونو جێگیر لەنێوان دوو بیرۆکەدا بکەین. بەبێ زمان، بیرکردنەوە سەدیمێکی تەمومژاویو شوێن ونە. بیرۆکەی لەوەوبەر هەبوو (pre-existing) نییەو هیچ شتێك روونو ئاشکرا نییە بەر لەسەرهەڵدانی زمان.

ئایا لەبەرامبەر مەملەکەتی بێسەروبەر (floating)ی بیرکردنەوەدا، دەنگەکان بۆ خۆیان **قەوارەی لەوەوبەر دیاریکراو** (predelimted) بەرهەمدەهێنێت (واتە دەلالەت لەشتێك دەکەن کەپێشتر دیاریکرابێت - و.ك - ) نەخێر، دەنگەکانیش وەکو بیرۆکەکان وان لەولایەنەوە. مادەی دەنگی لەبیرکردنەوە جێگیرترو سنوردارتر نییە ئەو مادە دەنگیە قاڵبێك نییە کەدەبێت بیرکردنەوە بەپێویست (بالضرورة) دابڕژێتە ناویەوە، بەڵکو مادەیەکی لاستیکییە (plastic) کەئەمیش دابەشبووە بەچەند بەشێکی جیاوە بۆ دابینکردنی (دەستەبەرکردنی) ئەو مەدلولانەی بیرکردنەوە پێویستی پێیانە. کەواتە لەمەوە دەتوانرێت راستی زمانەوانی سەراپاگیرانە وێنا بکرێت کەدەڵێین راستی زمانەوانەی سەراپاگیرانە - واتە زمان - وەکو زنجیرەیەك لە لقە دابەشبونی تەریب کەلەسەر هەردوو ئاستی دیارینەکراوی بیرۆکە تێکەڵ و پێکەڵەکان (أ) و ئاستی بەهەمان رادە تەمومژاوی دەنگەکان (ب)، دیاریکراوە. ئەم هێڵکاریە بەنزیکی فیکرەیەکمان دەربارەی دەداتێ:-

ڕۆڵی جیاکەرەوەی زمان بەنیسبەت بیرکردنەوە وە دروستکردنی ئامرازێکی دەنگی ماددی نییە بۆ گوزارشتکردن لەبیرۆکەکان بەڵکو ڕۆڵی ئامرازێکی پەیوەندی دەبینێت لەنێوان بیرکردنەوەو دەنگدا، لەژێر چەند هەلومەرجێکدا کەبەپێویست دیارکردنو جیاکردنەوەی ئاڵوگۆڕی (متبادل)یەکەکانی (واتە دەنگو بیرکردنەوە) لێیدەکەوێتەوە. (4) بیرکردنەوە کەخۆی سروشتێکی بێسەروبەری هەیە، لەپرۆسەی هەڵوەشانیدا رێکخراوی بەخۆیەوە دەبینێت. نەبیرۆکەکان شکڵێکی ماددیان دراوەتێ نەدەنگەکانیش گۆڕاون بۆ قەوارەی عەقلی و ئەو راستییەی تاڕادەیەك تەمومژاوییە ئەوەیە کە"بیرکردنەوە دەنگ" زیاتر دابەشبون لەخۆدەگرێت، وە کەزمان لەکاتی شێوەگرتنیدا لەنێوان دوو بارستایی بێشێوەدا یەکەکانی بەرهەم دەهێنێت. ئەو هەوایە بهێنە بەرچاوت کەبەر رووی ئاوێك دەکەوێت؛ ئەگەر پەستانی کەش بگۆڕێت رووی ئاوەکە دابەشدەبێت بۆ زنجیرەیەك دابەشبون؛ واتە شەپۆلەکان لە (یەککگرتن)، یان پەیوەستبونی نێوان بیرکردنەوەو مادەی دەنگی دەچن. دەکرێت زمان بەپانتایی وتەکان (articulations) ناوزەدبکرێت، بەبەکارهێنانی وشەکە (وتەکان) بەپێی پێناسەکەی لەوەو پێشتری. هەر رەگەزێکی زمانەوانی ئەندامێکە، وتە

(articulus)یەکــــە، کــــەتیایدا بیرۆکەیــــەك لــەدەنگێکدا، جێگــیرکراوەو دەنگێکیــش بــووە بەزناك (sign) بۆ بیرۆکەیەك.

هــەروەها دەتوانرێت زمـان بەپـەڕە کاغـەزێك بــــەراوورد بکرێـــــت؛ کەبیرکردنـــــەوە رووی پێشـــەوەیەتیو دەنگیـــش رووی پشـــتەوەی؛ ناتوانرێت رووی پێشەوەی بدڕێنرێت بەبێدڕاندنی رووی پشتەوەی لەهەمان کاتدا؛ بەهـەمان شێوە لـەزماندا نـــاتوانرێت نــەدەنگ لەبیرکردنـــەوەو نەبیرکردنەوە لــەدەنگ دابـڕدرێت. تەنها لەسـەر ئاستی ئەبستراکت دەکرێت ئـەم دابڕینـە ئـەنجام بدرێت، وە بەرەنجامی ئەو دابڕینـەش یـان تەنـها سایکۆلۆژی دەبێت، یان تەنها فۆنۆلۆژی.

کەواتـە زماننـاسـی لـەو ناوچـە سـنوریانەدا ئیشــدەکات کــەتیایدا رەگــەزەکانی دەنــگو بیرکردنــەوە یەکدەگرنــەوەو یــەکگرتنیان فــۆرم (شـکڵ) بەرهــەمدەهێنێت نــەوەك مـاددە. ئـەم دیدوبۆچوونانـە تێگەیشـتنێکی باشـتر دەبەخشـن سـەبارەت بـەوەی پێشـتر لەسـەر هەڕەمـەکێتی (arbitrariness) زناکـەکان وتـرا. تەنـها ئـەو دوو پانتاییـیـەی راسـتی زمانــەوانی پێکـــەوەیان دەبەسـتێت بێشـێوەو بێسـەروبەرنین، بـەڵکو هـەڵبژاردنی دەنگێك بۆئـەوەی ببێت بــەناو بـۆ بیرۆکەیـەك کـارێکی تـەواو هەڕەمەکییـە. ئەگـەر ئەمە راست نەبوایە ئەوا لەپایەی بیرۆکەی بـەهای دەهێنایـەخوارێ، چونکـە ئـەوکات رەگــەزێکی لــەدەرەوە ســەپێنراوی لــەخۆدەگرت. بــەڵام لەواقیعدا بــەهاکان تـەواو بـەرێژەیی دەمێننـەوە. هــەر لەبەرئەوەشــە پــەیوەندی نێـوان دەنـگو بیرۆکە بەشێوەیەکی جەوهەریی هەڕەمەکییە.

سروشـتی هەڕەمــەکی زنـاك بــەرۆڵی خــۆی ئــەوەمان بـۆ لێکدەداتــەوە بۆچـی تەنـها واقیعـی کۆمەڵایـەتی (social fact) دەتوانێـت سیسـتمی زمانەوانی بخولقێنێت. کۆمەڵگە شتێکی پێویستە بۆ دانـانی ئـەو بەهایانـەی کەلەهـەبونیاندا تەنـها قـەرزارباری بـەکارهێنانو پێکـهاتنی گشـتین یـان رازی بونـی گشـتین (general acceptance): تاکـە کەس بەتەنها خۆی نـاتوانێت تەنـها یـەك بـەهاش جێگیربکـات. وێـڕای ئــەوەش بیرۆکــەی بــەها، هــەروەکو پێناســە کــرا، ئــەوە نیشــان دەدات کەلەقەڵەمدانی رەگــەزێك تەنـها وەکـو یـەکگرتنی نێـوان دەنگێکـی دیـاریکراو لەگــەڵ بیرۆکەیـەکی دیــاریکراودا، کــارێکی ئێجگــار رێهەڵەکـــەرە (misleading) پێناسـەکردنی بـەم تەرحـە ئـەو رەگەزە لەسیستمەکەی دادەبڕێت: ئەمـەش ئـەو گریمانەیـــە دەگەیـــەنێت کـــەدەتوانین لەرەگەزەکانـــەوە دەســـت پێبکـــەینو بەکۆکردنەوەیان پێکەوە سیستمەکەیان لێبنیات بنێـین لـەکاتێکدا بەپێچەوانـەوە، دەبێـت لــەو گشتەوە (whole) دەست پێبکـەین کەبەشـەکانی پشـتیان بەیـەکتر بەسـتووەو لـە رێگــەی شیکردنەوەوە رەگەزەکانیمان بەدەست بکەوێت.

بۆ پەرەپێدانی ئـەم تێزەیـە، بـەها بەشێوەیەکی یـەك لـەدوای یـەك لەگۆشـە نیگـای مـەدلول یـان بیرۆکە (بەشی2)و دال (بەشی 3)و زنـاکی تـەواوە (بەشی 4) دیراسە دەکەین.

لەبەرئەوەی ناتوانین راستـەوخۆ بوونـی (یان یەکە کۆنکرێتییەکانی) زمانمان بەچنگ بکەوێت، ئیش لەسەر وشـەکان دەکـەین. هەرچـەندە وشـە لەگـەڵ پێناسـەی یەکـەی زمانـەوانیدا تـەواو وێـك نایەتەوە، بەڵام لانـی کـەم تاڕادەیـەك لێکچونێك هەیـە لـەنێوانیانداو خەسـڵەتی ئەوەشـی هەیـە کەکۆنکرێتییە. لێرەشەوە وشەکان وەکـو نمونـە (نمــوذج)ی هاوتـــای رەگـــەزی راســـتەقینە.

لەسیستمێکی سینکرۆنیدا، بەکاردەهێنین و ئەو پرەنسیپانەش سەبارەت وشەکان دەیانهێنێتە ئاراوە، بەشێوەیەکی گشتی بۆ قەوارەکان کاری پێدەکرێت.

*2- بەهای زمانەوانی لەگۆشە نیگایەکی فیکرییەوە*

کاتێك قسە لەسەر بەهای وشەیەك دەکەین، بەگشتی یەکەم شت بیر لەو خەسڵەتەی دەکەینەوە کەبیرۆکەیەك دەنوێنێت، وە ئەمە لەراستیدا یەك روی بەهای زمانەوانییە. بەڵام ئەگەر ئەمە راست بێت، چۆن بەها (value) لەدەلالەتکردن (signification) جیاواز دەبێت؟ دەکرێت هەردوو وشەکە ئاوەڵواتا (مرادف) بن؟ پێم وانییە، هەرچەندە تێکەڵکردنیان ئاسانە، بەوپێیەی تێکەڵکردنیان هێندەی لەوردیی جیاوازیکردنی نێوانیانەوە دروست دەبێت ئەوەندە لە لێکچوونیانەوە دروست نابێت.

بێگومان بەها، لەگۆشەنیگایەکی فیکریانەوە، یەك رەگەزی دەلالەتکردنە، وە زەحمەتە تێبگەین چۆن دەکرێت دەلالەتکردن پشتبەستووبێت بەبەهاو جیاوازیش بێت لێی. بەڵام دەبێت یان مەسەلەکە یەکلابکەینەوە یان رسبیك بکەین بەکورتکردنەوەی زمان بۆ پرۆسەیەکی ناولێنانی سادە.

با یەکەم شت دەلالەتکردن وەربگرین بەوشێوە گشتییەی تێیگەیشتووین و بەوشێوەیەی لەلاپەڕە 67دا وێناکراوە. هەروەکو تیرەکانی وێنەکە نیشانیدەدات، دەلالەتکردن تەنها هاوتای بەرامبەری وێنە دەنگییە (soundimage) کەیە. کاتێك سەیری وشەکە دەکەین، وەکو قەوارەیەکی سەربەخۆو لەخۆدا تەواو (self– contained)، هەرچی روودەدات پەیوەندی بەوێنە دەنگییەکەو بیرۆکەکەوە هەیە.




بەڵام موفارەقەکە لێرەدایە: لەلایەکەوە بیرۆکە وا دیارە هاوتای بەرامبەری وێنەی دەنگی بێت، لەلایەکی تریشەوە زناك لەخۆیداو بەدەوری خۆی هاوتای بەرامبەری زناکەکانی تری زمانە.

زمان سیستمی رەگەزە پشت بەیەکتر بەستووەکانە کەتیایدا هەر رەگەزێك تەنها لەئەنجامی ئامادەی هاوزەمانی رەگەزەکانی ترەوە بەهای دەبێت، هەروەکو لەهێڵکارییەکەدا نیشاندراوە.




کەواتە چۆن بەها لەگەڵ دەلالەتکردن، واتە هاوتای بەرامبەری وێنەی دەنگی، تێکەڵ دەکرێت؟ وا دیارە مەحاڵە ئەو پەیوەندیانەی بەتیرە ئاسۆییەکان نوێنراون بەو پەیوەندییانەی **بەهێڵە ستونییەکان نوێنراون، بچوێنرێن.** بەشێوەیەکیتر دەری‌ببڕین - جارێکیتریش هەمان نمونەی لاپەڕە کاغەزەکەی کرا بەدوو بەشەوە وەردەگرین (لا..) ئاشکرایە ئەو پەیوەندییە قابیلی تێبینیکردنەی لەنێوان لاپەڕەی أ، ب، ج، د .. هتد دا هەیە جیاوازە لەو پەیوەندییەی لەنێوان رووی پێشەوەو پشتەوەی هەمان لاپەڕەدا هەیە هەروەکو أ/أ: ب/ب ... هتد

بۆ یەکلاییکردنەوەی مەسەلەکە، با لەسەرەتاوە بڵێین تەنانەت لەدەرەوەی زمانیشدا هەموو بەهاکان وادیارن بکەونە ژێر رکێفی هەمان

پرەنسیپی موفارەقەوە. هەمیشە بەهاکان پێکهاتون لە:

(1)شتێکی ناچونیەك (جیاواز) dissimilar کەدەتوانرێت بگۆڕدرێتەوە بەو شتەی کەبەهاکەی بۆ دیاریدەکرێت.

(2) شتێکی چونیەك (لێکچو) Similar کە دەتوانرێت بەراووردبکرێت، بەو شتەی کەبەهاکەی بۆ دیاریدەکرێت.

هەردوو فاکتەرەکە پێویستن بۆ بوونی بەها. کەواتە بۆ دیاریکردنی نرخی پارەیەکی ئاسنی پێنج فرانکی پێویستە بزانین:

1- کەدەتوانرێت بەبڕێکی جێگیر لەشتێکی جیاواز بگۆڕدرێتەوە، بۆ نمونە بەنان.

2- کەدەتوانرێت بەبەهایەکی چونیەکی هەمان سیستم بەراووردبکرێت، بۆ نمونە بەپارەیەکی ئاسنی یەك فرانکی، یان بەپارەی ئاسنی سیستمێکیتر (دۆلار .. هتد). بەهەمان شێوە دەتوانرێت وشە بەشتێکی ناچونیەك: بیرۆکەیەك، بگۆڕدرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت بەشتێك بگۆڕدرێتەوە کەهەمان سروشتی ئەوی هەبێت، واتە وشەیەکیتر. کەواتە مانای بەها بەو مەرجە دیارینەکرێت یەکێك بێتو بەسادەیی بڵێت دەتوانرێت بە بیرۆکەیەکی دیاریکراو بگۆڕدرێتەوە: واتە دەلالەت یان ئەوە دەلالەتەی هەیە، بەڵکو دەبێت بەبەهای چونیەکی تریش بەراوردی بکات، بەوشەی تریش کەلەبەرامیەریدا هەن.

لەواقیعدا، ناوەڕۆکەکەی تەنها بەهاوزەمان هەبوونی هەموو ئەو شتانەی لەدەرەوەی ئەودا بونیان هەیە جێگیردەکرێت. بەوپێیەی بەشێکە لەسیستمێك دەلالەت تەنها شت نییە کەهەیەتی، بەڵکو هەروەها بەتایبەتی، بەهایەکیشی هەیە، ئەمەش مەسەلەیەکی تەواو جیاوازە.

چەند نمونەیەکی کەم بەڕوونی راستی ئەم قسەیە نیشان دەدات. وشەی (mouton)ی فەرەنسی دەکرێت بەمانا مۆدێرنەکەی هەمان دەلالەتی وشەی (sheep)ی ئینگلیزی هەبێت، بەڵام نەك هەمان بەها، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك بەتایبەتی لەبەرئەوەی کاتی قسەکردن لەسەر پارچە گۆشتێك کەئامادە دەبێت بۆ پێشکەشکردن لەسەر خوان لەئینگلیزیدا mutton بەکاردەهێنرێت نەوەك (sheep). هۆی جیاوازی بەهای نێوان (sheep)و(mouton) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستی‌یەی کەوشەی (sheep) لەگەڵ خۆیدا رەگەزێکی دوەمی هەیە (mutton)، لەکاتێکدا وشە فەرەنسی‌یەکە نیەتی.

لەناو هەمان زماندا، هەموو ئەو ووشانەی بەکاردەهێنرێن بۆ گوزارشتکردن لەو بیرۆکانەی پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە، بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕانە سنور بۆ یەکتر دادەنێن: ئاوەڵواتا فەرەنسی‌یەکانی وشەی فەرەنسی (redouter) "تۆقین" (craindre) "ترس"، و (avoirpeur) "بترسێت" یان "ترسان" تەنها لەهەبونیاندا لەبەرامبەر یەکدا بەهایان هەیە: ئەگەر (redouter) (واتە تۆقین) نەبوایە ئەوا هەموو ناوەڕۆکەکەی دەرۆشتە لای بەرامبەرەکانی. بەپێچەوانەشەوە هەندێك وشە لەڕێگەی پەیوەستبونیان بەوشەی ترەوە دەوڵەمەند دەبن، بۆ نمونە ئەو رەگەزە نوێیەی کەلەوشەی decrepi (واتە پیر - پەککەوتە)دا هەیە (decrepi unvieillard) (پیاوێکی پیر، پەککەوتە) - لەئەنجامی هاوکات هەبوونی وشەی decrepi "داڕوخاو" دروست بووە - un mur decrepi (دیوارێکی داڕوخاو). بەم شێوەیە بەهای هەر رەگەزێك بەپێی دەوروبەرەکەی دیاری دەکرێت. تەنانەت دیاریکردنی بەهای ئەو وشەیەی دەلالەت

لە"خۆر" دەکات مەحاڵە بەبێ رەچاوکردنی دەوروبەرەکەی بەپلەی یەکەم: لەهەندێك زماندا ناشێت بڵێین "لەخۆرەکەدا دابنیشە".

هەموو ئەو شتانەی سەبارەت وشە وترا بەسەر هەر رەگەزێکی زماندا پراکتیزە دەبێت، بۆ نمونە قەوارە گرامەرییەکان (Grammatical Entities). بەهای "کۆ" لەفەرەنسیدا، هەمان بەهای "کۆ" ی نییە لەسانسکرێتیدا هەرچەندە عادەتەن دەلالەتیان کتومت وەکو یەکە: چونکە لەسانسکریتیدا لەباتی، 2فۆرم، 3فۆرم، هەیە بۆ دەلالەتکردن لەژمارە: (چاوەکانم، گوێیەکانم، باڵەکانم، قاچەکانم.. هتد ئەمانە دووانەن (مثنى): (ئەم حاڵەتە سەبارەت زمانی عەرەبیش راستە کە تاکو دووانەو کۆ (مفرد، مثنى، جمع) یان هەیە (و. ك): کەواتە پێدانی هەمان بەها بۆ فۆرمی کۆ لەسانسکرێتیو فەرەنسیدا کارێکی هەڵەیە: چونکە بەهاکەی بەشێوەیەکی ئاشکرا پشت دەبەستێت بەوەی لەدەرەوەو دەوروبەریدا هەیە.

ئەگەر وشەکان بیرۆکەی لەوەپێش هەبوویان (preexisting) بنواندایە، ئەوا کتومت هەمان مانایان دەبوو لەزمانەکاندا، بەڵام ئەمە وانییە. لەزمانی فەرەنسیدا گوزارەی "louer une maison" بەکرێدانی خانوو بەبێ جیاوازیکردن بۆ "بەکرێدان"، "بەکرێگرتن" بەکاردەهێنرێت، لەکاتێکدا، لەزمانی ئەڵمانیدا دوو وشە بەکاردەهێنرێت mieten و vermieten: ئاشکرایە بەهاکان دەقاودەق وەکو یەك نین. هەردوو فرمانی (urteilen)و (schatzen) لەچەند دەلالەتێکدا هاوبەشن، بەڵام ئەم جووتبونە لەچەند خاڵێکدا راست دەرناچێت.

ئیعراب "inflection" چەند نمونەیەك دەخاتەروو کەبەشێوەیەکی تایبەت سەرنج راکێشن. جیاوازیکردنی کات، کەئێمە چەند پێی ئاشنایین، لەچەند زمانێکی دیاریکراودا نازانرێت. زمانی عیبری تەنانەت جیاوازی لەنێوان کاتە بنەرەتییەکانی رابردوو (past)و رانەبردوو یان ئێستا (present)و داهاتوو (future) داناکات. ئەڵمانی سەرەتایی فۆرمێکی تایبەتی نییە بۆ گوزارشت کردن لە داهاتوو، وەهەڵەیە بڵێین داهاتوو لەو زمانەدا بەفۆرمی رانەبردوو گوزارشتی لێدەکرێت، چونکە بەهای رانەبردوو لەزمانی ئەڵمانیداو لەو زمانانەدا کەشانبەشانی رانەبردوو داهاتوشیان هەیە، هەمان بەها نییە. زمانە سلاڤیەکان جیاوازی لەنێوان دوو فۆرمی زماندا دەکەن، فۆرمی تەواو (صيغة التام perfective) کە تەواوبونی کردار دەنوێنێت لەخاڵێکی زەمەنی دیاریکراودا، وە ناتەواو (رانەبردوو) (غير تام imperfective) کە کردارەکە دەنوێنێت وەکو ئەوەی ئێستاو پێبەپێی تێپەربوونی کات لەڕوودانددا بێت. زەحمەتە بۆ کەسێکی فەرەنسی لەم رێسایانە تێبگات، چونکە لەزمانی فەرەنسیدا نین. ئەگەر لەوەوپێش دیاریکراو بونایە، ئەوا ئەوەی وتمان راست نەدەبوو (واتە کەسێکی فەرەنسی لێی دەگەیشت - و.کوردی). کەواتە لەهەموو ئەو نمونانەی باسیان لێوەکرا تێدەگەین لەباتی هەبوونی بیرۆکەی لەوەو پێش هەبوو، بەهابوونی هەیە کەلەسیستمەوە سەرچاوە دەگرێت. کاتێك دەڵێین لەگەڵ بیرۆکەکاندا جووت (مطابق) ن، ئەوە دەگەیەنێت کەبیرۆکەکان تەواو جیاکارین (differential) "جیاوازن" و بەناوەڕۆکە ئیجابییەکەیاندا دیاری ناکرێت بەڵکو سلبیانە بەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ رەگەزەکانیتری هەمان سیستمدا دیاریدەکرێت. ووردترین خەسڵەتیان لە جیاوازبونیاندایە لەوانیتر.

ئێستاش لێکدانەوەی راستەقینەی هێڵکاری زناك ڕووندەبێتەوە.




بەم شێوەیە، ئەم هێڵکارییە ئەوە دەگەیەنێت کە لەزمانی فەرەنسیدا بیرۆکەی "دادوەریکردن" بەستراوە یان پەیوەستە بەوێنەی دەنگی "juger" ەوە: بەکورتی، دەبێت بەهێما بۆ دەلالەت. بەڵام ئاشکرایە، وەکو سەرەتا، بیرۆکە هیچ نییە، واتە تەنها بەهایەکە کەبەهۆی پەیوەندییەکانییەوە لەگەڵ بەها چونیەکەکانی تردا، دیاریکراوە، وە کەبەبێ ئەوان دەلالەت بوونی نەدەبوو. گەر بەسادەیی بڵێم کەوشەیەك دەلالەت لەشتێك دەکات، وەلەهەمان کاتیشدا پەیوەستبوونی وێنەیەکی دەنگیم بەبیرۆکەیەکەوە لەخەیاڵدا بێت، من لەو حاڵەتەدا تەسریحێك دەدەم کە پێدەچێت ئاماژە بەوشتە بکات کەبەفیعلی رودەدات بەڵام بەهیچ جۆرێك گوزارشت لەراستی زمانەوانی ناکەم لەجەوهەرو پراوپڕێتییەکەیدا.

*3- راستی زمانەوانی لەگۆشە نیگایەکی ماتەریانەوە:-*

لایەنی فیکری بەها تەنها لەو پەیوەندیو جیاوازیانە پێك دێت کەلەگەڵ رەگەزەکانی تری زماندا هەیەتی، دەتوانرێت هەمان شت سەبارەت لایەنە ماتەریەکەشی بوترێت. ئەوەی گرنگە لەوشەدا تەنها دەنگەکە نییە، بەڵکو ئەو جیاوازییە دەنگییانەیە کەجیاکردنەوەی وشەکە لەهەموو وشەکانیتر مومکین دەکات. چونکە جیاوازی دەلالەت هەڵدەگرێت.

پێدەچێت ئەمە سەرسوڕهێنەرو دیاربێت، بەڵام ئەی بەراست چۆن پێچەوانەکەی مومکین دەبێت؟ بەوپێیەی هیچ وێنەیەکی دەنگی (Vocal image) لەوێنەیەکی دەنگیتر گونجاوتر نییە بۆ ئەو مانایەی ئەوی بۆ تەرخانکراوە گوزارشتی لێبکات، ئاشکرایە، تەنانەت پێش وەخت ئاشکرایە. کە لەدوا شیکردنەوەدا، دەردەکەوێت کەهیچ بەشێك لەزمان هەرگیز ناتوانێت پشت بەستووبێت بەهیچ شتێك جگە لەپشت بەستنی بەتەبا نەهاتنەوەی (جووت نەبوونی) "عدم التطابق" لەگەڵ بەشەکانی تردا. هەرەمەکێتیو جیاوازبوون دوو خەسڵەتی پێکەوەگرێدراون.

گۆڕانی زناکە زمانەوانییەکان بەباشی ئەمە روون دەکاتەوە. بەکورتی لەبەرئەوەی هەردوو رەگەزی أ و ب لەجەوهەردا ناتوانن بگەنە ئاستی هەست چونکە ئێمە تەنها هەست بەجیاوازی أ/ب دەکەین بۆیە هەر رەگەزێکیان ئازادن لەگۆڕاندا بەپێی ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بەوەزیفەی دەلالەتکردنی ئەو رەگەزەوە نییە. (مەسەلەی گۆڕانی زناکەکان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەدرێژی لەکتێبەکەیدا باسی لێوەکراوە - و. کوردی) هیچ نیشانەیەکی تایبەت نییە ناوی کۆی مەجرور (جمع مجرور)ی zen لەزمانی چیکیدا جیایکاتەوە (مەبەستی لەنیشانەی ئیعرابە - و. کوردی)، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو فۆرمی Žen: Žena بەهەمان شێوەی دوو فۆرمە کۆنەکە zenb: zen ئیش دەکەن کەواتە zen تەنها لەبەرئەوەی جیاوازە بەهای هەیە (5)

ئەمەش نمونەیەکی ترە کەبەشێوەیەکی رونتر رۆڵی سیستمیانەی جیاواز بەدەنگییەکان نیشاندەدات، لەزمانی گریکیدا ephen فۆرمێکی تەواو نەبووە (غیر مکتمل)و (esten) رابردووی سادەیە هەرچەندە هەردوو فۆرم بەهەمان شێوە دارێژراون: یەکەمیان سەر بە رانەبردوی گوزارە (المضارع الخبري)ە (phemi)، (واتە ئەڵێم)

لەکاتێکدا فۆرمی رابردووی (stemi) بوونی نیە. بەکورتی پەیوەندی phemi :ephen کەجووت دەبێت لەگەڵ پەیوەندی نێوان تەواو نەبوو (غیر مکتمل)و رانەبردوودا (سەرنجی deiknumi:edeikum هی تریش جگە لەوان، بدە).

کەواتە زناکەکان لەرێگەی بەها ناوکۆییەکانیانەوە ئیش ناکەن بەڵکو لەرێگەی مەوقیعی رێژەییانەوە.

سەرەرای ئەوەش، مەحاڵە دەنگ بەتەنها، کەرەگەزێکی ماتەرییە (ماددییە)، سەر بەزمان بێت. دەنگ تەنها شتێکی لاوەکییە (ثانوي)، ماددەیەکە بۆ بەکارهێنان. هەموو بەها ترادیسۆنیە (تقلیدی)ەکانمان خەسڵەتی ئەوەیان هەیە کەلەگەڵ ئەو رەگەزە بەرجەستە (ملموس)یەدا تێکەڵ نەکرێن (واتە جیاوازبن) کەراگیری کردوون. بۆ نمونە، ئەوەی بەهای پارەیەکی ئاسن دیاریدەکات ئەو کانزایانە نییە کە لێی دروستکراوە. پێدەچێت ئەو پارە ئاسنەی کەبەها ئیسمییەکەی (واتە کەلەسەری نوسراوە و. ك) پێنج فرانکە، لەنیوەی نرخەکەی خۆی کەمتر زیوی تێدابێت. بەهاکەی، بەپێی ئەو برەی لەسەری نوسراوەو بەپێی بەکارهێنانی لەناوەوەی یان لەدەرەوەی سنورێکی سیاسیدا دەگۆرێت. ئەمە سەبارەت دالی زمانەوانی راستتر دەکەوێتەوە، کە لەدەنگ پێك نایەت بەڵکو مەعنەوییە – لەهیچ گەوهەرێکی ماتەری (material subsiance) پێکنەهاتووە بەڵکو لەو جیاوازییانەی کەوێنە دەنگییەکەی لەهەموو ئەوانیتر جیادەکاتەوە.

ئەو پرەنسیپەی باسی لێوەکرا هێندە بچینەییە کە بەسەر هەموو رەگەزە مادییەکانی زماندا پراکتیزە دەبێت، لەوانە فۆنیمەکان (phonemes). هەموو زمانێك یەکەکانی لەسەر بناغەی سیستمێك لەرەگەزی دەنگی وشەکانی دادەرێژرێت، کەتیایدا هەر رەگەزێك یەکە یەکە بەروونی دیاریکراوە (سنوری بۆ دیاریکراوە)و بەشێکە لەژمارەیەکی جێگیر لەیەکە (Unit). فۆنیمەکان بەو خەسڵەتە تایبەتەیان جیاناکرێنەوە هەروەکو وای بۆدەچین – بەڵکو تەنها بەو راستیەی کەجیان لەیەکتر.

فۆنیمەکان بەر لەهەموو شتێك قەوارەی بەرامبەریەك (متقابل)و رێژەییو سلبین.

بەڵگەی ئەمەش ئەو سەربەستییەیە کەقسەکەر هەیەتی لەخاڵەکانی لێك نزیك بونەوە (نقاط الالتقاء) یاخود پێککەیشتن لەگۆکردن (pronunciation)ی دەنگە جیاوازەکاندا. بۆ نمونە لەزمانی فەرەنسیدا بەکارهێنانی گشتی خەاڵ بۆ x ی دۆرسال (dorsal) (6) (واتە بە(غ) – و. کوردی) نەبوەتە رێگر لەبەردەم زۆر لەقسەکەران بۆ گۆکردنی بە لەراندنەوەی سەری زمان (واتە بە (ر) – و. کوردی)، ئەمە بەهیچ جۆرێك نابێتە هۆی شێواندنی زمان – زمان تەنها پێویستی بەوە هەیە دەنگەکە جیاواز بێت، نەوەك – کەپێدەچێت هەبێت پێی وابێت – خەسڵەتێکی نەگۆری هەبێت. تەنانەت دەشتوانم (r) ی فەرەنسی وەکو (ch) ئەڵمانی لەوشەی Bach, doch .. هتد دا گۆبکەم، بەڵام لەئەڵمانیدا ناتوانم (r) لەباتی (ch) بەکاربهێنم چونکە ئەڵمانی هەردوو رەگەزەکەی بەجیا تێدایە، لەبەرئەوە پێیوستە جیایان بکاتەوە.

### *4–رەچاوکردنی زناك بەشێوەیەکی سەراپاگیرانە (وەکو گشت)*

تا ئێستا هەرچیەکمان وتووە دەتوانین لەوەدا کورت بکەینەوە: ئەوەی لەزماندا هەیە تەنها جیاوازییە (differeneces). لەوەش گرنگتر،

جیاوازی عادەتەن رەگەزی ئیجابی لەخۆدەگرێت کە لەنێوانیاندا جیاوازی دادەمەزرێت، بەڵام لەزماندا تەنها جیاوازی هەیە، بەبێ هەبوونی رەگەزی ئیجابی. چ مەدلول وەرگرین‌و چ دال، زمان نەبیرۆکەی هەیەو نەدەنگ کەبەر لەسیستمی زمانەوانی‌بونیان هەبێت، بەڵکو تەنها جیاوازی فیکری‌و دەنگی هەیە کە لەسیستمەوە سەرچاوەیان گرتووە. گرنگی ئەو بیرۆکەیەی یان ئەو دەنگەی کەلەزناکێکدایە کەمترە لەگرنگی زناکەکانی دەوروبەری (واتە گرنگی‌یەکەی بۆ ئەو زناکە). بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کەدەشێت بەهای رەگەزێك بگۆڕێت بەبێ‌ئەوەی ماناکەی یاخود دەنگەکەی هیچی بەسەر بێت، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کە رەگەزێکی بەرامبەری گۆڕانی بەسەردا هاتووە.. بەڵام کەدەڵێین هەموو شتێك لەزماندا سلبی‌یە، تەنها کاتێك راستە ئەگەر مەدلول‌و دال بەجیا سەیر بکرێن، بەڵام ئەگەر سەراپاگیرانە (in totality) رەچاوکرا ئەوا شتێکی ئیجابیمان بۆ دەردەکەوێت کەتایبەتە بەجۆری زناکەکانەوە. سیستمی زمانەوانی زنجیرەیەك جیاوازی دەنگی کەپەیوەستن یان بەستراون بەزنجیرەیەك جیاوازی لەبیرۆکەدا. بەڵام پێکەوە بەستنی (جووتکردنی) ژمارەیەکی دیاریکراو لەزناکی بیستراو (واتە وشەکان وەکو دەنگ و. کوردی) لەگەڵ هەمان ژمارە لەپارچە کە لەبارستایی (کتلە) بیرکردنەوەوە وەرگیرابێت، دەبێتە هۆی دروستبوونی سیستمێك لەبەهای، وە ئەم سیستمەش دەبێتە ئەڵقەیەکی پەیوەندی کاریگەر لەنێوان رەگەزە دەنگی‌و سایکۆلۆژییەکانی ناو هەر زناکێك. هەرچەندە هەریەك لەمەدلول‌و دال تەواو پشت بەستون بەجیاوازی (تفاضلی)و سلبین، ئەگەر بەجیا رەچاو بکرێن، بەڵام پێکەوە بەستنیان راستی‌یەکی ئیجابییە، بەڵکو تەنها راستی‌یەکە کە لەزماندا هەبێت، چونکە پاراستنی تەریببونی (توازی) ئەو دوو جۆرە جیاوازی‌یە وەزیفەی جیاکەرەوەو دیاری دامەزراوەی زمانەوانی‌یە.

تێبینی: پاش وەرگێڕانی بابەتەکە، ئەو بەشەی کە لەکتێبەکەی سۆسێر وەرگیراوە لەگەڵ دەقە عەرەبەکەیدا بەراووردم کردووە.

(علم اللغة العام. تاليف فردنيان دی سوسور.
ترجمة: الدكتور يوئيل يوسف عزيز
مراجعة النص العربي: د.مالك يوسف المطلبي
1988

### پەراوێزەکان:-

(1) هەموویان مانای درەخت دەگەیەنن لەزمانە جیاوازەکاندا. و. ك

(2) مەبەستی لەشەبەنگی تیشکی خۆرە کەپاش تێپەڕبوونی بەئاوێزە (موشور)دا، شیتەڵ دەبێت بۆ رەنگە بنەڕەتییەکانی. و. ك

(3) زانستیی زمانەوانی سنیکرۆتی ئەو زانستەیە کەزانستیانە لەزمان دەکۆڵێتەوە لەساتەوەختێکدا لەهەموو روویەکەوە. بەڵام زانستی زمانەوانی دایکرۆنی لێکۆڵینەوەی زانستیانە لەزمان لەرووی مێژووییەوە..

واتە لەو گۆڕانانەی کەلەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەخۆیەوە دەبینێ لەهەموو لایەنەکانیەوە. و. ك

(4) واتە دەنگ دەبێتە هۆی دیاریکردن‌و سنوردانان بۆ بیرکردنەوەو، وە بەپێچەوانەوە.. دەبێتە هۆی ئەوەی

چیتر بیرکردنەوە بەو بۆسەرو بەری و تیکەلی و پیکەلی یە نەمینیتەوە. و.ك

(5) zen واتە (ژن) لەزمانی چیکیدا، بەباسەکەی سۆسیردا دیارە کەوەکو زمانی عەرەبی کۆتایی وشەکان لەو زمانەدا نیشانەی ئیعراب وەردەگرن. لیرەدا دەلیت Zena حالەتی ئاسایی وشەکەیە. لەکۆندا zenb (مجرور) بووە بەلام لەئیستادا (zen) (مجرور)ە بەبێئەوەی هیچ نیشانەیەکی ئیعرابی پیوەبیت.. واتە نیشانە ئیعرابی‌یەکەی سفرەو لەهەمان کاتدا (مجرور)یشە.. تەنها لەبەرئەوەی جیاوازە لە (zena). ئەمەش تەئکیدکردنەوەیەکی تری پرەنسیپی جیاوازی سۆسیرە. و.ك لە(علم اللغە العام – فردنیاند دوسوسور 1988، ترجمە: الدکتور یوئیل یوسف عزیز) و.ك.

(6) (r) dorsal = را ء ظهرية معتمة (علم اللغە العام ترجمە یوئیل یوسف عزیز 1988)

dorsal "ئەو دەنگەیە کەبەپشتی زمان dorsumو مەلاشوو دورست دەبێ وەکو دەنگی خ و غ

بروانە فەرهەنگی: A Dictionary of Linguistics and phonology لەنووسینی David Crystal

(*) لاپەرە (20): پیدەچیت بەکارهینانی فۆرمی پلەی بەراوردکاری (comparative)و فۆرمی پلەی بالا (superlative) لەئینگلیزیدا بۆ نمونە (پیدەچیت یاریکەرە باشترەکە بیباتەوە، باشترین یاریکەرە لەجیهان دا)

پاشماوەی جیاوازیکردنە کۆنەکە بیت لەنیوان ژمارەی دووانە (مثنى) و کۆ و. ئینگلیزی.

## سەرچاوە:

**Modern literary theory, literature, criticism, theories – Philip Rice & Patricia Waugh First Published in Great Britain 1989.**

---

## فەرهەنگۆك

*ریزکرنی وشەکان بەپیی هاتنیانە لەدەقەکەدا*

| | | |
|---|---|---|
| تیۆرەی زناك | **نظرية العلامة** | Seminal theory |
| دەرکەوتە، دیاردە | **ظاهرة** | phenomenon |
| بونیادە ژیرخانیەکان | **البنى العميقة** | underlying structures |
| نەست | **اللاشعور** | unconscious |
| زمانناسی | **علم اللغة** | linguistics |
| پرەنسیپەکان | **مبادئ** | tenets |
| دراو (زمانەوانی) | اعراف **(لغوية)** | conventious |
| زناك، نیشانە | **علامە** | sign |
| دال | دال | signifier |
| مەدلول | مەدلول | signi fied |
| وینەی وشە | **صورة الكلمة** | word image |
| وینەی زەینی، عەقلی | **الصورة الذهنية** | mental concept |

| | | |
|---|---|---|
| concept | فكرة | بیرۆکە |
| thought | تفكير | بیرکردنەوە |
| arbitrary | اعتباطي | هەڕەمەکی |
| arbitrariness | الاعتباطية | هەڕەمەکێتی |
| radical | جوهري | جەوهەریی |
| articulation | نطق، لفظ | وتن، وتە |
| pre - existing | الموجود مسبقا | لەوەوبەر هەبوو |
| entities | كيانات | قەوارە، قەوارەکان |
| equivalent | مكافئ | هاوتا |
| spectrum | طيف | شەبەنگ |
| prism | موشور | ئاوێزە |
| continum | سلسلة متصلة | یەکبەدوایەکێکی بەردەوام |
| essence | جوهر | جەوهەر |
| core | لب | کرۆك |
| linguistic representation | التمثيل اللغوي | نواندنی زمانەوانیی |
| range | مدى نطاق | مەودا، پانتایی |
| term | عنصر | رەگەز |
| difference | فرق | جیاوازی |
| differential | تفاضل، تفاضلي | جیاوازبون |
| system | نظام | سیستم |
| distinction | تمييز | جیاوازیکردن |
| langue | اللغة، نظام اللغة | زمان، سیستمی زمان |
| parole | كلام | ئاخاوتن، زمانی قسەکردن |
| rule | قاعدة | رێسا |
| value | قيمة | بەها |
| idea | فكرة | بیرۆکە |
| predelimited | محدد مسبقاً | پێشتر دیاریکراو |
| phonic substance | المادة الصوتية | مادەی دەنگی |
| contiguous | متجاور | تەریب |
| characteristic | متميز، مميز | دیار، جیاکەرەوە |
| reciprocal | متبادل | ئالوگۆڕکراو |
| unit | وحدة | یەکە |
| sound | صوت | دەنگ |
| form | شكل | شکڵ، فۆرم |
| form | صيغة | فۆرم |

| | | |
|---|---|---|
| concrete | ملموس | كۆنكرێتی، بەرجەستە |
| specimen | عينة، نموذج | عینە |
| conceptual | تصوري، فكري | فیکری |
| property | صيغة، ميزة | خەسڵەت |
| signification | دلالة | دەلالەت، دەلالەتکردن |
| synonym | مترادف | ئاوەڵواتا |
| counterpart | نظير | هاوتا |
| independent | مستقل | سەربەخۆ |
| self - contaiued | قائم بذاته | لەخۆدا تەواو |
| paradox | مفارقة | موفارەقە، پارادۆکس |
| sound - image | الصورة الصوتية | وێنەی دەنگیی |
| concurence | تزامن | هاوزەمانبون هاوکات بون |
| identical | متطابق | جووت |
| cornes pondeuce | تطابق | جووتبون |
| cousciousness | شعور، وعي | هەست — هوشیاری |
| alteration | تغيير | گۆڕان |
| couventional | تقليدي | ترادیسۆنی، تەقلیدی |
| fanyible | ملموس | کۆنکرێتی، بەرجەستە |
| sonovous | صوتي | دەنگیی |
| pronunlcation | تلفظ | گۆکردن |
| combination | ربط، توحيد | پێکەوەگرێدان، کۆکردنەوەی دووشت یان زیاتر پێکەوە یەکخستن |

# لە ئەدەبی گەلانەوە

- هەنگوین و موم

- ئانا ئاخماتۆڤا



# هەنگوین و مۆم

- شەهریاری مەندەنی پوور
- لە فارسییەوە: کۆزاد

***شەهریاری مەندەنی پوور** نووسەری لاوی ئێرانی یەکێکە لەنووسەرە باشووریەکانی ئێران و، تائێستا پێنج کۆمەڵە چیرۆک و رۆمانێکی چاپ کردوە، مەندەنی پوور هەشت ساڵ لەمەوبەر یەك کتێبی چاپ کراوی هەبوو: "سێبەرەکانی ئەشکەوت"، لەماوەی ئەم هەشت ساڵەدا ئەم کتێبانەی چاپ کردووە: "هەشتەمین رۆژی زەوین، هەنگوین و مۆم، مانگی نیوە رۆژە، رۆژهەڵاتی وەنەوشەو هەروەك رۆمانی دڵ و دڵداری". چەند مانگ لەمەوبەر مەندەنی پوور خەڵاتی چیرۆکنووسی ئەم بیست ساڵەی دوایی (چیرۆکنووسی پاش رووخانی رژێمی پاشایەتی ئێران) پێبراو هەروا خەریکە لەشیرازەوە خۆی بۆ دەربازبوون لەسنووری چیرۆکنووسی ئێران تەیار ئەکات. مەندەنی پوور ئێستاکە لەشیراز سەرنووسەری گۆڤارێکە بەناوی "پیرنگ". چیرۆکی هەنگوین و مۆم کە لەبەر دیدەی ئێوەدایە چیرۆکێکە لەکۆمەڵە چیرۆکێك هەر بەم ناوە:*

لەحەوت رۆژانەکەی باپیرەدا، بەبێ ئەوەی سەرنجێ بداتە هاتوچۆی ئەو کەسانەی چایی و شەربەتیان بۆ پێنج دەرییەکان ئەبرد، بەبریسکەی زێرینی پوولەکەکانیەوە، بەئارامی لەنارنجێك هالاو لەناو لكوپۆکانیا ون بوو؛ بەلام برای بچووك، کە ئەو رۆژە لەهەندەران گەڕابوەوە، جگە لەو کەسیتر نەیدی. بەو چاوانەی کە لەبەربێخەوی هەزار بیریتر بووبوونە دووجامی گوڵاڵە، داهێزراو و نەشارەزا سەیری ئاهەنگەکەی ئەکردو جارجارەش ئاورێکی

ئەدایەوەو چاوی ئەبڕیە نارنجەکە، تاکوو بەشکم جارێکیتریش بریسکانەوەی پوولەکەی مارەکە ببینێتەوەو نەیدی. شەو کە ماڵەکەیان بێگانەی تیانەما، باوکە هەرسێ کوڕەکەی بانگ کردە ژوورەکەی باپیرە، بۆ خۆی لەبەرا هەموو شتومەکەکانی راگوێزرابوە ئەوێ. بڕیاری وابوو لەبان قەرەوێڵە هەڵکەندەکەی باپیرە بخەوێتو لەسەر کورسیە نەرمەکەش ئەمری ماڵەکە دەربکا. بەبڕواو شەکەتیەوە قسەی کردە هەرسێ کوڕە لەوەدوا ئەبوایە لەماڵەکەی بابو باپیرانیان نیشتەجێبن، ئەگینا مووچە مانگانەکەیان ئەبڕدرا، باپیرە بۆ قەرەبووکردنەوەی نەبوونی لەناو سەراکەداو بۆ خڕکردنەوەی پاشماوەی بنەماڵە پرژوبڵاوەکەی لەشوێنێکدا، ئەم وەسیەتەی کردبوو. ئەویش کەباوکیان بوو، بۆ راگرتنی خووی روو لەیادچوونی باپیرانیان وای ئەویست. برای بچووکە هاواری ئەکرد، دەستە کچانەکانی لەژوور سەری رائەوەشاند، کەخوێندنەکەی هەندەرانی نیوە ناچڵ ماوەتەوەو جگە لەمەش - دەنگی کزکرد - رەنگە تەمای زەماوەندکردنی هەبێ لەگەڵ کچێکی پەسندو هاوبیری خۆیا. بەڵام باوکە دەستێکی هەڵبڕی، وەك بیەوێ بەئارامی شتێك لەپێش دەموچاوی لادا، لەسەر هەمان کورسی بەدانیشتنانەوە چاوی لێك ناو لێی خەوت. هەر سێبرا، بەسەرسوڕمانەوە، بەپلیکانە بەردینەکان هاتنەخوار. لەکوانووی چێشتخانە پۆرەکەدا چڵۆسکی نیوە سووتاو هێشتا هەر تروسکەیان بوو، برای گەورە گوتی: ئەبێ گوێڕایەڵ بین.. و بەرەو لای خۆی چوو. ماڵەکە گەورەبوو. پێنج دەریو سێدەری زۆر، لەنێوانیانا کەوش کەنو قوژبن، تووناوتوون لەدەوران دەوری حەوشەکە، هەموو ئەچوونەوە سەر حەوزێکی گەورەی یەشمین. باوکە هەر کوڕەو لایێکی بۆ دانابوو. براکان تاکوو بەیانی لەژوورەکانیانا لەداری بن میچەکان رامانو گوێیان بۆ خشەشی خزۆکی بن میچەکان راداشت.. رۆژی دواتر برای گەورە ژنو کەلوپەلی بۆ ماڵەکەی گواستەوە، بەڵام قرەی براکانیتر لەگەڵ باوکەدا هەر بەردەوام بوو، باوکە ئەینەڕاند: "چی بەجێماوە لێمان.. نەتەوەی زەندو بڵاوبوونەتەوە، لەهەر تازە پیاکەوتوویێك ژنتان خواستووە.. خوێنو رەگەزو بنەچەتان کوا... مناڵەکانتان لەکوێ خووی ئێمە بگرن.. بەرەڵڵایانە، دەی باشە بڕۆن ئەگەر ئەتوانن. ئەو کەسەی رێزی ئەڕواحی باوکی لانەبێت من مووچەی نادەمێ.." برای بچووکە لەبەرخۆیەوە بەورتەو ورت ئەیگوت: "شێت بووە. مەرگی ئەو رەعیەت خۆرە سەدو سیساڵەیەو تریاك کەللەی وشك کردوە. من ئاقڵی ئەکەم، جابزانن.." بەڵام برای ناونجی لەوەئەچوو پێمل بووبێتو بەهیوای مانەوەیێکی ئەمانەتیو رازیبوونی هەوای پیرانی باوکە، حەوتەی دوایی کەلوپەلەکانی لەماڵێکی کرێگرتەی سەرووی شارەوە بۆ ماڵەکەی خۆی راگوێزاو سبەی شەوێ دەنگی سەنتووری کوڕەو گۆرانی ژنەکەی لەپێنج دەرییەکانەوە هاتەدەر. ژنەکەی ژنێکی تەڕو گورج و گۆڵ، ئارامو حەجمانی نەبوو، قاقای خۆی ئەگەیاندە پەستوەکانیش. باوکە ئەینەڕاند: "بیبڕێتەوە، بیبڕێتەوە!" بەڵام دەنگی سازەکە بەرزتر ئەبوو، کەرۆژیش ئەبووەوە، ژنە بەخۆنواندنی پتر لەجاران، حەوشەکەی داگیرئەکرد. چاوەی شووشە رەنگاورەنگەکانی پەنجەرەو دەربیجەی ماڵەکە لەبەرهەنگاوی پیاوانەو ستەمکاریی گۆشتنی ژنە تارتر دەبوونو بەدەنگە بەرزەکەی سەدان چۆلەکەی لەگوێ پاشۆری حەوزەکە هەڵئەفراند، هەر ئەویش بۆ جاری دووهەم مارەی دی. بەدەم چریکاندنەوە هەڵاتە حەوشە. لەناوەڕاستی ژوورەکەیدا پەتێکی

دیبـــوو، هەركــە نووشــتابووەوە هــەڵی‌بگرێت، پەتەوەك سووكایەتی پێ‌بكا ملی‌نەدابوو، خزابـوە توێی نوێنەكانـەوە. بـاوكی گوتــی: "درۆ ئــەكا، خۆی ئـەنوێنێ." بـرای نــاونجی هــەروا كــەدڵی ژنەكەی ئەدایەوە، گوتی: "باشە ئەمە چ كرمێكە، بۆ هەرلێرە بژین؟ بۆ ئەوەندە قیرسچمەن؟ بۆچی پاكمـان نەچینــە مــاڵێكی نوێــوە، ئــەتوانین دەزگایــەكی ئاپارتمـانی بكڕیــن‌و هەریەكــــەمان نهۆمێكی هەڵگرینــەوە." باوكـە تـیزە خەنـەیێكی كردو گوتی: "خۆ ئەگـەر ماریشـی لــێ‌بێت لـەناو ژوورەكـــە چــی ئــەكا، هــەتا ســەربان‌و بەچكــە كۆترەكــــان‌و هــــەتا نارنجــــەكان هــــەبن‌و چۆلەكـەكان.." نووشـتایەوە بەسـەر مەنگــەڵیداو دووكەڵی‌تریاكی لـێ‌هەستا. برای بچووكە تفـەنگی راوی باوكـــەی لـــەناو پەســیوەكە دەركێشـــاو فیشەكی بەردا لەبەر بڕوانامەی گوماناوی زانكۆی بـــەفیرۆچوو و دڵـداری باڵابـــەرزی چاوزەریـــایی بەباچوو، لەژێر لچیـەوە بەبۆڵـەبۆڵ،لـەژێر هـەمان نارنج كە یەكەم ڕۆژ بریسـكانەوە زێڕینەكـەی تیا دیبـــوو، بۆســـەی نـــاوە. نارنجـــەكان زۆربــــوون. بـــەدەوری حـــەوزە حـــەوت میــتر درێـــژ وبـــن نادیارەكەدا لەپاڵ یـەكترا ناشـترابوون‌و سـەوزایی لــق‌و پــۆ كۆنــەكانیان لەگـــەڵ ئــاوی لیخنـــی حەوزەكەدا تێكەڵ ببوو. برای پاشە بەرە هاواری ئـەكرد: "ئـەم گۆڕسـتانە تووناوتوونـە، من ئـــەو دەعبایە لەكوێ بدۆزمەوە."

... و دەم‌ودەست بــێ‌دەنگ ئــەبوو و گوێــی رائەداشـت. دەمـەو خۆراوا چۆلەكـە تۆقیوەكــان لـەدرەختێكی ئـەولاترەوە دەرئەپـەڕین، ئــەویش فرکـەی ئـەكردو رووی تفەنگەكـەی ئـەكردە ئــەو تۆقە گەلایانەی لەتاریكایی دەمەو ئێـوارەدا ئیتر سەوزاییان پێوە دیارنەبوو. نارنجێكی پووچەڵ و بــاكردووی ســاڵی پــاردا ئەكــەوت، ئـــەویش پەلەپیتكــەی تفــەنگی ئەتــــەقاند، ئــەبوو بەتـەپ‌وتۆزو گوڵپـەڕە بەهارییـەكان دائـەوەرین، بـەڵام مـارە نەئـەبیندرا. ئەوسا باوكـە لەپلیكانـە بەردینـەكان ئەهاتـەخوار، دەسـتی لەحەوزەكـەدا ئەشـت‌و ئـەیگوت: "پێتــان ئـــەڵێم.. كارتـــان بەمارنـەبێ، قینتــان لــێ‌هەڵئەگرێ، تـا ئەوپـەڕی زەریاش دواتان ئەكەوێ" كوڕە چكۆلـە ئـەیناڵاند "دەبۆچی باوكە.. بڕیاربێ هــەر كــە خوێندنەكــەم دوایی هات بگەڕێمەوە، هەر كەمێك پارەم لەسـەر ماوە لەوێ... یەك ساڵی‌تریش پێویستیم بۆ دابین بكە.. بۆ ئەتەوێ لەناو ئەم پەسیو و ژێرخانانــەدا برزێم. من لێرە ئەمرم" باوكە بەقامك ئاماژەی بۆ وشكەگیای سەركاگڵی بانـەكان ئـەكردو ئـەیگوت: "تۆ ئێستاكەش مـردووی.. سـەیركە.. گوێ‌بگـرە ..."، لەزەردەی دوایین رووناكـایی رۆژدا، لەسـەر بانەكانـەوە هـەتا بەرپـەنجێرە تارەكـانی نــهۆمی دووەهەم كەروێشكەی هەوایەكی سووربۆو شەپۆلی ئەداو پەرەسـێلكەكان لـەناویا كەوانـەیان ئـەكرد. باوكـە گوتــی: "هـەموویان سـەیری ئاكـاری ئێمـە ئەكـەن، زرپ‌و زینـدوو.. هــەر پشتیان تێ‌بكـــەی مـــردووی... بۆچــی نایەیتـــە لام چەســـپێكی لــــێ‌بدەیت..". كـــوڕە بـــەبێزاری‌و نەفرەتـــەوە هەڵدەهاتـــە ژوورەكـــــەی‌و دەرگـــــای لـــــەخۆی هەڵئـەپێكا. رۆژانـی دواییتر هەرچـەند پاپۆكـەی سام كردن لەمارێ كە ئەكرا لەهەموو شوێنێ بـێ، هەر ئەهات‌و لەحەوت خەزێنەی لەشـیانا هـەراوتر ئەبووەوە، بەڵام بیرو هیـوای دۆزینـەوەی رێگـایێك بۆ دەربازبوون لەئەبەدییـەتی ستەمكارانەی ئـەو ماڵە زۆرتر سەرقاڵی ئەكردن. لەم ناوە ژنی برای گەورە بێ‌دەنگ بوو. عەسراو عەسر لەسەرلێواری بـــەردینی حەوزەكـــە دائەنیشـــت‌و بـــەچاوە ئاسكەكانیەوە كەسەنگینی شاردنەوەی نهێنیەكی نـەدركاو و بروسـكەی ئـیرادەیێكی خۆپارێزیـان تیاهـەبوو، لـەئاوی خەسـتی حەوزەكـە رائـەما. ئەوكاتەی بریكە بریكی خۆرەتـاو لەسـەر ئاوەكە

ئەئەما تارمایی هاتوچۆی ماسی گەورە گەورەو قەوزەی یەکپارچەی حەوزەکە ئەکەوتە بەرچاو. بەردەوام کرمی وردی سوورو سەدەفی لەبنی ئاوەکە ئەهاتنە سەرو تاوێك بەسەر ئاوەکەوە ئەلکان و پاشان بەپێچ و خولێکی سەرقالکەردا ئەچوونەوە. هێندێ جار بای دەمەو عەسران فوارەکەی لەبەهار نارنج ئەگرت. توێژاڵی گوڵ شەپۆلی ئەداو چاوی سەرقاڵ پێیوابوو ماریٚ لەژێریا مەلە ئەکات.. ڕۆژی دوایی گوڵپەڕەکان ئاوگەستەو گەش ببوون و خاڵ و بەڵەك دائەکێشران و پاشان ئەکرانەوە. خەیاڵێکی راگوزار ماسیێکی پیری دی. ژنی برای گەورە لەهەموو شوێنێکی ماڵەکەدا جامە ئاووخوێی دانابوو، ئەیگوت مار حەزی پیٚ ئەکات و ئەیخوات، کەنمەك گیربوو هیچ ئازاری بۆ دانیشتوانی ماڵەکە نابیٚ. بەرە بەیانێك بەچاوی حەپەساوەوە داچڵەکی و خەوی دویٚشەوی ئیلهامی پیٚکردو گوتی: "لەم ماڵەدا خوێنێك ئەڕژیٚ.. لێم ڕوونە.. خەونەکانی دەم بەیانیم هەمیشە دێنەدی."..

لەدوای چلەی باپیرە ئیتر کەس پێی نەنایە ئەو ماڵەوە. باوکە لێی روون بوو هەموو خۆیان لیٚداگرتوە هەریەکەو بەچەشنیٚ میراتەکەی بەتالان بەرن. تووڕەبوونی بەئەنقەستی باوکە وای کرد هەموو کەسوکاری لیٚبتاریٚ، لەولاشەوە خزمانیش کوڕەکانی ئەویان لەخۆ تەکاندەوە. هەر خۆیان مانەوەو پیرەپیاوێکی دەنگ گڕکە لەگەڵ ژنە لاڵەکەی چێشت لێنان و گسك دانی ماڵەکەیان بەئەنجام ئەگەیاند. باوکە حەزی ئەکرد هەموویان لەسەر سفرەیێك کۆببنەوە، ژنەکان بەیارمەتی پیرێژنە لاڵە لەناو دەفری میسندا چێشتەکەیان ئەهێناو هەریەکەو بیٚئەوەی سەیری کەسیتر بکا نانەکەی ئەخوارد. ڕۆژێکیان برای چکۆلە شەقێکی لەدەورییەکەی هەڵداو بۆڵاندی: "مادام کە لەم کاولە کۆنەدا دەبیٚ بمرم، ئیتر دەم لەنان و ئاو نادەم بازووتر.." و چوەدەر باوکە لەسەرخۆ بەگاگۆڵکە چوە جێگای کوڕەو بەوردی برینجە رژاوەکانی کۆکردوەو گوتی: "بابرسی بیٚ ئەوسا گووشی پیٚئەخوریٚ." بێزاری ژنی برای ناونجی سەری کردو دەم چاوی لەناو لەپیاشاردەوە. دەمەو عەسر لەوەلامی ناوبژی کردنی برای گەورەدا نەڕەنەڕی باوکە بەرزبوەوە: "وست بە.. کام حەقەیان پیٚبدەم، هیچ بەشێکیان بەسەرمەوە نیە.. هیچ بەشێکیان نیە.." برای گەورە بەسەروشانی داڕووخاوەوە، شەلالی ئارەق، بەپلیکانەکاندا هاتەخوار. ناو حەوشەکە پڕببوو لەبۆنی بەهار نارنج، پەرەسێلکەکانیش بەسەریانەوە بەرەو حاندێکی پێش بینی نەکراو ئەفرین. ئەوسا هەموویان، تەنانەت برای چکۆلەش کەلەسەربان خۆی لەمارەکە داگرتبوو، دەنگی هاوار هاواری باوکەیان بیست. برای ناونجی چێوەکانی لە تەلی سەنتوورەکە سرەواند. ژنەکەی هەرپێنج تای پێنج دەرییەکەی کردەوەو دەنگ دانەوەی نهێنی و چپەچپی کینەی سەدان سەدەی سازەکە چۆلەکەو پەرەسێلکەی بیٚدەنگ کرد. پیرە پیاوە گڕەو ژنەکەی لەچێشتخانەکە هاتنەسەر. پاڵیان بە پادیواریە بەردینەکەیەوە داو چاویان بریە پێنج دەرییەکە، ژنەی ئاسکە چاو نیگای لەحەوزەکە دزیەوە. ئەوسا چاوەش بەپێکەنینێکی نالەبار لەقاپی یەکەم پەنجێرەدا دەرکەوت، دەنگە دوورەکانی شەقام دوورتربوونەوە. هێلێکی خڕۆك لەتوێی بریسکە بریسکە سەرگەردانەکانی هەوادابوو. خولێکی داو چوە قاپی پەنجێرەی دووهەمەوە. ریتمی سازەکە کەمیٚتوندتر بوەوە. برای چکۆلە لەسەربانەوە هوڕای کێشا. دەستەکانی ژنە لەژوور سەریەوە وەکوو دوومار لێك هاڵان و بۆنی گیای گەش خزایە توێی عەتری بەهار

نارنجەکانەوە. ژنە لێوی هەڵقرتاندو بڕۆی هەڵتەکاندو چاوی لەپەنجێرە داخراوە تاریکەکانی سێ لاکەی تری ماڵەکە داگرت. شەپۆلێك لەگەردنیەوە هاتو لەقولاپەیەوە سەری‌کرد. پێی لەزەوی کوتا، خرینگەخرینگی خڕخاڵی نادیار لەلق‌وپۆی درەختەکانەوە ئازادبوو. ژنە لەقاپی پەنجێرەی سێهەم دابوو، پەردەکانی سازەکەش لەژوورترەوە.. بزەیێکی نهێنی نیشتەسەرلێوەکانی ئاسکە، پیرەزاڵە گرەش پووکە بێ‌دیان‌و کرمۆڵەکانی بۆ پێکەنینێکی بێدەنگ لێك ڕەواندەوە. هەموو تاڵەکانی سەنتوورەکە ئەلەرانەوە. لەپەنجێرەی چوارەم دا! ئەندامە بەپێچ‌و خولەکانی چاوەش لەشەپۆل‌و نائارامی‌دا هەریەکەو بۆ لایێك باڵیان ئەکوتا. گوڵپەڕە بەهارییەکانی دارنارنجەکان دائەڕژانە سەرحەوزەکە. ژنە هەلهەلەی کێشا. قژە بەئارەق خووساوەکانی بەسەر شانەکانیەوە ئەخزان‌و قەفەکانیان بەشالاوێکی گەزەك ئەکرانەوە. ژنە بەپاشا چەمایەوەو دەستەکانی بەدەوری یەکا بادا. دەنگی ساز توێ‌توێ ئەخزایە ناو ژوورو قوژبنەکان‌و بەکەلێنە زۆرو زەبەندەکانی ماڵەکەدا بەرزو ژەهراوی دەری‌ئەکرد. چەند تاڵێکی سەنتورەکە قرتاو لەملاولاوە قەفیان خواردو پیاوە هەر بەچێوی ئاگرینەوە تێی ئەسرەواند.. پەنجێرەی پێنجەم ئیتر ئێوارە بوو، شکۆی ئەندامی کینەکێشی ژنەش لەتاریکیدا دەنگی ئەدایەوە.. لەدواییدا ژنە نووزەیێکی کردو بەپاشاکەوت. بەدرێژایی ئەم ساتە سێبەری باوکە لەپشت شووشە سەوزو سوورو یاقیقیەکانی پەنجێرەی ژوورەکەیەوە ئەبیندرا. ئەو شەوە سفرەی گشتی رانەخرا. هەریەکەو لەسووچ‌و تاریکی خۆیان خزابوون‌و گوێیان بۆ حیلکە حیلکی بەئەنقەست بەرزی ژنی برای ناونجی رائەداشت. بەڵام نیوەشەو جگە لەبرای چکۆلەکە هێشتا لەبەر تۆفانی مانگە شەوو ئەستێرە ژەهراوییەکاندا لەسەربان بەخەبەر لێی‌دانیشتبوو، کەسیان هاواری دەردەداری باوکەیان نەبیست: "ئە..ی..خ..و..ا.. بۆ ئاوام لەگەڵ ئەکەن؟"

دوو رۆژ بەسەر تاوویاو و برسیەتی کوڕی چکۆلەدا تێپەڕی.، تفەنگ بەدەست حەوت توێی ماڵەکەی بۆ مارەکە ئەپشکنی. ئەو ئەرواحانەی بەریان پێ‌ئەگرت بەقسەی سووك‌و نالەبار لای ئەدان‌و ژوور بەژوور دەرگاکانی ئەکردەوەو ئەچووە بەرەوە. برای گەورە هالاوی تریاکی هەڵئەمژی‌و چوار پەلی درێژ ئەکردو بەپشتا وەدەرئەکەوت‌و چاوی ئەبڕیە بن میچە پڕ لەوەهمە سووربباوەکەی کەلەناو خۆیا دەنگی ئەدایەوە، چاوەش لەگوێ حەوزەکە دائەنیشت‌و قاچەکانی لەئاوەکە ڕۆ ئەکردو لەوەڵامی جریوە جریوی چۆلەکەکاندا، ئاگادار لەنیگای راماوی باوکە لەپشت پەنجێرەی ژوورەکەی؛ بزەیێکی* درۆزنانەی ئەکردە نیوەڕۆی رۆژی سێهەم، لەسەر سفرە، نەڕەنەڕی سەرسامی کوڕی سێهەم لەژێر خانەکانەوە ئەگەیشتە گوێ، کوڕی دووهەم لەسەرخۆ گوتی: "لەبرسان ئەمرێ.." باوکە تیزە خەنەیێکی کرد، واتە: "لەبنەچەی ئێمەدا کەس لەبرسان نەمردووە... ئەویش نامرێ "پاشان بەشێوەیەکی ئاشتی‌خوازانە بەژنەکانی گوت: "ئێوەبۆ منداڵتان نابێ. باوکم حەزی‌ئەکرد نەوەو نەتیجەکانی لەم ماڵەدا ببینێ، منیش حەزئەکەم نەدیدەکانی ئەو ببینم." ئاسکە چاو سووربووەوەو سەری داخست. برای گەورە گوتی: "مناڵ هەر مەینەتن، ئێستاکەش ئەم ماڵە بەشی خۆی قەرەباڵغە.."و هەستا. دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە کاتێ ژنە لەگوێ حەوزەکە دانیشتبوو، بریسکە بریسکێکی زێڕینی لەلاچاویا دی، سەری وەرسووڕاندو قیژانی. برای چکۆلە گەیشتێ.

زامنی تفەنگەکەی شل کردو سیلەی لێگرت، بەڵام هەروا واقیوڕما.

لەبەرچاوە پڕتاو و یاو و ئاگراویەکەیدا، لەژێر پەنجە لالە عەباسیەکانەوە نازو فیزێکی ساردو تیاچوونێکی سێحراوی درێژو سەرسامکەر ئەخزا. پیاوە هۆشی لێبڕا بوو، ناڵاندنی. ژنە پێی لەزەوی کوتاو بەسامێکی نێرانەوە قیژاندی: "بیکوژە.. بیکوژە.." بریسکەکە، دیارو نادیار، بەرەو ژێر خانە پڕ لەدارو کۆتەرەکان ئەچوو. ژنە بەشانی پیاوە حەپەساوەکەیا کێشا: "بیکوژە.. بیکوژە.." پەلەپیتکە تەقێندرا. ساچمەکان بەخشتە قەزاقیەکانی نزیك باخچەکەوە پشکووتو تۆز هەستا. ژنە نووزاندیو پیاوە دیسان تەقاندی. کوتە قورقوشم لەسەر خشتەکان کەوانەیان ئەکرد. زیزکەیێك بەرەو روویان بازراقەی بەست، "بیکوژە.. بیکوژە..!" برای چکۆلە بەدەستە پاچەیی فیشەکی تێهاویشت، بەڵام فریای تەقاندنی نەکەوت. هەرئەوەندە فریاکەوت خۆیو ژنە لەبەرئەو بریسکە زێڕینەی بەرەو روویان خوشا، لابدات. فیشکەی شەویلاگەیێکی ناکام لەپشتەسەریانەوە دوورکەوتەوە. هاواری باوکە هەستا: "کەرانە.. گەوجانە.. بریندارتان کرد.. کێماری ماڵەکەی ئەکوژێ..لێتان نابوورێ.. دەتان کوژێ..".

چاوەش قوورەقوورِ گریاو ناوچاوانی بەدیوارەوە نا. تفەنگ لەدەستی برای سێهەم داکەوتو کاسو وڕ بەرەو هەیوانەکە رۆی. "من لێرە ئەڕۆم.. ئەڕۆمو ناشگەڕێمەوە.." برای گەورە لەژێر لچەوە ئەیبۆلاند، برای ناونجی بەڕقەوە بەربووە بنجەکانی ئەو بەرە، هەموویانی بەڕەگەوە هەڵکێشا، بەڵام مارەکەی نەدۆزیەوە. برای گەورە گوتی: "زەوی بەفرمانی مارە، مار بیەوێ زەوی دەم ئەکاتەوەو خۆی تیائەشارێتەوە." شەوو

ڕۆژانێکی پڕ لەترسو سام چاوەڕێیان بوو. لەهەر هەنگاوێکا چاوەڕوانی چزوییێکی کینەکێش بوون. نەخشی قاڵییان لێئەبوو بەمار. ژێر مجرییەکان بەقەدەر پاپۆکەیێکی خۆداگرتوو بەتاڵ بوو. کاتێ سەریان ئەکرد بەژوورێکی تاریکدا قاچو قولی داماوی خۆیان لێئەگۆڕا. دەرگای دۆڵابەکان بەسەرتاریکیەکی بێبندا داخرابوو کە لەشوێنێکەوە دوو شیشلۆقی سوور ئەدرەوشانەوە. چاوەش ئیتر پێی نەنایە حەوشەکەوەو شەوەکانی ناو پێنج دەریشی کپو خامۆش بوون. نیوەشەوان بەقیژەقیژ لەهەستی لێخشانێکی سارد رائەپەڕیو لەسەر یەغانێك هەڵئەترووشکا، بەدەم رشانەوەی ترسو سامەکەیەوە مێردەکەی وادار ئەکرد جێوبانو کونو قوژبنەکانی ماڵەکە بدۆزێ. ئاسکە چاو جامە ئاوو خوێکانی زیادکردن. مارگرێکیان هێنا. پیرە پیاوێکی چڵکن بەنیگاییێکی وشكو حەپەساوەوە. کەماڵەکەی چاوپێکەوت، گوتی لەناو ئەم تووناوتوونەدا دۆزینەوەی مارئەستەمەو پێویستە چەند رۆژێك بمێنێتەوە. لەسەربانەوە دەستی پێکرد هەتا ئەگاتە ناوحەوشە. لەهەر شوێنێ کونێکی بدیبایە وێردو ئەفسوونەکەی خۆی بەسەردا ئەدەماندو پاشان نەختێ دووتر بەسەرپێوە ئەوێستا و چاوی تێئەبڕی. باوکە بەتیزە خەنەیێکەوە سەیری ئەم کارانەی ئەکردنو ئەیگوت: ":پێم وتبوون.. پێم گوتبوون کارتان بەکاری ئەوبێزمانە نەبێ." مارگر ئەیگوت: "ئەم ماڵە دووکەڵی تریاکی تیائەگەڕێ، لێم روونە مارە دوودی بووە، قەت لەوەناچێ بۆ شوێنێکی تر بچێ." و هەروا زەرداوی دەمی بەقوڵك و درزەکانا هەڵەسوو، تا سەر لەبەیانێك تەرمە رەش

داگیرساوەکەیان لەژێرخانێکا بینیەوە. بەشارەگیەوە شوێنی جووتە دیانی ماری پێوەدیاربوو. لەلاییێکی دەمیەوە خوێن‌و کەفێکی مەیلەورەشی دەردابوو، مۆرەییێکی سپیش لەناو مشتیابوو. باوکە قاقاپێکەنی‌و برای گەورە تریاکی لەژەمەکانی زیاتر کردو چاوەش کەوتە قسەکردن. بەتەنیا لەپێنج دەریەکەدا هاتوچۆی ئەکردو هەر ئەیگوت: "برۆ... برۆ.." کەماندوو ئەبوو تاوێك دائەنیشت‌و بەترسەوە رائەچلەکی‌و سەیری دەوروپشتی ئەکرد. تاو ناتاوێ لەهێلانە چۆلەکەکانی ژێر گوێسەوانەکەوە جریوە جریوێکی تۆقیو ئەهاتەگوێ. چۆلەکەکان شێتانە بەم لاولادا ئەفرین‌و هەموو لێیان روون بوو کەمارە خەریکە جووچکەکانیان قووت ئەدا. برای ناونجی ئەوکاتانەی داربەدەست لەماڵەوە نەئەگەڕا لەشەقامەکاندا بەدوای برای چکۆلەدا ئەگەڕاو بێماریفەتی‌و خوێن ساردی خزمانی تاقی‌ئەکردەوە. پاشان ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ‌و بۆلای شیوەنی شێت حاڵی ژنەکەی: "بۆچی لەم هێلانە مارەدا بەتەنیا بەجێت هێشتووم؟" رۆژێك پیرە زاڵەگرە گوتی، مارەکەی دیوە سەری لەناو مەنجەڵە شلەکەدا بووە.. چاوەش ئەینووزاند: "ئەیەوێ هەموومان دیق گوژ بکات، ئەوبێ زمانە ئەفامێنێ.."و ئاماژەی بۆ پێنج دەرییەکەی باوکە ئەکردو: "هەموومان ئەکوژێ، ئەیەوی هەموومان بکوژێ، واشمان بکوژێ کەخوێن لەدەممانەوە سەربکات‌و وشك و رەش داگەڕێن‌و بکەوینە زەوی.." پاشان کتوپڕ بێدەنگ دەبوو، بەچاوی دەرپەڕیوەوە گوێی رائەداشت. خشەخشێك لەناو بن میچ‌و دیوارەکانا بوو، پوولەکەی زۆری ئاڵتوونی بەپێچ‌و خول لەهەوادا... "منی ئەوێ، بەر لەهەمووتان ئەیەوێ دیانە ژەهراویەکانی لەگۆشتی من..."و قاچەکانی شووەکەی لەباوەش گرت. "بالێرە برۆین.. وەرە بالێرە برۆین..". پیاوە سمێڵەکانی بەدیان ئەجووەوەو لەبلێسەی کینەییێکی کوێردا ئەینرکاند: "کوا پارە.. کەمێ دیان بەخۆتا بگرە، سەرپاکی ئەم ماڵە ئەسووتێنم، دووکەڵی مارەو ژەهرەکەشی ئەنێرم بۆ ئاسمان.." تاوێ ئەیان دی کەوا لەژێر رهۆڵێکی ژێر چۆڕاوگەکەی سەربانەوە تووکی تازە دەرکردوو، پەڕو پۆی کوشتاری بەچکە چۆلەکەکان ئەرژێتە زەوی‌و هەر لەو دەمەدا لەلاییێکی‌تری حەوشەکەدا لەبەرپێی سەربازە بەردینە رم بەدەستەکانی پا دیواریەکان، ئاڵتوونی ئاوەکی رەوەك بەژێر خانە پڕ لەدار وکۆتەرەکان رۆئەچێ. شەوان چرایان هەڵ ئەکرد جا ئەخەوتن، شەوێکیان چاوەش لەناو جێگەکەی دا چاوی کردەوەو تیرێژێکی روونی نیوە دیاری بەبن میچەکەوەدی. ژنە وەك خۆی بەدەستەوەدابێ لەجێگەکەی خۆی نەبزوا. مارە راست لەحاند سەری ژنە بەکلك خۆی بەدارێکی بن میچەکەدا شۆڕکردبوەوەو بەچاوە مردوەکانیەوە تێی رامابوو. ژنە لەرامانەکەی مارە راماو هەستی‌کرد سەرماییێکی سڕو کاریگەر لەملەوە بۆ ئەندامەکانی سەری‌کرد. دەستەکانی سڕبوون‌و پشتێن‌و قاچەکانیشی هەروا. ساردایی مەرگ، پوولەك پوولەك لەسەر لەشی نیشت. ژنە دەمی کردەوەو بەهەمان هەوایەی کەشەوانی هاوجێی بانگی شووەکەی ئەکردە لای خۆی، لەبەرلێویەوە گوتی: "وەرە.. وەرە.." بەیانی لەبیری نەمابوو چەند سەعات لەژێر ئەو تیسکە سەهۆڵینەدا بێچرکە ماوەتەوەو سەیری شەویلاگەی لێك ترازاوی

نێشەخەنەیێکی ئەبەدی کردوە. برای ناونجی لەدەرانی هەیوانەکە دا دەستی ژنەی گرتو نالاندی: "مەڕۆ.." چاوی ژنە بەقوولاچووبوون. پێستە بلوورینە سپیەکەی، پیرێژن ئاسایی زەردو وشك بووبوو، لەپەستا زمانیشی وەك زمانە مار بەلێوەکانیا ئەهێنا. هیچی‌نەگوتو یەغانە سووکەکەی بەدواخۆیا کێش کردو لەتاریکایی هەیوانەکە رۆچوو. خانوەکە ئارامیی کۆن‌و دڵخوازی باوکە دایگرت. پیرە پیاو دەستی نایە سەرشانی برای ناونجی‌و گوتی: "ئەو سۆزانیە شایانی تۆو بنەماڵەکەت نەبوو، چاکتر کەچوو..." سەوزە نارنجی لووس بەبنەنارنجە گەلاّ وەریوەکانەوە گۆشتیان گرتبوو. تاوناتاوێ یەکێکیان بەدەنگێکی کپ دا ئەکەوتە سەر خشتە قەزاقیەکان‌و وەکوو تۆپ هەڵئەبەزیەوە ئەتلا. دوانیوەڕۆیان دەنگی شکست هێناو خەمناکی سەنتوور لەپشت دەرگا داخراوەکانی پێنج دەرییەکەی برای ناونجیەوە ئەهاتە ناو حەوشە. ئاسکە چاو لەگوێ حەوزەکە چاوی لەکەلێنی ناودەمی سەرەشێرێکی بەردین بڕیبوو، بەئارامی قامکی بەسەر ئاوەکەدا ئەکێشا. لەولاترەوە پیرەپیاو نیوەرەش‌و سپی بەمەسینێکەوە حەوشەکەی ئاوپڕژێن ئەکرد. خشتەکان چزەچزو هالاّوێکیان لی‌هەڵئەستاو بۆ ئارەقی خاکێکی کۆنی شیّکردوو، وەك تەمو مژ ئاوێتەی قووڕەقووڕی کۆنینەی سەنتوورو نیگای ژنێکی لەکیس چوو ئەبوو. باوکە مووچەی دوو براکانی زیندوو کردەوە. سەلماندی کەدەستو دڵبازی لیّدێت. "بڕۆن دڵتان بەهەرشتێکەوە هەیە بۆ خۆتانی بکڕن.. ئەوەندە هەیە بەشی حەوت پشتمان بکات." بەلاّم رەزایەتی ئەرواحی پەنهان زۆری نەکێشا. قرچەی نیوەرۆ، کاتیّ سفرەیان راخستبوو، و بۆنی رۆنی زەنگ‌و برینج لەو ناوە گەڕابوو، برای چکۆلە وەژوورکەوت، قژهالۆزاوو شڕو شێواو لێی دانیشت، ئەو بەچکە کەروێشکەی بەدەستیەوە بوو لەنێوان تروشکەی قاچەکانیا، یەخسیری کردو قڕوقەپ کەشەفە برینجەکەی کێشایە بەردەم خۆی‌و وەها ئەیماشیەوە ئەتگوت لەوماوەدا دەمی لەهیچ نەداوە. باوکە بەبزەییێکی بەخشندەو پاك سەیری ئەکرد. "دیتان.. هەموومان هەر دێینەوە بۆ ئەم جێیە." دوانیوەڕۆ برای چکۆلە، ملی کەروێشکەکەی باداو لاشەکەی خستەبن نارنجێك. بەیانی رۆژی دوایی لاشەکەی لیّ‌نەمابوو. "ئەمە پێشنیاری سازشت بوو.. ئەگەر پێخوری بدەینیّ دیارە کاری بەسەرمانەوە نابیّ، لێمان ئەبووریّ.. رۆحی باپیرە گەورەکانمان خێرو خۆشیمان بەسەرابرژێنیّ... ئامین." رۆژانی دوایی بەتفەنگ‌و گەشەی درۆزنی چاوانی لەسووچێکا خۆی دائەگرت و هەرکە پۆلە چۆلەکەیێك لەگوێ پاشۆری حەوزەکە ئەنیشتەوە، ئەیتەقاند. پرژە پرژو جیکە جیکی زامار بەرزئەبوەوە رای‌ئەکرد، سەری‌چۆلەکەکانی هەڵ ئەکەندو پاشان لاشەکەیانی لەپەڕو پۆدا ئەماڵی‌و لەجیّ‌جێی ماڵەکەدای ئەنا. ئاسکە چاو بە دزییەوە بۆ ئەو قوربانییانە ئەگریاو لەترسی پیلان‌و سرتە سرتی دوو برا چکۆلەکان لەپەناو پەسێوی ماڵەکە ئەخزاو هانای بۆ شەخس‌و پیرەکان ئەبرد. برای چکۆلە ئەیگوت: "رۆژیّ ئەبیّ لاییێکی ماڵەکە بدەین بەو مارە. تێرو قەڵەومان کردوە. لەناو پێنج دەری‌دا پاپۆکە ئەکات‌و ئیتر نەئێمە لەو ئەترسین، نەئەوقینی لەئێمەیە، ئەتوانین دەردە دڵیشی لاهەلڕێژین، لەگەڵیا

خۆشی بکەین و لەپاڵیشیا بخەوین. پیرە مارێکی حەوت میتری لەناو پێنج دەری.." لەگەڵ گەرم بوونی هەوادا پارچە قەرەوێڵەیێکی دارینە یان لەگۆی حەوزەکە بەیەکەوە نابوو، شەوان قاڵیان لەسەر رائەخست و شێویان لەپاڵ تاریکی نارنجەکانجدا ئەکرد. شەوبۆکان هەزار ئەپشکووتن و ماڵی بێزەمان لەناو بۆن و بەرامەیانا دەئاوسا. باوکە لەبەرئەوەی خێزانەکە بەدەوری یەکەوە بوون بەسەرو دڵ خۆشیەوە باسی باپیرە، پێشینیان، موڵک و ماڵ و شەڕو شۆڕی رابووردووی ئەکرد. ئەم ئاسوودەییە بەری ئازایەتی و شەڕەکانی پیاوانی بنەماڵەیە. شوکرانە بژێرین و رێزی رابگرن. ئێمە لەوانین و بۆ ئەوان ئەژین. پاشان هەموو بێدەنگ ئەبوون و گوێیان بۆ دەنگی شنەبای ناو نارنجەکان رائەداشت.. نیوەشەو کاتێ خانوەکە ئەسپاردەی ئەو ئەرواحانە ئەکرا کەباوکە ناوی هێنابوون، برای چکۆلە ئەچووە ژوورەکەی برای ناونجی و هەردووکیان بەبێ چرا هەتا دەمەی بەیانی پێکەوە قسەیان ئەکرد. دەمەو خۆراواش کەدانیشتوانی ماڵەکە بۆیان دەرکەوت مارە بەتەنیا نیە، وادیار بوو ئەو دوانە بەلایانەوە سەیرنەبێ و لەسەرخۆو بەدڵنیاییەکی نهێنیەوە سەیری جووتە مارەکەیان کرد. مارەکان لەسەر قەرەوێڵەی گۆێ حەوزەکە سەمایێکی ئاشقانەیان ئەکرد. دەنگێکی نادیار رەوتەکەیانی رێك ئەخست. سەریان لەسەری یەك ئەسوو، ئەکشانەوە بۆ دواوەو دیسان بەهەوای یەکتر تاکوو ناو قەدیان لەزەوی بەرزو ئەبوونەوەو گەردنیان لەملاو لای یەکتری هەڵئەسوو، باوکە تریقایەوەو گوتی: بەچکەیان ئەبێ.. نەشەمەی باشە. مار بەختەوەرییە. مۆرەی خۆشەویستی ئەهێنێ و زاوزێیان بەبەرەکەت .." هەر ئەو شەوە، پاش دڵنیابوون لەخەوتنی هەموان هاتنە حەوشە. رووناکایی پەرێشانی ئەو چرا گرسۆزەی لەژوورەکەی باوکەدا دەئایسا ئەگەیشتە حەوزەکە. هەردووکیان بەپێخاوسی بەو پلیکانە بەردینانەدا سەرکەوتن کەبۆ ژوورەکەی باوکە ئەچوو. برای چکۆلە گوتبووی: "تەنیا چەند دڵۆپ.. نەشەوگێژ، شەوان بەچەشنێك ئەخەوێ ئەڵێی مردووە.. تەنیا چەند دڵۆپ ئەتکێنینە گوێچکەی.. بۆ هەتا لێی ئەخەوێ.. خوا لەمردووەکانمان خۆش بێت.." برای ناونجی بەئەسپایی دەرگای ژوورەکەی باوکەی کردەوە، هەردووکیان وەکوو تارمایی خزانە ناوەوە. باوکە لەوپەڕی ژوورەکە قورس و بەشکۆوەلێی خەوتبوو. هەناسە رێکەکانی نەفسی زەمان بوون. جووتەبرا هەنگاوێك بەرەو پێش چوون، بەڵام لەجێی خۆیانا وشك بوون. لەخوار قەرەوێڵەکەی باوکە، لەگەڵ هەست کردن بەتینی ئەوان، جووتێ مار سەریان لەسەر قەفەکانیان هەڵهێنا، دەمیان بەرەو رووی ئەوان لێك رەواندەوەو فیشکاندیان جووتە برا بەهەناسە ساردی، شەلاڵی ئارەقێکی تفت و تاڵ، بۆ هەمیشە کشانەوە دواوە..

هێشتا ساڵەهای ساڵی رەبەقی مابوو بۆ تەمەنی سەدو دەساڵانەی باوکەو رۆژی مردنەکەی، ئەو رۆژەی وەسیەت نامەکەی ئەکەنەوەو بۆیان دەرئەکەوێ میراتەکەی بەپێی داب و نەریتی باپیرەیان بەبرای گەورە براوە..

**ناونیشانی سەرچاوە:**

مومیاو عسل (مجموعه داستان)، چاپ اول 1375 – انتشارت نیلوفر

# ئانا ئاخماتۆڤا

- ئیرەج کابولی
- لەفارسیەوە: ع. پ


ئانا ئاخماتۆڤا

ئانا ئاخماتۆڤا کە دوای مردنی بەشاعیری ژنی هەرە مەزنی رووسیا ناوبرا، لەو شاعیرانەیە کە زیاتر لەبارەی خۆیانەوە ئەدوێن. بەلام لەبەر ئەوەی کە بەهۆی پاچپڕکەری و سەردانەنەواندنیانەوە بەرەنگاری دەست نانە بینی زاڵ بەسەر کۆمەلا ئەبن، لەخۆ دوانەکەشیان ئەبێتە قسەیەکی گشت کەسی و گشت شوێنی.

ئەو بۆخۆی لەژیاننامەیەکا بەناوی "کورتەیەك لەبارەی خۆمەوە" لەباسی سەرەتای ژیانیا ئاوا ئەنووسێ:

"لە 23ی ژوئینی سالی 1889 دا لە بال شۆی ڤانتان (کفارەی گەورە) کە لەنزیك بەندەری ئۆدیسایە، هاتمە دنیاوە. ئەوکات باوکم کە ئەندازیاری میکانیکی کەشتی بوو، لەهێزی دەریایی خانەنشین کرابوو. یەك سالانە بووم کە بردمیان بۆ باکوور؛ بۆ تێسارێسکۆیەسلۆ. شازدە سالی سەرەتای تەمەنم هەر لەوێ تێپەڕبوو."

تێسارێسکۆیەسلۆ یان "دێی پاشایی" هەر ئەو جێگایەیە کە پووشکین، شاعیری هەرە مەزنی هەموو چەرخەکانی رووسیاش، لاوی خۆی لەوێ تێپەڕ کردووە. ئەم هاوبەشیەی شوێنی ژیانی مێرمندالی (لەگەڵ پووشکین) بۆ ئانا یەکجار ئیلهام بەخش بوو و بۆ هەموو ماوەی تەمەنی پێوەی نازی.

"یەکەمین بیرەوەریەکانم لە تێسارێسکۆیەسلۆ ئەمانەن: شکۆی سەوزو روتوبەتداری باغەگشتیەکان، مێرگێك کە لەلەکەم ئەیبردم بۆ ئەوێ، مەیدانی ئەسپ تاودان بەو ئەسپە وردو درشتو رەنگاو رەنگانەوە کە غارغارێنیان تیا ئەکرد، وێستگە کۆنەکەو شتگەلێکی تر کە دواتر لەپارچە شیعری "دێی پاشایی"دا یادیان لیٚ کرا.

خوێندن لەرووی کتێبی ئەلفو بێی تۆلستۆیەوە فێر بووم. لە پێنج ساڵییما بەفەرەنسی زمانم کردەوە؛ ئەویش هەر بەگوێدان بەمامۆستای فەرەنسی منداڵە گەورەکان. یەکەم شیعرم لەیازدە ساڵیدا نووسی.."

باپیرەی ئانا ئاخماتۆڤا لەدایکیەوە یەکێك بووە لە خانەکانی تەتار بەناوی ئەحمەد کە لەزمانی رووسیدا ئاخمات گۆ ئەکرێ. ئانا خۆی لەبارەی ئەوەوە ئاوا ئەنووسێ:

"باپیرم ئەحمەدخان بەکرێ گیراوێکی رووسی شەوێك لە رەشماڵەکەیدا کوشتی.. وادیارە ئەم ئەحمەدخانە لە چەنگیزییەکان بووە."

لەساڵی 1905دا باوکمو دایکم لەیەك جیابوونەوەو دایکم لەگەڵ منداڵەکانا چوو بۆ باشوور. لەو یەك ساڵەدا کە لەوێ بووین، من پۆلی پێش کۆتایی ئامادەییم تەواوکردو لەدووری تێسارێسکۆیەسلۆدا زۆر شیعری بێ ئەزموونانەم نووسی."

باوکی، ئاندرێ گارین کۆ، کاتێ کە بیستی ئانا شیعر ئەنووسێ، روون نیە کە بۆچی بەم حوکمی بەر لەتاوانە گەیشت کە کچەکەی "ژنە شاعیرێکی هەرزەی" لیٚ دەرئەچێت؛ هەر بەم هۆیەشەوە بوو کە پێی وت: "بەم کارانەت ناوی من خراپ مەکە." ئەویش وەلامی داوە: "ناوەکەشتم پێویست نیە". و ناسنامەی ئەدەبی خۆی لەناوی ئاخماتی باپیرەی گرتەوەو بوو بەئانا ئاخماتۆڤ. پاش ئەوە زێری بەلگە رەسمیەکانیشی هەر بەم ناوەوە ئیمزا ئەکرد.

لەساڵی 1910دا لەگەڵ نەیاربوونی بنەماڵەکەشیا شووی کرد بە شاعیرێ بەناوی نیکۆلای گۆمیلیۆڤ. ئەم پەیوەندی هاوسەریە ئەنجامی ئەوینی یەك لایەنەی گۆمیلیۆڤو چەند جار دەست دانە خۆکوشتنی ئەو بوو، لەم رووەوە زۆری نەخایاند.

لەم سەردەمەدا لەگەڵ ئەوەشا کە شتگەلێکی ئەنووسی هێشتا خۆی بەشاعیر نەدەزانی. خەڵکی تریش هەر بەجیدی وەریان نەدەگرت، یەك لەوان شووەکەی بەدووبارە کردنەوەی ئەم قسەیە کە "لەشت بۆ بالێت سازکراوە" هانی ئەدا کە ببێتە سەماکەر. بەلام جۆشو کوڵی زاڵ بەسەر هەوای ئەدەبی رووسیای سەرەتای سەدەی بیستەما بۆ ئەو دڵرفێنتر بوو.

گۆمیلیۆڤ دەمو دەست لەدوای شیرین بێڵ (مانگی هەنگوین) و گەرانەوەی لەپاریس، چوو بۆ یەکێك لەسەفەرە ئاساییەکانی بۆ حەبەشە. لەماوەی دووری ئەوا بەهەلکەوت نموونەی پیت چن کراوی کۆمەڵە شیعری "جەعبەی داری سەرو" کاری یەکێك لەکارامەو وەرگێرە بەتواناکانی ئەدەبی کلاسیکی رۆژئاوا بەناوی ئانێنیسکی کەوتە دەستیو بوو بەهۆی ئەوە کە بەواتەی خۆی "دنیای لەبیر بچێتەوە". شێوازی

کاری ئانێنیسکی بەپێچەوانەی سەمبولیستەکان کە لەسەرەتاوە ئەویان بەیەکێك لەخۆیان ئەزانی، بەتەواوی "زەوینی" و "ئەم جیهانی" بوو.

ئانا دەمو دەست دوای خوێندنەوەی ئەو کۆمەڵەیە دەستی کرد بەنووسینو چونکە ئەیدی ئەوەی کە ئەینووسی، هەموو کەس، یەك لەوان گۆمیلیۆف پەسەندی ئەکەن، تێگەیشت کە رێگای خۆی دۆزیوەتەوە.

لەساڵی 1912دا لەگەڵ گۆمیلیۆفو دۆستانی هاوبەشیان کۆزیمینو گاڕادتێسکیو ماندێلێشتامدا بناغەی قوتابخانەیەکیان دانا بەناوی "ئاکمێیسم" (Acmeism) کە واتای واژەییەکەی شتێکە وەکوو "ئەوج خوازی".

ئاکمێزم لەسەر ئەوەیە کە جیهان هەر بەو جۆرە بنوێنێ کە هەیە، بێڕازاندنەوەو بێ ئاڵۆزیو لێڵی. ئەیەوێ لەشیعرا گشت واژەیەك هەر ئەو واتایەی ببێ کە لەژیانی راستەقینەو لەزمانی مرۆوە بەراستیەکانا هەیەتی. بڕیارە کە لەم شێوازەیا دۆخەکانو شتەکان هەمووی دیاریو زانراو و شیاوی ناسینەوەبن.

سێرگی گاڕادتێسکی لەم بارەیەوە ئاوا ئەنووسێ: "لە بەرهەمەکانی ئاکمێیستەکانا جوانی گوڵ بەهۆی گەلاو بۆنو رەنگی خودی گوڵەکەوەیە نەك بەهۆی یادبزوێنیگەلی دڵدارانەو زەینیو شتی لێڵی لەم بابەتە."

کۆزیمینیش لەوتاری "جوانی رێکو رەوانو ئاشکرا"دا کە لە جێی بەرنامەی کاری ئاکمێیستەکان بوو، ئاوای نووسی: "... مەنتیقی بن: مەنتیقی لەمەبەستا، لەبیناکاری (ساختار)دا، لە سینتاکس (نحو)دا.. لە رێك کردنی پارچەکانو گشتیەکانا وەك بیناسازێکی لێزان کاربکەن. وەکوو فلوبێر واژەتان خۆش بوێ؛ بۆ کەڵك وەرگرتن دەست بەکەرەستەکانەوە بگرنو لەبەکارهێنانی واژەدا لەچەر بن. وردو راست بڵێن تاکوو نهێنیەکی سەیر بکەوێتە دەستتان، نهێنی رێکو راست بەشکۆو جوان.."

ئەگەرچی ئاکمێیزم ماوەیەکی زۆر نەماوەو بەپەرەوانێکی پەیدا نەکرد، بەڵام بەهۆی ئەو چەند ناوە دیارەی ئەدەبی روسیاوە دەوریان هەبوو لەبەدی هاتنیا وەسفەکەی لەرووی چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە ئەگێڕینەوە. ئەوەڵ لە فەرهەنگنامەی شیعرو شاعێری پرینیستۆن چاپی 1974: ".. ئاکمێیستەکان لەو لێڵی رەمزو نهێنی خوازانەی سمبولیزم کە لەو سەردەمەدا باڵادەستی سەر شانۆی ئەدەبی رووسیا بوون، هەروەها لەو قسە زلانەی دەربارەی گیانی مۆسیقای شیعر دەکرا کە لەراستیا بە واتای هۆگری بەوەدەست هێنانی زیاترین هێزی سەلمێنەری شیعر لەسەر حسابی لەدەست دانی روونیو وردی هەست پێ کراوی شیعر بوو- دابڕانو بۆ دەست خستنی روونی ئاپۆلۆنیو وردی گرافیکی لەوێنەگەریا کۆششیان کردو هاتنە سەر ئەوە کە لە جیاتی هێنانە ئارای گیانی ناوەوەی شێتەکان تانو پۆکەیان پیشان بدەن.

ئاکمێیستەکان شاعیریان نەك وەکو بینەرێك یان پەیام هێنەرێك بەڵکو وەکو پیشەگەرێك لەبەرچاو ئەگرت (هەر لەبەر ئەمەیش بوو کە یەکەم کۆڕی ئەدەبی ئەکمێیستەکان ناوی رشتەی شاعیرانی لێ نرا.

شایەتی راستی بەکارهێنانی ئەم بیروباوەڕانە شیعرە پوختەکانی ئاسیپ ماندێلێشتام (1891-1942)ە دەسەڵاتدار بوون لەئەدەبی کلاسیکا لەگەڵ وێنەگەری چڕو مۆدێرنا تێکەڵ ئەکاو، هۆنراوە (نظم) دڵناسکانەو پڕ هەستەکەی ئانا ئاخماتۆڤا (1889- )یە کە بۆخۆی بە یەکێك لەشاعیرە دڵدارانە گۆیە

هـەرە چاكـەكانی رووسـیای ئەمرۆكـە دێنـە ئـەژماردن، بـەڵام نیكولای كۆمیلیـۆڤ (1886-1921) تیۆریستی سەرەكی ئەم قوتابخانەیە كە خۆی پـەیڕەوی بانگەشـەی بـۆ كلاسیزمی نـوێ دەكرد كـە بەشـێوەیەكی زۆر سـەیر مـەیلداری زەرقو بەرقی شیعر بوو.

ئەگەرچی ئاكمێیسم بووبـەهۆی بـەدی هـاتنی هێنـدێ شیعری سـەرنج راكێش، بـەڵام وەكـو بزووتنەوەیەكی ئـەدەبی تەمـەنێكی كورتـی بـوو، كە زیاتر لەكێشە نانەوەیەكی بێئـەنجام ئـەچوو. لـەدوای 1917یـش دەربەسـت نـەبوونی ئاكمێیسـتەكان بـە كێشـە كۆمەڵایەتیـە لـەئارا بووەكـان لەلایەكـەوەو پێوانـە جوانـی ناسـیە نەگۆڕانخوازانەكانیان لەلایەكی ترەوە بوو بەهۆی ئـەوەی كـە نەرەخنـەگرە رەسمیـە دەوڵەتیـەكان نێوانێكیان لەگەڵیانا ببێو نە پێشرەوانی ئەدەبی سەردەم".

لـەو پێشـرەوانەی كـە مەبەسـتی ئـەم فەرهەنگنامەیەن ئەكرێ دوو شاعیری ئەم خولە، واتە مایكۆفسكیو بلووك ناو بەرین كـە هـەردووك لەنەیارانی ئاكمێیزم بوون. بلووك لەوتارێكا كە دژ بـە ئـاكمێیزم نووسـیویەو دوای مردنـی لەسـاڵی 1925دا چاپ كراوە، لەسـەرەتاوە تێئەكۆشـێ كـە حیسابی ئاخما تۆڤا لەئاكمێیستەكانی تـر جیاكاتـەوە بـەڵام لـەئاكاما ناتوانێ كـە خـەوشی خۆی پێنەڕێژێو لەبارەیەوە ئاوا ئەنووسێ:

"نـازانم كـە ئـاخۆ ئـەو بەڕاسـتی خـۆی بـە ئاكمێیسـت ئـەزانێ یـان نـا، بـەڵام بـە دڵنیاییـەو ئەڵێم كە ناكرێ لەو شێوە حەساسو دڵ مردووە ژنانـەو خـۆ بەتـەوەرە زانانـە شـوێنەوارێ لـە پشكووتنی هێزی لەشو گیان بەدی بكەی.

بەڵام كۆمیلیۆڤـو چـەند كەسێ لەئاكمێیستە بەڕاستی خاوەن بەهرەكان خەریكن لەگۆلكاوێكی سارد لەبیرۆكەی بـێ رۆحو چەشـنگەلو جۆرگـەلی فۆرمـالیزمدا نوقـم ئـەبن. ئەمانـە لەخـەوێكان كـە نەخەون بینینی بۆ هەیەو نـە خەبـەرهاتن؛ نـە لـە ژیانی رووسی تەسەورێكیان هەیـەو نـە لـە ژیـانی جیـهانی؛ ناشـیانەوێ بیانبـێ، گرنگـترینو بـەنرخترین شت واتـە رۆح ئـەخنكێنن، هـەم لـە شیعرەكانو هەم لەبوون (وجود)ی خۆیانا".

ئەمەش رای خاوەن پلە رەسمیەكان لـەبارەی ئاكمێیزمـەوە لـەرووی واژەنامـەی (ئینسكلۆپیدیا)ی رووسیەوەو كە دەقەكەی چەند مـانگ دوای مـەرگی سـتالین دراوە بـەچاپ: "ئـاكمێیزم: فۆرمێكـی كۆنەپەرسـتانەیە لەئەدەبیاتا كە لـە (1912-1913)دا لەرووسیا قـەوارەی گـرتو هـەتا 1922 هـەر مـابوو، رێبەرایەتیەكەی بە گۆمیلیۆڤـو گاراد‌تێسكی بـوو و كەسـانێكی وەكـوو ئاخماتۆڤـاو تـاربۆی و ماندیلێشتامو خەڵكی تری بـەرەو خـۆی راكێشا. تایبەتمەندیەكانی هەڵوێستی ئـەدەبی- سیاسـی ئاكمێیزم بریتین لە: جووڵانەوەی دوژمنانە لەگەڵ جەریانگـەلی پێشـرەوی ئـەدەبیو ریالیزم، تـرس لەشۆڕش، یەكەخوازی زیادەڕۆیانـە، فۆرمـالیزمی رووس، راگـەیاندنی "هونـەری پـەتی" و هۆگـری بـەعیرفان. پـاش شۆڕشـی مـەزنی سۆشیالیسـتی ئۆكتۆبەر هێندێ لە ئاكمێیسـتەكان پاڵیـان دا بـە ئۆردووی دژی شۆڕشەوە".

هـەركام لەئاكمێیسـتەكان لەبنـەما راگـەیێندراوەكانی ئـەم شێوازە لێكدانەوەیـەكی تایبـەت بـەخۆی هـەبوو، بۆچونی ئاخماتۆڤـا بەكارهێنانی وردو كلاسیكیانەی زمانو قاڵب بوو.

لەساڵی 1912دا، واتـە سـاڵی پێـك هـاتنی "سـینفی شـاعیران" و بڵاوبوونـەوەی یەكـەم كۆمەڵە شیعری ئاخماتۆڤا، كورو تاقە منداڵی ئەو، لۆف گۆمیلیۆڤیچ لەدایك بوو.

لەم ماوەیەدا واتە لەساڵی 1914دا دووهەمین کۆمەڵە شیعری ئانا بەناوی "تەزبیح" بڵاوبووەوەو لەگەڵ ئافەریمێکی زۆرا رووبەڕوو




بوو. لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم گۆمیلیۆف بەخواستی خۆی چوو بۆ بەرەی شەڕو دوای شۆڕش گەڕاوە بۆ رووسیاو لەساڵی 1918دا هاوسەری ئەو لەگەڵ ئانایا کە هەر لە سەرەتاوە پەیوەندیەکی باش نەبوو، کێشایە جیابوونەوە.

ئانا کە پێی وابوو سەرنەکەوتوویی ژیانی هاوسەریەتی لەگەڵ گۆمیلیۆڤا لەو رووەوە بووە کە هەردووکیان شاعیر بوون و رەنگە تاریماییەکی ململانێ کەوتبێتە نێوانیانەوە، لێبڕا کە لەگەڵ دێرینەناسێکا بەناوی "شی‌لی‌کۆ" پەیوەندی هاوسەری ببەستێ، بەو هیوایەی کە رەنگە خزمەت کردن بە زانایەکی بەرجەستە بۆ ئەو دڵبزوێن بێ. بەڵام شی‌لی‌کۆ ژنی ئەویست نەك شاعیر، لەم رووەوە شیعرەکانی ئانای لەسەماوەرا ئەسووتاند.

بەر لە شۆڕش شی‌لی‌کۆ لەماڵێکی نەجیب زادانەیا بەناوی فانتانی دوم، واتە ماڵی کفارەدار، مامۆستای سەرماڵ بوو. لەدوای شۆڕش ئەو و ئانا کە لەبارەی خانووەوە زۆر داما بوون، لەهۆدەیەکی بەردەرگای ئەو ماڵەدا نیشتەجێ بوون.

لەساڵی 1917دا گەلێ لەگەورە هونەرمەندو ئەدەبیانی رووس کە لە دەست سانسۆرو دەست نانەبینی حوکمەتی تێزاری تەنگیان پێ هەڵ چنرابوو، شۆڕشی ئۆکتۆبریان لەمژدەدەری رزگاری زانیی و لەگەڵی کەوتن. ئەگەرچی ئاخماتۆڤا لەریزی ئەوانەدا نەبوو، سەرەڕای نارەزایەتیی و رێك نەکەوتنیش لەگەڵ شۆڕشا هەرگیز ئامادە نەبوو کە نیشتمان بەجێ بێڵێ، مانەوەو خۆڕاگری لەبەرانبەر دەست نانەبین و سانسۆری ستالینیدا بوو بەهۆی شانازیو بەدەسمایەی بەرهەمەکانی. خۆبەدەستەوەنەدان شاکاری ژیانی ئەوە. لەهەمان ساڵی 1917دا لەبارەی دڵەکورکێی کۆچ کردنەوە ئاوای نووسی:

***لەگوێما دەنگێك بوو***
***هێدیی و دڵنەواکەر***

*ئەی وت: "وەرە بۆ ئێرە،*
*لێگەڕێ لە وڵاتەکەت کە تاوانکارو دڵ مردووە.*
*دڵ بەردە لەرووسیا.*
*من لەدەستەکانتا خۆم ئەشۆم.*
*ئەو تەریقیە ڕەشە لەدڵت دەرئەکەم،*
*ناوێکی تازەی لێ ئەنێم*
*ئەو برینەی کە لەلێدانو سووکی پێ کردنەوە هەتە."*
*بەڵام من -هەر هۆمەزانە کەبووە- بەهێمنی*
*بەدەست گوێی خۆم بەست*
*تاکوو نزمی ئەم قسەیە پیس نەکا*
*ئەم گیانە سووکایەتی پێ کراوەم.*

لەساڵی 1919دا، واتە ئەو دەمەی کە هێشتا بۆ لادان لەئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی شۆڕش مەودا زۆر مابوو، فەرمانی یەکجارەکی خۆی -کە لەوانەیە بۆ ئەمڕۆ "پێغەمبەرانە"ش بێتە بەرچاو- بەم جۆرە دەرکرد:

*بۆ ئەم سەدەیە لەسەردەمانی دی خراپترە؟*
*نەبۆ وەی کە لەغەڵبەی ئێشو سەرسامیا*
*دەسی دا لەبرینێکی گەلێ ناسۆرو کۆنو ڕەش*
*بەڵام نەیتوانی چاری کاو دەرمانی نەکرد؟*

لەساڵی 1921دا گۆمیلیۆف، کە ئەویش نەیتوانیبوو لەگەڵ شۆڕشا بسازێ، بەتاوانی بەشداری لەپیلانێکا ئیعدام کرا. ئەم پێشهاتەو ئەو تیرۆرە سەختەی کە دوای ئەوە دەستی پێ کرد، جێگای ئاخماتۆڤای لە ریزی ناڕازیاندا چەسپاند. فەرمانبەرانی ئاسایشی ستالین پسپۆڕییان لەوەدا بوو کە خۆشەویستانێکی ئەم جۆرە کەسانەیان بە بارمتە ئەگرتو بە هەڕەشەی کوشتنی ئەوان ناڕازیەکانیان ناچار ئەکرد پێیانا هەڵ بلێن. بەم جۆرە بوو کە کوڕەکەی ئاخماتۆڤا کە بەڕواڵەت هیچ تاوانێکی نەبوو جگە لە شۆرەتی بنەماڵەیی گۆمیلیۆف، پەیتا پەیتا ئەگیرا.

کۆمەڵەی "ماتەمنیی" (Requiem) کە لەراستیا لاواندنەوەیەکە بۆ زیندووەکان، بەرهەمی چەندین سەعاتی چاوەڕوانی ئانایە لەبەر دەرگای بەندیخانەی لینینگراد بەناوی کریستی یا خاچەکان لەچاوەڕوانی هەواڵێکا لەبارەی ئەو حوکمەی بەسەر جگەرگۆشەکەیدا دراوە یان بۆ وەرگرتنی بەڵێنێك بۆ چاو پێکەوتنی.

هاوسەرەکەی تری ژیانی ئانا نیکۆلای پۆنینیش کەمێژوونووسی هونەر بوو، جارێك لەساڵی 1935 و جارێکی تریش لەساڵی 1949دا گیراو، لەساڵی 1953دا لە ئۆردووگایەکی بێگاریا مرد. پارچەی ژمارەیەکی "ماتەمینی" ئامازەیە بۆ گیرانی ئەو و لوف گۆمیلیۆف.

لە 1922 هەتا 1940 تەنیا یەکێ لەکۆمەڵە شیعرەکانی پێشووی سەرلەنوێ چاپ کرایەوە. داهاتی ئەم چاپە لەگەڵ حەقی وەرگێڕانی نامەکانی ڕۆبینس کە لەساڵی 1927دا چاپ کرا، لەدوای ساڵەها فەقیریو برسیەتی یەکەم داهاتی ئەو بوو. بەر لەوە خواردنی نانی وشکو چای تاڵ بوو.

تێ هەڵچوونی (رووسیا) لەشەڕی جیهانی دووهەما لەراستیا کرانەوەی پشوویەك بوو بۆ قوربانیانی تیرۆری دەسەڵاتداران، یەك لەوان لۆف گۆمیلیۆف کە لە بەندیخانە رزگارکرا بۆ ئەوەی بنێردرێ بۆ بەرەی شەڕ.

لەسەردەمی شەڕا چەند پارچە شیعرێکی نیشتمانی ئانا لەچاپەمەنیەکانا بڵاو کرایەوە. لەدوای ئەوەیش کاتێ کە لە تاشکەندەکە پەناگای زەمانی شەڕی بوو ئەگەڕایەوە، لەسەر ڕێگا لەساڵۆنی مووزەی پولی تەکنیکی مۆسکۆ

لەبەرانبەر کۆبوونەوەیەکی سێ هەزار کەسیا شیعر خوێندەوە. لەکۆتایی ئەم دانیشتنەیا خەڵکەکە هەستانە سەرپێو چەپڵەڕێزانێکی پڕ لەجۆش‌و خرۆشیان کرد، ئەمە نیشانیدا کە بە پێچەوانەی فشاری سانسۆرو دەست نانەبێن، خەڵك کەسایەتیە لە پێملی نەهاتووەکان ئەناسن‌و ڕێزیان بۆ دائەنێن.

کە گەیشتە لینینگراد لە "تارماییەك کە ئەیویست خۆ لە شارەکەی مندا دابنێ" تۆقی، بەڵام هیوادارانە دەستی‌دایە کار. ڕۆژنامەی ئەدەبی Literaturnay a Gazyezaیش بەڵێنی چاپی کۆمەڵەیەکی تەواو لەشیعرەکانی ئەوی دا. بەڵام ئەم بەڵێنە نەچووە سەرو لەجیاتی ئەوە لە 14 ئوتی 1936دا بڕیارنامەی کۆمیتەی ناوەندی کە گوزارشتێکی ژێدانۆڤی بەناوبانگی لەگەڵا بوو، بڵاوکراوە. لەم بڕیارنامەیەدا ئانا وەکو "یەکەخواز"، "خانمێك لەچینەکانی سەرەوە کە بەردەوام لەنێوان هۆدەی خەوتن‌و نوێژگەیا لەهاتو چۆدایە" و "لەخواترسێك یان سۆزانیەك- یان لەراستیا لەخواترسێکی سۆزانی کە سۆزانیگەری لەگەڵ دوعایا تێکەڵ ئەکا"و "شیعرەکەی تەواو دوور لە خەڵك‌و تایبەت بە دەهەزار کەس نەجیب زادەکانی رووسیای کۆنە" ناو برابوو.

هاوکات لەگەڵ ئەم هەراوهوریایەدا لۆف گۆمیلیۆف بۆ سێهەم جار گیرا. ئەم جارە پیلانە قەدیمیەکەی ئاسایشتیەکان کاری خۆی کردو لەساڵی 1950دا کۆمەڵە شیعرێکی لە ئاخماتۆڤا بەناونیشانی "سلاو لە ئاشتی"، داگری پازدە پارچە ستایشی ستالین لەگۆڤاری "ئاگانیووك" دا چاپ کرا. ئەمە تەنیا قیمەتی زیندوومانەوەی لۆف بوو، نەك ئازاد بوونی ئەو.

لەمانگی مای ساڵی 1956دا، چەند مانگ دوای نوقمی بەناوبانگی خرۆشچێف لەکۆنگرەی بیستەما لۆف گۆمیلیۆفیش ئازادکرا. ئابڕووداندوەی ئاخماتۆڤاش ماوەیەك جار لەگەڵ جار لە جەریانا بوو، هەتا ئەوەی لە ساڵی 1959دا جارێکی تر بەئەندامەتی یەکیەتی نووسەران‌و تەنانەت دەستەی سەرۆکایەتیەکەشی وەرگیراو ڕێگە درا کە بۆ وەرگرتنی خەڵاتی Etna Taorna سەفەری ئیتالیا بکا. لەساڵی 1965یشدا جەوازی سەفەری ئینگلیزو فەرانسەی وەرگرت و لەزانکۆی ئاکسفۆرد دوکتۆرای ئیفتیخاری پێ درا. ئاخماتۆڤا کەلە هاونیشتمانانی بۆ "ژێر باڵی بێگانە" راکردوو دڵخۆش نەبوو، هەرگیز لەم بارودۆخانە بۆ دابڕان لەریشەی خۆی‌و دەستەو داوێن بوونی بێگانە کەڵکی وەرنەگرت.

کۆچی دوایی لە پێنجەمی مارسی 1966دا ڕووی دا.

*ماتەمینی*

*نەلەژێر هەموو ئاسمانێکی نامۆدا*
*یان لەژێر باڵو پەری بێگانەدا*
*ئەو سەردەمە جێی من هەر ئەو جێیە بوو*
*کە، بۆ چارە ڕەشی، گەلەکەم لەوێ بوو.*
*1961*

*سەرەتا*

*باسی ئەو دەمە ئەکەم کە بزە*
*تایبەتی مردووان بوو*
*قایل بوون بەوگۆڕەی دەستیان کەوتبوو*
*ئەو دەمانە کە لێنینگراد کلکەیەك بوو*
*هەڵواسرابوو بە بەندیخانەکانیا*
*ئەو دەمەی کە دەستە دەستە بەندیان*

عەقڵ پەڕیو بەئازار
ئەڕۆیشتن‌و
بەستەی کورتی خواحافیزیانی
شووتی قەتار ئەی سەندەوە
ئەستێرەگەلی مەرگ بەئاسمانەوە بوون‌و
عورووسی بێتاوان گینگڵی ئەیا
لەژێر چەکمەی خوێناویا،
لەژێر تۆپی ماڕووسای(1) رەشا

# I

کازیوە ئەیانبردی‌و
من، وەك بڵێی بۆ ناشتنت، بەدواتەوە،
مناڵەکان لەتاریکی ژوورەکەیا دەم بەگریان،
مۆمی وێنەپیرۆزەکە بەبڵێسە،
لێوەکانت لەماچی وێنە پیرۆزەکە سڕ،
ئارەقی مەرگ بەسەر تەوێڵتەوە...
نەو، هەرگیز لەبیر ناچێتەوە
رۆژێ وەك ژنی تیرهاوێژەکان(2)
لەپای برجەکانی کرێملینا ئەگریم.

# VII

حوکم
زەبری ئەم واژە قورسە کۆتای
سینگم کە بەئاستەم گیانی تیابوو.
قەیدی نیە چونکە ئامادەبووم‌و
بەشیاوی خۆم رائەگرم.
چەندە کارم زۆرە ئەمرۆکە:
ئەبێ بیروەریەکانم پاکی بکوژم،
ئەبێ دەروونم وەك بەرد لێ کەم،
ئەبێ ژیان فێریمەوە سەرلەنوێ.
نەو.. ئاخر ئەوەتا ویزە ویزی هاوین
ئەڵێی ئاهەنگی گرتووە لەدەرێ.
من لەمەوبەر لەخەیاڵما دیبووم
ماڵەکەم چۆڵ‌و ئەئاوا رووناك.

# VIII

بۆ مەرگ
رۆژێ هەر دێی-
ئەی دەسا بۆ ئێستا نایێ؟
چاوەڕێی تۆم‌و گرانە دەردم.
رۆشناییم لەماڵەکەیا مراندو دەرکەکانم خستە سەرپشت
بۆ پێشوازیت،
ئەی هەمیشە سادە، ئەی موعجیزەی بێوێنە
سیمایەکی دڵخواز بەخۆت بگرەو بێ:
یان بەتیرێکی ژەهراوی لەدوور بمپێکە،
یان وەك دزێکی کارامە بە بەردەوە پێم بگرە رێ،
یان لە ژەهری داخی کەوتووییمەوە بتلێنە،
یان بۆم بڵێوە جارێکی تر ئەو داستانە دێرینەت
کە خۆم هەوەڵ تا ئاخر ئەیزانم:
دەستەیەك لەکڵاوشینەکان(3) دەم لەسەر پشت
بەدوای دەرگاوانی رەنگ بروزکاوا دێن.
هیچیان لەوانی تر جیاواز نیە،
ئەگوڕێنن: یینی سێ (Yenisey)
ئەستێرەی قوتبی لەحەوا جریوەی دێ.
راچەنینی دواهەمین جار تارئەکا دیسان
برووسکەی شین لەچاوگەلی ئازیزما.
29 ئووتی 1939
ماڵێ کفارەدار

1-"ماڕووسا" وادیارە ناوێکە کە خەڵك بۆ ئۆتۆمبیلی تایبەتی گواستنەوەی بەندیانی ئاسایشیان داناوە.

2-ئیشارەیە بۆ شیوەنی بێ سوودی ژنی دوازدە هەزار لەتیرهاوێژانی راپەڕیوی پێتێری گەورە لەپای برجەکانی کرێملینا بۆ بەرگری کردن لە ئیعدامی شووەکانیان.

3-فەرمانبەرانی ئاسایشی ستالین نەوارێکی شین بەدەوری کڵاوەکانیانەوە بوو.

# گفتوگۆ

▪ وتوویژێك لەگەڵ جولیا کریستیڤادا



▪ گفتوگۆیەك لەگەڵ تزڤیتان تۆدۆرۆڤ دا

# وتووێژێك لەگەڵ جولیا كریستیڤادا

- ئامادەكردنی: سوزان سیللەر
- لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداغی

**سوزان سیللەر: وەكو پرۆفیسۆری زانستی زمانو دوای بڵاوكردنەوەكانت لەسەر ئەو بابەتانە لەفەلسەفەوە بۆ رەخنەی ئەدەبی، دیسان چی وایلێكردیت كە وەكو دەرونشیكارێك كاربكەیت؟**

**جۆلیا كریستیڤا:** بەبڕوای من ناكرێت كەسێك بخرێتە سنووری دەرونشیكارییەوە ئەگەر هەندێ پاڵنەری تایبەتیو شاراوە بوونیان نەبێت.. بۆ نموونە ژیانی پڕ لە تەنگو چەڵەمەو ئازار چەشتنێك كە توانای خۆگوزارشت كردنی نەبێت، لەو هۆكارانەن. من لەبارەی ئەم جۆرە شتانەوە قسەم بۆ دەرونشیكارەكان كردو هەروەها ئەمڕۆش دەتوانین لەبارەی پاڵنەرەكانی كارەكەمەوە ئاخاوتن بكەین.

من ویستم لەمیانەی سنووردارێتییەكانی زماندا حاڵەتەكان تاقی بكەمەوە، واتە لەو چركە ساتانەدا كە بۆنموونە زمان لە دەرونشیكاریدا دەوەستێ یان ئەو كاتەی كە زمان چیتر بوونی نامێنێت بۆ نموونە لەكاتی راهێنانی منداڵدا لەسەر زمان. بەلای منەوە وادیار بوو كە ستەمە كەسێك لەسەر وەسف كردنی شتێك بگەیەنێتە ئاستی قەناعەت هێنان كە ئەو وەسفكردنە واخۆی بخاتەڕوو كە بابەتیو (Objective) بێلایەنیش بێت لەم دوو حاڵەتەدا چونكە هەڵبژاردنی نموونەكان ئاسایی دەكەوێتە پێش دانانی جۆرێكی تایبەتی لەپەیوەندی كردن لەگەڵ ئەو كەسانەی كە قسەت بۆ دەكەن.

هەروەها لێكدانەوەی قسەی خەڵكی لەپێشتر دادەنرێتو تۆ خۆت دەخەیتە سنووری مانای ئەوەی كە ئەوان دەیڵێن. من بینیم كە بابەتی بوونی بێلایەنانەی شیاو لە وەسفكردنەكانی زماندا بوونی نییە لەسەر بنەمای سنوورداریی‌یەكانی زمان خۆیو ئەوەی كە ئێمە

بەردەوام دەبینین کە دەرونشیکاری ناوی دەنێت "گواستنەوە". من پێم وابوو کە ئەوە شتێکی ناڕەوایە کە ئەم گواستنەوەیە باس بکەم ئەگەر بێتو خۆم نەخەمە بواری ئەزموونی تاقیکردنەوەی دەرونشیکارییەوە.

**سوزان:** بەشێکی گرنگی تۆژینەوە دەرونشیکارییەکەت پرۆسەیەک بووە تیایدا تاک (فەرد) زمان بەدەست دێنێ. ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی هەمە لایەنە چییە؟

**جولیا:** من زاراوەی "پرۆسێس"م کاتێ بەکارهێنا کە خەریکی ئیشکردن بووم لەسەر دەقەکانی ئەنتوان ئارتۆ: ئارتۆ نووسەرێکی لەرادەبەدەر پەشێو و ناسەقامگیرە لەمێژووی نوێی ئەدەبی فەرەنسیدا. ئەوەش بەشێکی لەبەر ئەوەیە کە ئارتۆ تاقیکردنەوەی ئەزموونی شانۆی "شێتی" کردووە، بەشێکی تریشی لەبەر ئەوەیە ئەو بەوریایی بیری لە مۆسیقای زمان کردۆتەوە. هەرکەس دەقەکانی ئارتۆ بخوێنێتەوە تێدەگات کە هەموو ناسنامەکان ناجێگیرن، ناسنامەی ئاماژە زمانییەکان، ناسنانەی ماناو لەئەنجامی ئەوەشدا ناسنامەی قسەکەریش (ناجێگیرە). بەمەبەستی ڕەچاوکردن و بەهێزگرتنی ئەم ناجێگیرییە لەماناو بابەتدا من بیرم لەوە کردەوە کە دانانی زاراوەی "بابەت لەجوڵەدا" بۆ ئەوە گونجاوبێت. پرۆسێس یان (جوڵە) لێرەدا مەبەست لە پرۆسێسە لەڕوانگەی پرۆسێسەوە، هەروەک مەبەست لەپرۆسێسیش لەڕوانگەی کاری یاساییەوە لەکاتێکدا کە بابەتەکە بخرێتە حاڵەتی هەڵسەنگاندنەوە، چونکە ناسنامەکانی ئێمە لەژیاندا بەشێوەیەکی بەردەوام دەخرێنە بەردەم پرسیارەوەو دادگایی دەکرێن و حوکمیان بەسەردا دەدرێت.

من ویستم ئەو زمانە تاقی بکەمەوە کە ئەم حاڵەتانەی ناجێگیری ئاشکرا دەکات چونکە لە پەیوەندی کردنی ئاسایدا زمان ڕێك دەخرێتو شارستانیانە دەکرێت- ئێمە ئەو حاڵەتانەی پەیوەندیکردن سەرکوت دەکەین. ئەفراندن هەمان شێوەی ئازارچەشتن ئەو چرکە ساتانەی ناجێگیری دروست دەکات کە تیایدا زمان یان ئاماژەکانی زمان یان بابەتێکی خۆیان دەخرێنە سنووری پرۆسێسەوە. خەڵکی دەتوانێت ئەم فیکرەیە هەڵسەنگێنێ، چونکە بەکارهێنانی تەنیا تایبەت نییە بە دەقەکانی ئارتۆ بەڵکو بۆ هەموو دەقێك دەبێت کە تیایدا ئێمە بەرەو دەربازبوون لەحاڵەتە ئاساییەکان بچین.

**سوزان:** نووسین لەبارەی ئەم پرۆسێسەوە یەکێکە لەو جیاکردنەوانەی کە تۆ نەخشەت کێشاوە ئەویش بەمەبەستی هێڵکاری بەرەوپێشەوە چوون (نەشونوماکردن) لەساوایەکی جیانەکراوەدا بۆ قسەکردن لەسەر بابەتێك کە ئەویش بریتییە لە جیاکردنەوەی نێوان ئاماژەکاری و هێماکاری. دەتوانیت ئەم جیاکردنەوەیەمان بۆ روون بکەیتەوە؟

**جولیا:** بۆ ئەوەی تۆژینەوەی ئەم حاڵەتەی ناجێگیری بکرێت، راستییەکەی ئەوەیە کە مانا ئاسایی بنیادێك یان پرۆسێسێك نییە یان بابەتەکە ئاسایی بریتی نییە لەیەکەیەك، بەڵکو (پێکهاتەیەکە) کە بەردەوام دەخرێتە بەردەم پرسیارەوە. من پێشنیاری ئەوەم کرد کە دوو حاڵەتی مانا یان دوو شێوە کە ناوم بردن بە ئاماژەکاری و هێماکاری بەهێند بگیرێن، ئەوەی بە ئاماژەکاری ناوی دەبەم دەمانگێڕێتەوە بۆ حاڵەتەکانی پێش زمانی سەردەمی منداڵی کە لەو کاتەدا منداڵ ئەو دەنگانە دەردەپەڕێنێ کە دەیان بیستێ، یان کاتێ ئیقاع یان دووبارە کردنەوەی پیتەکان یان کرداری قورسی خستنە سەر پیتەکان ئەنجام دەدات هەوڵدەدات لاسایی کەسانی دەوروپشتی خۆی بکاتەوە. لەم حاڵەتەدا هێشتا منداڵەکە نەبۆتە خاوەنی ئاماژە پێویستیەکانی زمان، لەبەر ئەوە ئەگەر بەوردی

بڕوانین ئەوا قسەكانی مانایان نییە. تەنیا لەدوای قۆناغی ئاوێنەیی یان ئەزموونی سڕینەوەی گرێی ئۆدیبدا تاك (فرد) لەرووی بابەتییەوە توانای وەرگرتنی ئاماژەكانی زمانو دەربڕینی لەلا پەیدا دەبێت كاتێ ئەو دەربڕینە ڕێكخراو بێت —ئەوەش ناودەبەم بەهێماكاری.

**سوزان: لەراستیدا لەقۆناغی ئاوێنەیی یان لەگرێی ئۆدیبدا چی ڕوودەدات؟**

**جۆلیا:** ناسینەوە (دەست نیشان كردن) ڕوودەدات، ئەوەی من بە ئاماژەكاری ناوی دەبەم بریتییە لە حاڵەتێكی پەرتبوون كە تیایدا نموونەكان یان (شێوازەكان) دەردەكەون بەڵام هیچ ناسنامەیەكی چەسپاویان نییە: بەڵكو نائاشكراو ناجێگیرن، كە لێرەدا لەبواری ئیشكردندا هەر ئەو پرۆسێسانەن كە فرۆید پێیان دەڵێت "سەرەتایی پرۆسێسەكانی گواستنەوە". ئێمە نموونەیەكمان لەسەر ئەم حاڵەتە هەیە ئەگەر جارێكی تر بگەڕێینەوە بۆ ئیقاعە خۆشەكانو دەربڕینی منداڵان كە ئەو دەربڕینە وێنەیەكی ئاشكرای ناجێگیریتی جەستەییانە، جەستەی ساوایانو منداڵان پێك دێت لە ناوچەكانی (وروژاندن) كە ئەم بەشانەش لەرادەبەدەر دەوروژێن، یان بەپێچەوانەوە لەحاڵەتی كەمتەرخەمیدان، لە هەلومەرجی گۆڕینی بەردەوامو وروژاندندا یان لەحاڵەتی نەمانی چالاكیدان بەبێ ئەوەی هیچ ناسنامەیەكی جێگیریان هەبێت.

لەوانەیە "ناسنامەی جێگیر" ڕۆمانێك یان وەهمێك بێت ئایا ئەو كەسەی لەنێو ئێمەدا یەكێتیەكە ناسنامەیەكی جێگیری هەیە؟ ئەوە فانتازیایەكە لەجۆرێكی تایبەتی كە هەرگیز پێی ناگەین. چەند هەنگاوێك هەن كە دەبنە هۆی ئەم جێگیریتییە، هەروەك هەنگاوێكی تریش هەیە كە لەلایەن دەروونشیكاری فەرەنسی جاك لاكانەوە گرنگی زۆری پێدراوە كە ئەویش تێرامانە لە ناساندن یان (دەستنیشانكردنێكە) كە ناوی دەبات بە (قۆناغی ئاوێنە). لەم قۆناغەدا كەسێك وێنەی كەسێك لەئاوێنەیەكدا دەناسێتەوە وەكو وێنەی ئەو كەسە خۆی. ئەوەش یەكەم دەستنیشانكردنی جەستە پارچە پارچەبوو بەشێوەكەیە كە لەیەك كاتدا گرژو ئاسوودەشە. ناساندن (دەستنیشانكردن) لەژێر دەسەڵاتی وێنەی دایكدا دەبێت كە نزیكترین كەسە لەمنداڵەكەیەوە ئەوەش بوار بە منداڵەكە دەدات كە نزیك لەدایكی بمێنێتەوە یان خۆی دووربخاتەوە.

من ڕوخسارێك دەبینم. لەو بینینەدا یەكەم جیاكردنەوە ڕوودەدات، بەم شێوەیە یەكەم ناسنامەی خود دەردەكەوێت، بەڵام ئەم ناسنامەیە هێشتا ناجێگیرە چونكە هەندێ جار وا سەیری خۆم دەكەم كە ئەو ڕووخسارە من بم هەندێ جاریش لەگەڵ دایكمدا خۆمم لێ تێك دەچێت. ئەمەش ناجێگیر نەرسیسیە Narcissistic، ئەم گومانكردنە وام لێدەكات بپرسم: من كێم؟ ئەمە منم یان كەسێكی ترە؟ تێكەڵاوكردن لەگەڵ وێنەی دایكدا وەكو یەكەم (ئەویتر) دەمێنێتەوە.

بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەم تێكەڵاوكردنە دەربازبین، شێوازی كلاسیكانەی بەرەو پێشەوە چوون بەرەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەسنووری سێ گۆشەی ئۆدیبیدا دەمانبات ئەویش لەنێوان ئارەزوومان بۆ دایكو پرۆسێسی ونبووندا كە دەرئەنجامی دەسەڵاتی باوكایەتییە. لە بارە نموونەیەكەیدا، ئەمە بە جێگیربوونی بابەتەكەو گواستنەوەی توانای (دایك/ باوك) تەواو دەبێت كە هەردوو ڕستە وتراوەكان لەگەڵ دەستوورو یاساكانو لەگەڵ گێڕانەوەی بەسەرهاتەكە بۆ (دایك/ باوك) یان بەهێندگرتنی شوێنی (دایك/ باوك)دا دەگونجێت.

ئەمانەش بەدەستهێنانە هێماکارییەکانە کە بەتاقیکردنەوەی دەروونیانەی تایبەتی پێشتر مەرجدار ئەنجام دەدرێن کە ئەویش بریتییە لە جێگیرکردنی خود لەپەیوەندی کردندا لەگەڵ ئەوانی تردا.

**سوزان: یەکێك لەو وێنانەی کە بەکارت هێناون بۆ روونکردنەوەی ئەم پەیوەندیکردنە ئاماژەکارییە بۆ دایکایەتی ئەوەی (کۆرا-Chora)یە، دەتوانیت ئەم وێنەیە روون بکەیتەوە؟**

**جۆلیا:** من بڕوام وایە ئەم نموونە ئاماژەکارییە کۆنە کە من بۆی گەڕاومەتەوە وەکو دەربڕینەکانی (ساواکان) بەو مەبەستەیە کە پێناسەیەکی روونتری پێ ببەخشم کە ئەویش نموونەیەکە تەحەمولی زۆربەی یادەوەرییە کۆنەکانی پێکەوەبەستنی ئێمە لەگەڵ جەستەی دایکدا دەکات. ئەویش لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئێمە هەموومان جەستەی پێچەوانەی (بەرامبەری) جەستەی دایکمان هەیەو، کاتێ جۆرێك ئیرۆتیکای خود لە ئەزموونەکەی (دایك)دا بەش نەکرێت، ئەوا ئێمە دەنگ یان ئاماژە نووسراوەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە لەسایەی بەدەست هاتەکانی دواترماندا کۆنترۆڵ دەکەین، کە ئەمەش مەرجێکی گرنگە بۆ سەربەخۆبوون.

سەرەڕای ئەوە دەشێ رێگای جیاوازی سەرکوتکردنی ئەم تاقیکردنەوەیە لەئارادا بێتو دەشێ سەرکوتاندنەوەیەکی سەیریش بێت، کە دوای ئەوە ئێمە لەسەر لم (وێرانە) بینا دەکەینەوە چونکە بنچینەکە رووخێنراوەو لەنێوبراوە. یان لەوانەیە هەولوکۆشش هەبێت بۆ گواستنەوەی ئەم کێشوەرەو ئەم ناوەڕۆکە لە پشتی هێماکارییەکەوە. بەوتەیەکی تر لەدوای قۆناغی ئاوێنەو سڕینەوەی گرێی ئۆدیبی ئەوە دەبێت. (وشەی Chora) لەزمانی گریکیدا مانای ناوەڕۆك دەگەیەنێت کە دەمانباتەوە بۆ لای چەمکی وینکۆت لەسەر رامکردن- گرتن: دایكو منداڵ لەپێکەوە بەستنێکی بەردەوامدان کە لەو پێکەوە بەستنەدا هەریەکەیان. رامی ئەویتر دەکات (یان ئەویتر دەگرێت) لێرەدا دوو چوونە ناوەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە منداڵەکە رام دەکرێتو هەمان شێوەی منداڵەکە دایکەکەش رام دەکرێت.

لەو خاڵەوە، ئێمە گەواهی لەسەر ئیمکانیەتی خوڵقاندنو بڵندبوون دەدەین. من بڕوام وایە کە هەر جۆرێکی خوڵقاندن (ئەفراندن) تەنانەت ئەگەر لەبواری زانستیشدا بێت ئەوە پەیوەستی ئەم ئیمکان بوونەی کردنەوەی دەرگای بەردەم رەفتارە ئاساییەکانە بەرەو ئاسوودەیی، کە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونێکی کۆن لەگەڵ شتێکی پێشتری دایکسالاریدا.

**سوزان: پیادەکردنەکانی ئەمە (کۆرا) بۆ ئەفراندنی ئەدەبی چییە؟ ئایا ئافرەتان بەحەقیقەتی خۆیانەوە یان بە ئەزموونی شاراوەی دایکایەتییەوە پەیوەندییەکی بالایان بەم ئاماژەکارییەوە هەیە؟**

**جۆلیا:** ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەم ئەزموونە ئاماژەکارییەی (کۆرا-Chora) لەزماندا شیعر بەرهەم دێنێ. دەتوانرێت (کۆرا) وەکو سەرچاوەی هەموو هەوڵێکی شێوازو گۆڕانکاری ئاسایيو رێکخستنی لۆژیکانە بێت لەرێگای شێواندنی (تێکشکاندنی) زمانەوە ئەویش بە دروستکردنی میتافۆرو میتۆنۆمیو مۆسیقا.

ئەوەندەی کە پەیوەندی بە ئافرەتەوە هەبێت مەسەلەکە هێجگار ئاڵۆزە. لەلایەکەوە زۆر لە ئافرەتان -ئیتر گرنگ نییە بنیادی حاڵەتی تایبەتییان چییە: (کەئابەیە) یان هیستریایە یان تێکچوون.. ناڕەزایی ئەوە دەردەبڕن کە ئەوان زمان وەکو شتێکی دووەمی بەکار دەهێنن، شتێکی ساردو بێگانە بەژیانیان، بە هەستو

سـۆزیان، بـەئێش و ئازارەکانیـــان، بەحــەزو ئارەزووەکانیـان، وەکـو ئــەوەی زمـان شـتێکی بێگانە بێت پێیان. هــەروەها کاتێ ئەمـە دەڵێن ئێمە ئاسایی ئەو تێڕوانینەمان لا دروسـت دەبێت ئەوەی ئەوان دەیپرسن بریتی‌یـە لـە زمـان وەکـو راهێنانێکی لۆژیکانە. ئەم ناڕەزاییە دەشێ بەدوو رێگا ببیسترێت. کـە دەشـێ رەفزکردنێـك بێـت بەمەبەستی ملدان بۆ پەیوەندیکردن کـە ئــەوەش داوای قوربانی دانێك لە هەرکەسێك دەکات- چـی لەپیاو چی لـەئافرەت. ئـەم رەفزکردنـە ئاسـایی بــەجۆرێکی تایبـــەتی لەلایـــەن فیمیـــنزمی رۆمانسیانەوە وەکو حاڵەتێکی شۆڕشگێڕانە لێك دراوەتەوە، بەڵام هەمیشە ئەمە حاڵەتەکە نی‌یـە. لەوانەیە زۆر بەئاسانی ئـەوە ببێتـە هـەوڵێك بـۆ راکـردن لەدەســـتی کۆمـــەڵگاو ئــاڵوگۆڕکردنی پــەیوەندی‌و ببێــت بــە پەناهــەندە لــەجۆرە حاڵـەتێکی رۆحـی نادیـاردا کـە ئــەوەش دەشـێ لەرادەبەدەر گەڕانەوە بێت بۆ دواوەو بۆ حاڵــەتی نەرسیسـیەت. مــن پـــەیوەندی ئــاڵوگۆڕکردنی لۆژیکانـــە رەت دەکەمـــەوە، پـــەیوەندی ئاڵوگۆڕکردنی لۆژیکانە بۆمن وەکو غەریبێك وایە، لەبەر ئەوە دەگەڕێمەوە بۆ ئەزموونی کۆنی خـۆم کە تیایدا لـەدوای چێـژو خۆشی جەسـتەی دایك دەگــەڕێم. مــن ئــەم گەڕانەوەیــەش وەکــو تەحەدایەکی شۆڕشگێڕانە ئەنجام دەدەم.

لەلایـەکی تـرەوە وابـیر دەکەمـەوە کـە دەبـێ گوێ بگرین لە راستی ئازارچەشتنێکی تایبەت کە ئەو ناڕەزاییانە ئاشکرای دەکەن. ئەمەش کە پێك دێــت هیــچ شـــتێکی نیشـــانە (code) کۆمەڵایەتیـــــەکان، پەیوەندیکردنـــــــە کۆمەڵایەتیـەکان‌و بنـەمای ناسـنامەکانی ئێمـەی تێـدا نی‌یــە کــە (شـێوە) ئاماژەکارییـــەکان لەسـنووری زمـانـدا سـەرکوت دەکرێـن‌و فـرێ دەدرێنـە سنووری شێواندنەوەی لەگـەڵ راسـتی نەبیستنیاندا، لەگـەڵ پێنـەدانی هیچ جێگایــەك پێیاندا. (بـەم جـۆرە لەرێگایـەکدا بـۆ کوشـتنی دایکایەتی‌و وابەستەیی هەر بابەتێك کە پەیوەندی بەدایکایەتیـەوە هــەبێت) بـەجێمان دێڵێـت بـۆ کەئابەو بۆ هەستکردن بەغەریبێتی. زۆر ژن‌و پیاو ئەمە تاقی دەکەنەوە وەکـو دەروونشیکارێك کـە دژی ئەوکەئابەیـە بێـت، مـن ئاسـایی لـەدوای دوو شت دەگەڕێم. لەلایەك مـن لـەدوای دەربـازکردنی ئەو رق‌و کینەیە دەگەڕێم کە توانای خۆدەربڕینـی نەبووە هەتا خۆی ئاشکرا بکات (کەئابــە ئاسـایی بریتی‌یـە لــە ئــەنجامی ئــەو رق‌و کینەیــەی کــە لەناونەچووە -کۆتایی پێ نەهاتووە).

لەهـەمان کـاتدا مـن لـەدوای ئـەو نووسـراوانە دەگەڕێم لـەزماندا کـە پـەیوەندی کۆنیـان لەگـەڵ جەستەی دایکایەتی هەبووەو لـەبیریان چۆتـەوە. ئـەم نووسـراوانە لـەکوێدا دەدۆزرێنـــەوە؟ دیـارە لەمانای ئەو شتەدا نادۆزرێنەوە کـە نەخۆشـەکان دەیلێن چونکە مانـای قسـەکەیان بەشـێوەیەکی چەندبارە بـووەوە بێ‌بەهاو بێ نەخشـەیە. دوور لەبەدواچوونەو پێکەوە پەیوەسـت نـین. ئـەوەش دەشێ لەئیقاعی دەنگدا، لـەخێرایی گوتـنـدا یـان لــەبێ‌مانایدا یـــان لەمۆســـیقای تایبــــەتیدا بدۆزرێتـەوە. یـان لەدووبارەکردنــەوەی پیتــە یەکەمەکاندا کە ئـەوەش ماناکانیـان وەکـو ئـەوە وایــە: ئــەلیس ویندەرلانــد کەسـێکە دەبــێ دەستەواژەکان تێك بشکێنێ بـۆ ئـەوەی بگـەڕێت لـەدوای "وشـەکانی نێـو جانتاکـەی"، کـە مانـای راستەقینەی ئارەزووە بریندارەکـەی هـەڵدەگرن‌و تیایـاندا ئـەم پەیوەندییـە دێرینـە بەدایکـــەوە حاڵــەتی پەناهــەندەیی وەردەگرێــت. ئەمــەش پێویستە بۆ ئەوەی بتوانرێت جێگیریان بکاتەوەو بۆهــەر تاکـە کەسێك‌و بەتایبـەتیش بـۆ هــەر ئافرەتێك خـاڵێکی نوێی جیابوونـەوە دروسـت بکات.

**سوزان: ئایا دەشێ زمـانێك یـان نووسـینێك جیابکرێتەوە کە تایبەت بێت بە ئافرەتان؟**

**جولیا:** من لەبارەی ئەم خاڵەوە هێجگار بەگومانم چونکە ئەوەی ئەمڕۆ بەدڵنیاییەوە بەنووسینی ژنان دادەنرێتو خۆی لەنووسینی پیاوان جیادەکاتەوە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسنووری هەڵبژاردنی فیکرەی نووسینەکاندایە. بۆ نموونە ئێمە دەربارەی بەئاگایی منداڵ یان دایکایەتی دواین بەڕێگایەك کە ئافرەت توانایان نەبووە لەو بوارەدا چونکە ئێمە (واتە ئافرەتو پیاو-ع) هەمان ئەزموونی مێژوییو کۆمەڵایەتی یان خێزانیمان نییە.

تا ئەو ئاستەی کە پەیوەندی بە شێوازەوە هەبێت، دینامیکییەتی راستەقینەی زمانو، ئەم گەڕانەوەیە بۆ ئاماژەکاریو، نەخشەی پەیوەندی دێرینە بەدایکەوە لەزماندا- بریتی نین لە داگیرکاری ئافرەتان.

نووسەرانی پیاوی وەکو جۆیسو مالارمێو ئارتۆ سەلمێنەری ئەم قسەیەن. ئەمەش پرسیارێکە سەبارەت بە حاڵەتی (خود) ێتی- شتێکی شیاوە کە لە ئەفراندنی ئێستاتیکیدا ئێمە هەندێ ئیحتمال بەکاردەهێنن. هەر ئەفرێندەرێك بەشێوەیەکی پێویست لەمیانەی ناساندنو (دەستنیشانکردن)دا لەگەڵ دایکایەتیدا دەجووڵێت کە لەبەر ئەوەیە ژیانەوەی ئەم دینامیکییەتەی ئاماژەکاری لەهەر کردەیەکی ئەفراندندا گرنگە.

پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا پیاوانو ئافرەتان بەهەمان ڕێگا لەگەڵ دایکی هەمیشەییدا پەیوەستنو لەو پەیوەستبوونەشدا یەکسانن؟ لەراستیدا من جیاوازییەك نابینم. لەڕوانگەی دەروونیەوە دەڵێم بۆ ئافرەتان ئەوە کارێکی زۆر گرانە چونکە ئافرەت رووبەڕووی شتێك دەکرێتەوە کە جیاواز نییە، ئەو هەمان شت رووبەڕووی دەکرێتەوە. چونکە ئێمە دوو ئافرەتین. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ پیاوێك ئەوی (ئافرەت) ئەوێکی ترە. بۆ پیاوان ئەم لێکچواندنە (هاوشێوەکردنە) لەگەڵ دایکایەتیدا چێژوخۆشییەکی تێدایە، لەکاتێکدا بۆ ئافرەتان سەرکێشییەکی دەروونی وابەستەیە. من خۆمم ون کرد، ناسنامەکەمم ون کرد.

لەوانەیە ئەمە ئەوە روون بکاتەوە کە بۆچی بۆ ئافرەتان زۆر گرانە لەدۆزەخ دەربازبن. ئەم هاتنەخوارەوەیە: ئۆرفیۆس دەرباز دەبێت بەڵام یۆربیدس دەبەزێت.

**سوزان: ئایا ئەمە روونی دەکاتەوە کە بۆچی بەشێکی زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکانت گرنگی بە نووسەرانی نێرینە (پیاو) دەدات؟**

**جولیا:** من ئێستا بەردەوام لەسەر حاڵەتی میلانکۆلی (حاڵەتی دڵتەنگی درێژخایەن) کاردەکەمو دەقەکانی مارگیرات دۆراس وەکو نموونەی نووسینی نوێ سەبارەت بە ئازارچەشتن بەکاردەهێنم. لەدەقەکانی دۆراسدا بیرۆکەی ئازارچەشتن هەیە لەگەڵ وەسفکردنی سیمینتیکانەی ئازارچەشتندا کە ئەوەش لەهەر توژینەوەیەکی شێوازی یان زمانەوانیانە زیاترە، کاتێ داهێنان یان نوێکردنەوەی شێواز روودەدات بەشێوەیەکی سەرەکی لەشێوازی ناتەواو تێکەڵو پێکەڵدا دەبێت. هەر لە ڕێگای ئەو ناتەواوییەوەیە کە رستەکانی دۆراس ئازارچەشتنێك دەنوێنن لەبری ئەو یارییە ئاگرییەی جۆیس کە خۆشیو ئاسوودەییو مۆسیقای تێدا گوزارشت دەکرێت. لەلای دۆراس گوزارشتکردنی ئازار ئازاربەخشە.

**سوزان: نوێترین بەرهەمت پەیوەندی نێوان میلانکۆلی یان کەئابەو ئەفراندنی ئاشکراکردووە. چۆن ئەم بەشە تایبەتییەی توژینەوەکەت گەیشتە ئەنجام؟**

**جۆلیا:** ئەوە لەو تێبینییە دەروونشیکارییەوە دەست پێدەکات کە کەئابە بە ئاشکرا نەخۆشییەکی ئەم سەردەمەیە. خەڵکێکی هێجگار زۆر بەدەستی کەئابەوە

دەناڵێنن، ئێمە لەبواری دەروونشیکاریدا تێبینی ئەوە دەکەین کە زۆرێك لەوانەی دووچاری کەئابە بوون واخۆیان نیشان دەدەن کە دووچاری هیستریا یان دڵەڕاوکێ بوون، بەڵام لەراستیدا کەئابەیانە. ئەوەش گرنگییەکی هەمە لایەنەی هەیە، چونکە گیروگرفتێکە دەکەوێتە سەرخاڵی یەکتر بڕینی نێوان توژینەوەی بایۆلۆژیانەو سایکۆلۆژیانە.

چەند ساڵێك پێش ئێستا دەرونشیکاری کەوتە بەردەم ڕووبەڕوو بوونەوەوە لەلایەن زانستی زمانەوە. ئێستاش لەڕوودا وەستانێکی نوێ هەیە کە ئەویش لەڕوودا وەستانی نیورۆ-بایۆلۆژییە neuro- biology هەروەك زۆر (دژ) بۆ کەئابە هەن و ئەم دژە کەئابانەش کاریگەری تایبەتی خۆیان هەیە. بەڵام من وەکو دەرونشیکارێك بڕوام وایە حەوانەوە دابین کردن بۆ حاڵەتی ئازارچەشتن و سوك کردنی باری کەئابە بەم حەبانە (ئەو حەبانەی کە بۆ چارەسەری کەئابە بەکار دەهێنرێن-ع) ئەنجامێکی ئەوتۆی نییە، چونکە سەرچاوەی گرفتەکە هەر وەکو خۆیەتی و ماوە.

ئەوەندەی کە پەیوەندی بەئەفراندنی ئێستاتیکای ئەدەبەوە هەیە (ئەوەی لای من بایەخی هەیە) وەك گوتم کردەی ئەفراندن لەئەزموون و تاقیکردنەوەی کەئابەوە دەست پێدەکات و بێ ئەو ناتوانین داوای پرسیاری (جێگیری) مانا یان دەربڕین بکەین. پێویستە نووسەر لەیەك کاتدا یان لەکاتێکی تردا لەحاڵەتی ونکردن و لەحاڵەتی ڕێکخستنی مانادا بێت بۆ ئەوەی بنووسێت.

سەرباری ئەوە هەندێ شتی مەجازی لەبارەی نووسەرەوە لەئارادایە، ئەو نووسەرە کە تاقی کردنەوەی کەئابە دەکات لەدیارترین و سەیرترین شێوەیدا، ئیحتمالی ئەوەش هەیە کە ئەو نووسەرە خۆی لەکەئابە دووربخاتەوە بۆ نموونە نووسەرەکە دەتوانێت وەسفی کەئابەکەی خۆی بۆ ئێمە بکات، دیارە ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە بەسەر کەئابەکەیدا.

دەقەکانی مارگرێت دۆراس دەربارەی ئازارچەشتن و ئەزموونی خەفەتخواردن و مردن و خۆکوشتنن، هەمان شێوەی دەقەکانی دستۆفسکین. دەقەکانی (نێرڤاڵ) بەهەموو سەرچاوەکانیانەوە لەمیراتی ڕۆشنبیری، ئەوەمان نیشان دەدەن کە تاچ مەودایەك خەفەت و ئازارچەشتن دەتوانن ببن بە فیکرەی دەقەکان.

تەنانەت کاتێ پرسیارێك لەبارەی نووسینی خۆشی بەخشەوە بکرێت، ئەوا ئاسایی ئەو پرسیارە دەگوازرێتەوە، کاتێ کەسێ بیبلۆگرافیای نووسەرەکە بزانێت لێرەشدا دژە بەکارهێنانێك هەیە، کە ئەویش لایەنی گەشی ڕۆژی ڕەشی میلانکۆلییە. ئیحتمالی ڕزگاربوون لە کەئابە هەیە ئەویش بەپێچەوانە کردنەوەی ناوەڕۆکە سلبییەکان لەڕێگای گۆڕینیانەوە بەڕێگایەکی ئیجابی. هەمان شێوەی ئەو گاڵتەجارەی کە پێکەنینەکەی گوزارشت لەخەمێکی قووڵ دەکات. لەم حاڵەتەی بینیندایە کە من خەیاڵ تاقی دەکەمەوە وەکو ئەوەی لەگەوهەردا خودی ئەو خەیاڵە میلانکۆلی بێت و وەکو شەڕێکیش بەدژی میلانکۆلی بەکاردێت. ئەفراندەکانی خەیاڵ بەهێزن و دژی (کەئابە) پێشکەش دەکرێن و ئێمە دەتوانین ئەو ئەفراندنانە بەرهەم بهێنین.

سەرچاوە:

Philiph Rice- Modern Literary Theory- London, 1989- pp- 128-134.

# فەلسەفەی کلتوور

## گفتوگۆ لەگەڵ تزڤیتان تودۆرۆڤ-دا

♦ سازدانی: رامین جیهانبەگلو

• لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

-تۆ ساڵی 1939 لە سۆفیای بولگارستان هاتوویتەتە دنیاوە، ساڵی 1963 هاتیتە فەرەنساو بەیەکجاری مایتەوە، چ یادەوەریەکت لەسەر سەردەمی ژیانی خۆت لە بولگارستان هەیەو چۆن بوو هاتیتە فەرەنسا؟

+دەبێت سەرەتا باس لەوە بکەم کە بۆ هاتمە فەرەنسا، کە لە بورلگارستان دەرچووم لەبیری ئەوەدا نەبووم بەیەکجاری نەگەڕێمەوە، وابزانم لاوانی تریش لەم رووەوە هەروابوون. من تەمەنم 24 ساڵو تازە خوێندنم تەواو کردبوو، دوو ساڵ بوو لە بولگارستان کارمەند بووم، ساڵێکیان وەك مامۆستاو ساڵێکیان وەك لێکۆڵەرەوە، وام دانابوو تەنیا ساڵێك لەفەرەنسا بمێنمەوە. بەڵام ژیانی فەرەنسا منی ئاوەژوو کرد. مرۆڤ لە 24 ساڵیا گەلێك کراوەیەو زۆر شت وەردەگرێت، بۆیە ژیانی من لەشێوەیەکی تردا خۆی گرت، لەسەرەتادا وام دانابوو تەنیا ساڵێکی تر لەوێ بمێنمەوە، بەڵام بارەکە واشکایەوە نەتوانم بگەڕێمەوە، چونکە ژنم هێناو منالم بوو، چەند خولێکی فێربوونو شتی تری لەو بابەتەم بینی. من هەرگیز وەها بڕیارێکم نەبوو کە بەتەواوی لەبولگارستان هەڵکەنرێم، لەراستیا ئەم کارە چەند قۆناغێکی جیاوازی بینی بێ ئەوەی من بڕیاری وام دابێت.

دوای هاتنە فەرەنسام لەبیری ئەوەدا نەبووم واز لە شوناسی بولگاریم بێنم. ئەم شوناسە لەزەینی مندا جێگای خۆی هەبوو، هەرگیز پێویستی نەدەکرد لەبەر راهاتن بەژیانی فەرەنسام ئەم شوناسە لەزەینی خۆم دەربکەم. ساڵی 1963 هاتمە فەرەنسا، ئەتوانم بڵێم بۆ ماوەی دە ساڵیش تەنیا لەبیری ئەوەدا بووم



تودۆرۆڤ

لەفەرەنسیەك بچم، ئیوەش زۆر لەفەرەنسادا ژیاونو رەنگە هەمان حاڵتان بووبیت، دەم ویست بەئەندازەی فەرەنسیەکان فەرەنسی بم، بیگومان تا ئیستاش لەقسەکردندا فونەتیکی بولگاریم هەیە. بەڵام بەدەر لەوە حەزم دەکرد وەك فەرەنسیەك لەچیشت لینانو پەنیرو شەرابیان بزانم، ئەبوو بیر لەوە بکەمەوە توانام بەسەر فیلمی فەرەنسیدا هەبیت، چونکە لەبولگاریا فیلمی رۆژاوایی زۆر کەم بوو، لەکاتیکدا لەفەرەنسادا هەموو شتیك لەبەردەستابوو، بۆیە دەبوو توانام بەسەر هەموو میژووی سینەمادا هەبیت، دەربارەی دیرینەی ئەدەبیو گوتاری گشتیش دۆخەکە هەروا بوو، دەم ویست وەك ئەوانەبم کە لە دەوروبەرمدان، بۆیە ساڵانیك تیپەرینو من لەفەرەنسادا مامەوە، چارەنووس کردمیە فەرەنسی، لەباری مافیشەوە رەگەزنامەی فەرەنسیم وەرگرت. لیرەوە قۆناغیکی تازەی ژیانم دەستی پیّ کرد کە بریتی بوو لەگەرانەوە بۆ کەسایەتی کۆن، بۆ ئەوەی ئیتر یەکیك نەخەمە جیی ئەوی دی، بەڵکو بتوانم بەو دوو رەگەزیەوە کە پیش ئەم گفتوگۆیە باسمان لیوە کرد بژیم. واتا پاراستنی ئەوەی لەبولگارستان لەمندا مابوەو بیستو چوار ساڵی یەکەمی ژیانم پیی بەخشی بووم، لەهەمان کاتدا پیشوازی لەو دەرئەنجامەی کە ببوومە فەرەنسیو ئیدی هیچ ئارەزوویەکی ژیانی بولگارستانم نەمابوو، بیگومان چەند جاریك گەرامەوە بولگارستان، هەژدە ساڵ نەچوومەوە، بەڵام لە 13 ساڵ لەمەوبەرەوە هەموو ساڵیك سەفەری بولگاریام کردوە، ئەم سەفەرانە تیکەڵ بوون لەخۆشیو ناخۆشی. بەڵام هەموو جاریك زیاتر هەستم بەوە دەکرد کە بۆ لەوەو دوا وڵاتی من فەرەنسایە نەك بولگارستان، بۆیە شوناسی من شوناسی حاڵەتەکەمە. بەڵام من وەك هەر کەسیکی دی لەرابوردوو دروست بوومو نیویك لەو رابوردوە پەیوەندی بەوڵاتیکی ترەوەیە.

**–لە ئەزموونی ژیانی بولگارستاندا چ یادوەریەکی تایبەتیتان لاماوە؟**

+پرسیاریکی چاکە، وائەزانم لەقۆناغی سەرەتای ژیانی بولگارستانمدا دوو ئەزموونم لاماوە. یەکیکیان ئەوەیە کە بۆ هەر کەسیك لەمنداڵیەتیەوە بۆی دەمینیتەوە، چونکە مرۆڤ لەمنداڵیا زۆرتر کاری لی دەکریت لە قۆناغەکانی داهاتووی، بەتایبەتی لەچوارچیوەی ژیانی خیزانیدا، بۆیە پەیوەندی لەگەڵ باوك، دایك، برا، هاوریو شیوەی ژیانم لەمنداڵیو میرد منداڵیدا دەگمەنەو تایبەتە بە تاکە کەسەوەو منیش تەنیا جاریك واژیاوم، ژیانی گەورەیی زیاتر دووبارە

بوونەوەیە، بەڵام ژیانی نێوان سفرو بیست ساڵی بەراستی تاقە ڕێگایەکی یەک لایەنەیەو زۆر تایبەتە بەو کەسەوە، بۆیە ئەمانە شت گەلێکن ڕەگیان لەمندا داکوتاوە، کاریگەریان ئەوکاتانە هەست پێ دەکرێت کە چۆن دەڕوانیتە فلانە دیمەن، فیسارە خواردن، فلانە ئاهەنگ، ئان هەڵسو کەوتە کۆمەڵایەتیەکان. بولگاریەکان لەفەرەنسیەکان خۆرهەڵاتی ترن، بۆیە لەخۆراواییەکانو بەتایبەت لەفەرەنسیەکان خوێن گەرمترو زیاتر پابەندی ژیانە کۆمەڵایەتیەکەنو لەفەرەنسیەکان کەمتر تاک گەران. ئەمەیان لایەنێکە، لایەنەکەی تر، کە گرنگی کەمترنیەو زیاتر لەزەمینەی کارمدا ناچاری بەرگەگرتنی بووم، ئەو ڕاستیەیە کە بولگارستان تا ساڵی 1989 وڵاتێکی کۆمۆنیستی بوو، یەکێک بوو لە توندڕەوترین وڵاتی کۆمۆنیستیو کەمترین ڕادەی گۆڕانو جۆراوجۆری ناوەکی تیا بەدی دەکرا، لەم ڕووەوە وڵاتێکی تەواو تاک ڕەهەندو پارتی کۆمۆنیستی تیا باڵادەست بوو، ئەم پارتە سانسۆری لەهەموو جێگایەکو بەسەر هەموو شتێکەوە هەبوو، ئەتوانم بەئاسانی ئەوە بڵێم، لای کەم ئەو سەردەمەی کە هاوئاهەنگ بوو لەگەڵ هاتنە دەرەوەی مندا، واتا تا ساڵی 1963 بولگارستان بەتەواوی مانا وڵاتێکی توتالیتاربوو، دوای ئەوە بۆ ماوەی 25 ساڵ توتالیتاریزمێکی گونجاوتر لەوڵاتدا بەرقەرار بوو کە هاوکات بوو لەگەڵ حوکمرانی برژنیفی شورەویدا، لەو سەردەمەدا ئیتر کەس نەدەبرایە ئوردوگا یازیندان، کەسیان نەدەکوشتو ئازاری کەسیان نەدەدا، ئیتر ئەو زەبرو زەنگە بەهێزەی کە هەبوو نەما، لەگەڵ ئەمانەیشدا هێشتا بولگارستان وڵاتێکی دیکتاتۆری بوو، لەگەڵ دیکتاتۆریەکی ئایدیۆلۆژیکا لەبابەتی تیوکراتیک، واتا ئەوەی من پێی دەڵێم "ئایدیوکراتیک" ئەم حکومەتە تا ساڵی 1989 واتا ماوەیەکی زۆر دوای دەرچوونی من لە بولگاریا هەر لەسەر کاربوو، ئەمە بۆ من ئەزموونێکی سەرەکیە. زەمان تێپەڕیوەو کەچی بۆ من تاڕادەیەک حوکمی مەحەکێکی دەروونی هەیە، جۆرێکە لەو پێوانەیەی کە هەموو شتێکی من هەڵدەسەنگێنێت، هەر شتێک کە پەیوەندی بەو ڕێکەوتەوە هەبێت، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حکومەتێکدا کە بەرای من بەدێکی ڕەهابوو، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕەها (موتڵەق)دا کارێکی دەگمەنو تاڕادەیەک گران بەهایشە، من هەرگیز لەگەڵ خێری ڕەهام دا ڕووبەڕوونەبوومەتەوە، ئێستایش وابیر ناکەمەوە کە لەم کۆتایی ژیانەمدا ئەم بەختە یان بەدبەختیەم تووش بێت، بەڵام لەگەڵ خراپەدا ڕووبەڕووبوومەتەوە، بەراستی حکومەتی بولگارستان بەدبوو، بەڵام بێگومان لەبەدە هەرە گەورەکان نا، ئەم حکومەتە جۆرێک لەپێوانەی ناوەوەی خۆمی دامێ کەتا ئێستایش لەژیانما پەیڕەوی لێ ئەکەم، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەلو مەرجی ئەمڕۆ تەواو گۆڕاوە.

-لەپێشەکی کتێبی (ئێمەو ئەوانی دی)دا باس لە ئەزموونی خراپە دەکەیت، وەلێ بەڕای ئێوە ئەو ئەزموونە لەفەرەنسایشا بەردەوام بوە، وانیە؟

+لەپێشەکی کتێبەکەمدا (ئێمەو ئەوانی دی) هەوڵمداوە تاڕادەیەک باس لەوە بکەم کە ئێوە ئێستا لێرەدا قسەی لێ دەکەن، واتا ئەوەی کە چۆن ئەزموونەکانم -چ تاڵو چ شیرینیان- لەوڵاتێکی توتالیتارا یارمەتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی داوم کە لەم کتێبەدا بەچاکم زانیوە، تایبەتمەندیەتی سەرەکی ئەو ئەرکانە بریتیە لەپێکەوە بەستنەوەی ڕەهەندە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوەی پەتی، واتا مێژوونووسینەوە. وەسف لێکدانەوەو شیکردنەوەی دەقە کلاسیکیەکان لەگەڵ هەڵوێست گرتنا لەئاست مەسەلەی کارو سیاسەت، گشتیو تایبەتی، کە زۆرجار لەدنیای خۆراوادا وای دادەنێن کە ئەوانە

پێکەوە ناگونجێنو، ئەنجامیش، هەر یەکێك لەو دوو چالاکیە دەدرایە دەست گروپێك، یەکێکیان بەسەربازی، سیاسەتمەدارو رۆحانیەکان، واتا بەوانەی ئەهلی کارن، ئەوی تریش، واتا کاری تویژینەوەو لێکۆڵینەوە دەدرایە دەست ئەوانەی کە بێلایەنو بەجوانی پێشوازی لەبیرو باوەڕە جیاوازەکان دەکەن، واتا بیرمەندەکان، ئیتر جەوهەری ئەو بیروباوەڕانە هەرچیەك بن. هەستم کرد ئەم جۆرە جیاکردنەوەیە بۆ من ئاسان نیەو حەزیشی لێ ناکەم، بۆیە هەولمدا ئەوە روون بکەمەوە کە بۆچی ناتوانم ئەم میتۆدە لەپێش بگرم.

لەفەرەنسادا لەگەڵ جۆرێك لەو دووفاقیەی کە لەنێوان گوفتارو رەفتاردا هەیە رووبەڕوو بووم، ئەم دوو فاقیە هەم لەو هاوڕێیانەدا بینیم کە بەینم لەگەڵیاندا هەبوو، هەم لەو لێکۆڵەرەوە گەنجانەی کە جیاوازی نێوان گوفتارو رەفتاریان منی سەرسام کردبوو، واتا ئەو جیاوازیەی لەنێوان بەرهەمە فیکریەکانیانو رێسای ژیانیاندا هەبوو، کە تەواو منیان ئازاردەدا، من وای بۆ دەچم ئەگەر تایبەتمەندیەك هەبێت کە لەفەرەنسادا شوێنی ئێمە لەوانی تر جیابکاتەوە هەر لەبەر ئەو گەڕانو هەوڵە بەردەوامەیە لەنێوان گوفتارو رەفتاردا نەك لەبەر ناوەڕۆکی بیروڕاکانم کە بەوان نامۆیە. بەلام بەپێی ئەزموونی بولگارستانم، کە لەوێ ئەم جیاوازیە لەنێوان گوفتارو رەفتاردا زۆر باوو بێ شەرمانەو لای هەموویش پەسەند بوو، بۆیە تێکۆشین بۆ ئەوەی ژیانم بەسەر بیروباوەڕمیەوە هەبێت، یان یەك خستنی بیروباوەڕم لەگەڵ ژیانما، بوە یاسایەك کە دەبوو لەژیانما پراکتیزەی بکەم، بەهەرحاڵ بێ ئەوەی بمەوێت بڵێم ئەم دوانە یەکسانن، بەلام هەولم داوە بەپێی توانا هەردووکیان لەیەکدی نزیك بخەمەوە.

**-ئایا ئەم دوو فاقیەی لەنێوان گوفتارو رەفتاردا کە تۆ لەفەرەنسادا تاقیت کردۆتەوە لەگەڵ ئەو دوو فاقیە ئایدۆلۆژیەی لەبولگارستاندا دیوتە بەراورد دەکرێن؟**

+دەتوانین لەگەڵ یەکدا بەراوردیان بکەین، بەلام لەچەند لایەنێکەوە جیاوازیان هەیە، دەتوانین تا ئەو جێگایە بەراوردیان بکەین کە لەفەرەنسادا کردەی جۆرێك لەهەست نەکردن بە بەرپرسیاری لەتیوردا هەیە، لێرەدا ئەم مەبەستەم زۆر سادە کردووە، بەلام هەست ئەکەم تاڕادەیەك مەبەستەکە روونە، ئەوەی زۆر کاری لێ دەکردم ئەوەبوو کە ئەو کەسانەی رێکەوتم دەکردن یان لە گەڵیاندا تێکەڵ دەبووم ژیانیان جۆرێك بوو کە تەنیاو تەنیا دیموکراس لیبرالێك دەیتوانی بەو شێوەیە بژی، کەچی هەمان ئەو کەسانە باری سەرنجێکی وایان هەبوو کە ئەگەر پراکتیزە بکرایە هەرگیز ئەم دیموکراس لیبرالە بەردەوام نەدەبوو، ئەم جیاوازیە زۆری ئازار پێ دەبەخشیم، لەبولگارستان جیاوازیەکە بەم جۆرە نەبوو، دەبێت ئەوەیش بزانین کە جیازیەکەی ئەوێ هاوکێشەی جۆرێك لەسانسۆری هەمە لایەنە بوو. چونکە لەبولگارستان گوفتارێك هەبوو بەرەسمی ناوی چاکترین گوفتاری لێ نرابوو، بۆیە دەبوو تاکە کەس رەنگی گشتی بگرێت، چونکە بۆ بەدەست هێنانی ژیانێکی ئاسایی، بۆ پاراستنی کاری تایبەتی خۆتو چوونە دانشگا، بۆ گەورەکردنی منالْت دەبوو گوفتارە گشتیەکان لەگەڵ ئەو مۆدیلانەدا تەبابێت کە هەرچەند گۆڕانێکی کەم هەڵدەگرێت بەلام هەمیشە وەك یەك وابون، بەرەسمی بانگەشەی ئەوەی بۆ دەکرا کە دەشێ رەتی بکەیتەوە، بۆیە زۆرجار لەگەڵ جۆرێك لەبێ رەوشتیو ئەوانەی دەمامکیان دەکرد رووبەڕووبووینەوە، ئەزانیت قسەی کۆمۆنیستو سوشیالیستەکان بەرواڵەت پڕن لەخۆشەویستی،

چونکه داوای بەختەوەری هەموو کەسێك دەکەن، هەمیشە ئامانج گەشەسەندن و بەختەوەری هەموو لایەکە، بەڵام هەر ئەوکەسانەی کە ئەم قسانەیان دەکرد ئەوانە بوون کە گیرفانیان پڕدەکردو بێجگە لە دەوڵەمەند کردنی خۆیان بیریان لەهیچی تر نەدەکردەوە، بۆیە مانای ئەو وشانەی بەکاریان دەهێنا، هەرئەوەندەی بەسەر زمانیاندا دەهات لەبیریان دەچووەوە. ئەم ئاست دابەزینەی زمان ناخۆشترین شتی ناو رۆژنامەکان بوو، ئەمەیش ئەومانایە دەگەیەنێت کە مرۆڤ هەر رۆژێك بەدرۆیەك تاوانبار بکرێت، مرۆڤ وای هەست دەکرد کە تێکەڵ بوون بەفەزا گشتیەکە پیسی دەکات، کە دەگەڕایەوە ماڵەکەی، وەك کەسێك لەجێگایەکی پۆخڵەوە هاتبێت، دەبوو ئاوا نیوسەعاتێك، لەبێدەنگی کتێب خوێندنەوەدا خۆی پاکژ بکاتەوە، دەبوو کتێب بخوێنێتەوە یان گوێ لەمۆسیقا بگریت کە بەراستی پێی خۆشە، نەك واخۆی بنوێنێت کە حەزی لێیەتی و بەدرێژایی رۆژ ئەمە کاری بوە، پاشان دەیتوانی لەفەزایەکی تایبەتا لەگەڵ هاوڕێ و منداڵەکانیا کە بڕوای پێیان هەیە دابنیشێ و کاربکات. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو دوو فاقیەی کە لە بولگارستاندا هەبوو زیاتر لە رێاکاری دەچوو، بەڵام لەفەرەنسادا بە ریاکاری نادرێتە قەڵەم، چونکە ئەو کەسانەی رای خۆیان دەربارەی فلان یا فیسارە تیوری توتالیتار دەدا تەواو راستگۆ بوون، بەڵام بە نیسبەت ژیانی خۆیانەوە دەکەوتە دژایەتیەوە، ئەمانە دوو جۆرە ناپەیوەندی جیاوازن کە هەردووکیان تارادەیەك لەمندا هەن، بەڵام بەپێی توانای خۆم هەوڵمداوە بەسەریاندا زاڵ بم.

-ئایا لەکاری لێکۆڵینەوەتاندا دوو قۆناغی تەواو لە یەکتر جیاواز دیاری دەکەن، یان وای بۆ دەچیت کە لەنێوان ئەو دوو قۆناغەدا بەردەوام بوونێك هەیە، مەبەست لە قۆناغی یەکەم ئەوکاتەیە کە زیاتر خەریکی رەخنەو تیوری ئەدەبی و نیشانەناسی بوویت و، لەگەڵ -ژرار ژنت-ا گۆڤاری "پویتیك"تان دەردەکرد، قۆناغی دووەم تایبەتە بە لێکۆڵینەوە دەربارەی مەسەلەی (ئەوی دی) کە لە کتێبەکانی (فەتحی ئەمریکا)، (ئاکارگەرایی مێژوو)و (ئێمەو ئەوانی دی)و (بەرانبەر دواسنورات) بڵاو کردەوە؟

+وا ئەزانم دەتوانین بەڕوونی دوو قۆناغی لەیەکدی جیاواز لەلێکۆڵینەوەی فیکری لەژیانی مەعنەوی مندا دەست نیشان بکرێت، خاڵی جیاکردنەوەی ئەم دوانە چلەمین ساڵی تەمەنی منە کە خۆیشی دەتوانێت خاڵێکی روونکەرەوە بێت بۆسەر مەسەلەکە، بەڵام دەیشتوانین وای لێك بدەینەوە کە ئەم دوو قۆناغە بۆیە پێکەوە بەستراونەتەوە چونکە لەساڵە بەراییەکانی ژیانی فەرەنسامدا هێشتا لەژێر کاریگەریەکی توندی ژیانی بولگاریامدا بووم، مەبەستمە بڵێم کە لە بولگارستان ئایدۆلۆژیا بەتەواوی لەژێردەستی دەوڵەتدا بوو، کاردانەوەی لاوێکی تەمەن بیست و چوار ساڵەی خوێندکاری ئەدەبیات هەر کاردانەوەی زۆر کەسانی ترە، ئەوەیش بریتیە لەو روانینەی کە ئایدۆلۆژیای لەم جۆرە، یان بابڵێم فەزایەکی سیاسی لەم بابەتە، شتێکی گەندەڵ و بێ کەڵکە، چونکە سەرچاوەکەی تەنیاو تەنیا ریابازی و درۆکردنی دەسەڵاتە کە بەزۆری پۆلیس خۆی سەپاندوە، بۆیە تاقەکارکردن ئەو چالاکیە تایبەتیانەیە کە بەتەواوی لەئایدۆلۆژیا دابڕاوە. بۆیە هەست ئەکەم ئەم کارە کاریگەریەکی زۆری بەسەر ئیشە سەرەتاییەکانی منەوە هەبووە، هەرچەندە شانۆی رووداونی ئەم بیرە لەفەرەنسەدا بوو، چونکە پێش هاتنە فەرەنسام کاری زۆرم لە بولگارستانا نەکردبوو، لەوێ تەنیا چەند وتارێکی کورتم نوسیبوو، لەفەرەنسادا بەتەواوی جەختم لەسەر فورمالیزم، بونیادگەری، زانستی ئەدەبیات

کرد، واتا ئەو شتانەی وا دێنە بەرچاو کە هەزاران کیلۆمەتر لە ئایدۆلۆژیاوە دوورن، زەمان تێپەڕیو من بەهۆی ئەو بارودۆخە جیاوازەی ژیانی ئەویوە تەواو گۆڕانم بەسەردا هات، بارودۆخێك کە دەوڵەت کۆنترۆڵی سیاسەتی نەدەکرد، تەنانەت ئەگەر دەوڵەت هەوڵی ئەوەیشی بدایە رەوتەکە بە ئارەزووی خۆی بگۆڕێت، بەڵام دیموکراسیو ئیرۆکراسی هیچ لەیەکتر نەدەچوون، بۆیە گۆڕامو وردە وردە ئەو پەیوەندیە ئەستەمە بەکاروباری گشتیەوە گەڕایەوە وجودم، ئەمەیش روون کردنەوەیەکی ترە بۆ سەر ئەوەی کە بۆچی کارەکانم ئەو فۆرمەیان لەخۆگرتوە، ئەگەرچی بەڕاستی مرۆ لەبارەی خۆیەوە ناتوانێت روون کردنەوەی ورد بڵێت، رەنگە روون کردنەوەیەکی دی تەواوکەری ئەمانە بێت. کەوا ئەزانم لەم بوارەی ئێمەدا (کە لەدیدی مندا بواری زانستی مرۆڤایەتیە ئەوەی بەزمانی ئینگلیزی The humonitiesی پێ دەڵێن) سەرقاڵی ئەزمونێکی دوورو درێژن، من ناتوانم ئەوە بشارمەوە کە بەبڕوانامەیەکی دانشگا یان بەوەرگرتنی دوکتۆرایەك نابیتە خاوەن ئەزموونو قاڵبووی کار، من ئەو کارانەم هەمووی کرد، بەڵام بەڕاستی قۆناغی فێرکاریم لەدوای تەواوکردنی خوێندنمەوە دەستی پێ کرد، ئێستا دەتوانم بڵێم کە تا تەمەنی چل ساڵی ساڵانی فێربوونم بوون. ئەوەی فێری بووم شێوەی شیکردنەوەی دەقەکان بوو، تارادەیەك ئەمەیان ئەو شتە بوو کەحەزم پێ دەکرد: چۆن دەتوانیت دەقێك شی بکەیتەوە، زیاتریش دەقی ئەدەبی، هەر ئەوسا دەستم دابوە مێژووی ئەدەبیات کە بەتایبەتی لەکتێبی تیورەکانی سیمبولدا رەنگیان داوەتەوە، ئەم کتێبە دەربارەی مێژووی هیرمنوتیك، زانستی بەیان، تیوری ئەدەبیو لەم بابەتانە کە مێژووی گوتارەکان بوو، بەڵام ئەوەی زیاتر سەرنجی راکێشام، بەدەست هێنانی ئامرازێکی تیوری بوو کە بتوانم بەهۆیەوە کاری شیکردنەوە بەچاکی بەرەو پێشەوە بەرم، بەڵام ئەم فێرکاریە میتۆدۆلۆژیە لەماوەیەکی دیاری کراودا کۆتایی هات.

ناتوانیت هەموو توانای خۆت لەوردەکاری دۆزینەوەی ئامرازە میتودۆلۆژیەکانا بەکاربەریت، وەك کرێکارێك تەواوی تەمەنی خۆی بوتیژکردنی چەکوشەکەی تەرخان بکات، پاشان رۆژێك چەکوشەکە هەڵدەگرێو بەسەر مێخێکیا دەکێشێت تا خانوویەك دروست بکات.

ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە من لەسەر ئەو بنەماو بەرایيانە نەوەستم کە دەڵێت تیوری ئەدەب چیە، یان میتۆدلۆژیای شیکردنەوەی ئەدەبی چیە؟ هەروا پرسیارگەلێکی لەم بابەتە. بەڵکو دەمویست دەق شی بکەمەوە، باس لەمێژوو بکەم، باس لەودیو مێژووی مرۆڤایەتیو هەلو مەرجەکانیو کۆمەڵگاکانی بکەم، ئەمانە بوونە بابەتی کتێبەکانم کە خۆیشیان زۆر فرەچەشن بوون. دەتوانین چەند قۆناغێکی سەرەتایی بۆ یەکێك لەم شتانە دیاری بکەین. بەڵام بەڕاستی لەتەمەنی چل ساڵیەوە زیاتر خۆم لەبواری بیری فەلسەفەی ترو گشتی ترا بینیەوە، جۆرێك قەڵەمڕەوزانی نێوان مێژووی هزرو فەلسەفەی سیاسیو ئاکار، لەگەڵ چەندین شیکردنەوەی دەق، بەڵام دواجار ئیتر میتۆدۆلۆژیای لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لەئارادا نەما.

-ئایا هەڵبژاردنی ئەم مەسەلانە، بەتایبەت مەسەلە گەلێکی گرنگی وەك فەلسەفەی سیاسیو ئاکار، وەك پەیوەندی نێوان فرە نەتەوەییو یەکێتی مرۆڤایەتی. پەیوەندی نێوان گشتیو تایبەتیو مەسەلەی شوناس. هەموو ئەمانە لەگەڵ ئەو راستیەدا کە تۆ بولگاریەکیتو لەفەرەنسادا دەژی پەیوەندیان هەیە؟

+بێگومان، ئەمە هەر تەواو پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە لەمەوبەر باسمان لێ کرد، واتا

هەوڵدان بۆ ئەوەی لەنێوان گوفتارو رەفتاردا بۆشایی دروست نەبێت، رەنگە هانا ئارنت لەشوێنێکدا ئەم مەبەستانەی باس کردبێت. بەڵام لەپێش ئەویشدا زۆرکەس ئەمانەیان وتوە. من وابیرناکەمەوە کە زانین تەنیا لەرێی ئەو ئەزموونە عەینیانەوە دێتەدی کە لەدەرەوەی ئێمەدا روو دەدەن. من وا ئەزانم ئەمە یەکێکە لەمەرجە سەرەتاییەکانی، مەرجێکی پێویستە، بەڵام مەرجی سەرەکی پێشەکەوتنی زانین نیە، ئەوکاتە زانین پێش دەکەوێت کە گەڕان بەدوای راستیا هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ جۆرێک لە ئیلتیزامی وجودیا. بەڵام ئەگەر ئەو ئیلتیزامە نەهاتەدی، لەبەر ئەوەی کە بیرکردنەوەکە سکولاستیکە بەتەواوی مانای ئەم وشەیە، واتا لەبەر ئەوەیە کە ئێمە تازە شتێك ئەخەینە روو کە لەوەوپێش وجودی هەبوە. رەنگە ئەم کارە لەرووی فێرخوازی یان ژورنالیستی وشە زۆر بەکەڵك بێت، بەڵام زانین بۆ پێشەوە نابات، من وای بیر لێ دەکەمەوە کە بۆ بەرەو پێش بردنی زانین دەبێت لەبوونی خۆمانەوە سەرچاوە بگرین، کەواتە لەم هەلو مەرجەی مندا، مەسەلەی پەیوەندی گشتیو تایبەتی (بێگومان ئێمە باس لە بابەتە دەگمەنەکان ناکەین) رێك لەگەڵ چیرۆکی ژیانی مندا پەیوەندی هەیە، جیاوازی نێوان کلتوری بولگار– سلاڤ و کلتوری خۆراوا بەو مانایە نیە کە درزێکی گەورە لەنێوان ئەم کلتورانەدا هەبێت. پێش هەر شتێك، هەردووکیان کلتوری مەسیحیو بنەمایەکی یۆنانیان هەیە کە هەر چۆنێکی بگریت نیوەندێکی هاوبەشیان هەیە. ئێمەی بولگار کەمێك کاریگەری رۆممان لەسەرە، بەڵام یۆنان کاریگەریەکی زۆری لەسەرمان داناوە. کەواتە چەند رەگەزێکی هاوبەشمان تیایە، لەگەڵ ئەمانەیشدا، وەك هەر بوارێکی تر، جیاوازیشمان تیایە، راستیەکانی ژیانو قبوولّ کردنی شوناسەکەم وەك کەسێك کە نە ڕاستەوخۆ ئەمیانمو نە ئەویان، تەنیا ئەمەیە کە دەست ئەخاتە سەر فاکتەرەکانو منیش هەر لەبیری ئەوەدام، بەڵام چونکە من هەر نووسەری رووت نیم، دەربارەی ئەزموونە شەخسیەکانم روون کردنەوەیەکی زۆر تایبەتیم بەدەستەوە نەداوە، دەمتوانی ئەمە بکەم، بەڵام تاقەتی کارێکی وام نیە، چونکە من وا هەڵکەوتووم کە حەزم لەدەرەوە بێت، حەز لە مەعریفە، هەر لەبەر ئەوەیە کە من تاڕادەیەك توێژەرەوەیەکی زانستیم، واتا رووم لەلێکۆڵینەوەی مێژوە، تەماشای کتێبەکانم بکە: ئێمەو ئەوانی دی، فەتحی ئەمریکا، یان بەشێك لە ئاکارەکانی مێژوو، پەیوەندیان بەم بابەتانەوە هەیە کە ئەزمونی تایبەتیم لەکوێدا بوونەتە هاندەرێك. ئەزموونە تایبەتیەکانی من لەو کاتەدا بەکاردێن کە توانام بدەنێ دەربارەی ئەم تیورانە بیر بکەمەوە، چونکە مێژووی هزر ئەو لایەنە سەرنج راکێشەی تیایە کە دەبێت بیر لە کەسانی تریش بکەیتەوە، مەبەست تەنیا ئەوە نیە لەو شتە تێ بگەین کە کەسانی تر ئەیلێن، ئەمە هەنگاوی یەکەمە، بەڵکو مەبەست ئەوەیشە کە بیر لەشتەکان بکەینەوە، واتا توانای ئەوەمان هەبێت کە خودی ئەوان بەرهەم بێنین. ئەمە بەو مانایەیش دێت کە لەگەڵ هزری ئەوانی دیدا بکەوینە گفتوگۆوە، من ناتوانم ئەم گفتوگۆیە ئەنجام بدەم ئەگەر پەنا نەبەمەبەر ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆم، ئەزموونێك کە بەرانبەر بە پرسیار رای دەگرم.

**-ئەو بابەتانەی لە کتێبەکانتا دەیانخەیتە روو کرۆکی مەسەلەکانی ئێستای دنیان، بەتایبەتی کتێبی "فەتحی ئەمریکا" لەو کتێبەدا باس لە پەیوەندی نێوان سوور پێستەکان وەك گەلێکی زوڵم لێ کراوو ئیسپانیای داگیرکەر دەکەیت، من بۆیە ئەمە باس دەکەم چونکە ئەمڕۆ لەگەڵ یەکێکی وەك هانتی نگتوندا رووبەڕووین کە وتارێك دەربارەی پێك**

کەوتنی ژیارەکان دەنووسێتو هەواڵێکی تراژیکمان دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی کلتوورە لێک جیاوازەکان پێ دەگەیەنێت، ئایا تۆ وای بۆ دەچیت کە بتوانین لەتیورەکەی هانتینگتون زیاتر بڕۆین‌و بڕوا بەوە بێنین کە لە ئێستادا کلتورێکی گشتی وا دێتەدی کە تەواوی کلتورەکانی تر لەسەر ئەو بنەمایە دروست بن؟ ئایا بۆ ئەم کۆتایی سەدە ی بیستەمە پێش بینیەکی وا خەونێکە؟

+نازانم خەونێکی لەم بابەتە هەبێت یان نا، ئایا بێجگە لەسەردەمی سەرکەوتنی ئیمپریالیزمی ئەوروپا لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، هیچ کەسێک بیری وای کردۆتەوە کە هەموو کلتورەکان دەبێت لەسەریەک مۆدێل دامەزرێن؟ من وای بۆ ئەچم لەم ڕۆدا زۆر کەم خەڵک هەن کە لەم بارەیەوە وا بیربکەنەوە.

-تەنانەت کەسێکی وەک فۆکۆیامایش؟

+نا، هەر نابێت باس لە تیورە گاڵتەجارەکەی ئەو بکرێت، فۆکۆیاما بانگەشەی ئەوە ناکات کە ئێمە هەمووومان لەباری کلتوریەوە یەکسان ئەبین، ئەو دەڵێت مۆدێلێکی سیاسی نیە لەگەڵ مۆدێلێکی لیبرالدا پێش بڕکێ بکات، ئەگەرچی لەراستیا زۆر شتی تر هەن. بۆیە مەبەستی فوکویاما تەنیا مۆدێلی سیاسیە، هەرگیز مەبەستی ئەو کلتور نیە، کلتور شێوەی ژیان‌و بەشێکی چالاکی کۆمەڵگایە، من وا نازانم لەم بارەیەوە فۆکۆیاما پێش بینیەکی کردبێت، وا ئەزانم لەسەدەی نۆزدەدا دوو شتیان بەیەکسان دادەنا، یەکێکیان بەرانبەر ڕاگرتنی نێوان وەحشەتگەری‌و ژیاری، ئەوی تریان بەرانبەر ڕاگرتنی نێوان کلتوری من‌و کلتوری تۆ، واتا بەرانبەر ڕاگرتنی نێوان کلتوری ولاتێك‌و کلتوری ولاتانی دی، ئەم دوو بەرانبەر ڕاگرتنەیان بەیەکسان تەماشا دەکردو لافی ئەوەیشیان لێ دەدا کە کلتوری ئەوروپای ئەو ژیاریە، بەمانای دژی وەحشەتگەریە، لەوسەردەمەدا داگیرکەرە ئەوروپاییەکان، واتا لەساڵی 1870وە تا ئێستا ئەم تیورە دوو جار زەبری خواردوە، یەکەمیان ئەو وەحشەتگەریە بوو کە لەخودی سەرزەوی ئێمەدا سەری هەڵدا، لەلایەکەوە نازیزمان هەیەو لەلایەکی ترەوە گولاك، ئەگەرچی ئەمیان لەخۆرهەڵاتی ئەوروپادا بوو، بەڵام پەیوەندی بە کۆمەڵگای ئەوروپاییەوە هەیەو، خۆرهەڵاتی ئەوروپایش بەهەمان رەوت بۆ پێشەوە دەچێت‌و، هەر بەم جۆرە، تەواوی وڵاتە ئەوروپاییەکانی تریش، ئەم دوو راستیەیان بۆ دەرخستین کە هیچ شتێك لەوەمان دڵنیا ناکات کە وا بیر بکەینەوە ئێمە لەوەحشەتگەری رزگارمان بوە، چونکە خۆمان کارێکی وامان کرد کە تا ئەوسا کاری لەوە درندانەتر نەکرابوو، بێگومان تەقاندنەوەی ئەتۆمیش هەر بەبەشێك لەو وەحشەتگەریە دادەنێم. دوەمیان ئەوەیە کە ناسینی زیاتری کلتوری خەڵکی دی بەئێمەیان سەلماند کە ئەم بەرانبەر راگرتنەی کلتوری ئەوروپیە لەگەڵ ژیاری بەشەریەتدا بێجگە لەوەهم هیچی تر نەبوە، چونکە بەتایبەتی لەوڵاتانی خۆرهەڵاتی وەك ژاپۆن، ئێران، هیند ژیاری گەورە هەبوون‌و، بۆژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەندە نموونەی تایبەتیان هەبوە کە هیچ پێویستی بە مۆدێلی خۆراوا نەبوە، ئەگەرچی ئەو کۆمەڵگایانە لەرووی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو داهێنانی کەرەسەو ئەو دەسەڵاتەی کە بەسەر هێزەکانی سروشتا هەیە کەم دەستن‌و دەسەڵاتی خۆراوا توانیویەتی ئەوانە دەستەبەر بکات. لەئەنجامی ئەم دوو زەربە خواردنەدا وا ئێستا لەلایەکەوە، ئەزانین کە ئێمە وەحشین‌و، لەسەرێکی تریشەوە ئاشکرا دەزانین کە خەڵکانی دی ئەشێ وەحشی نەبن، من وای بۆ ئەچم لەمڕۆدا کەسێك نیە وا بیربکاتەوە، ئێستا شتێکی تر هاتۆتە گۆڕێ، جۆرێك لەگشت گیریکردن لەخوارەوە، وەك گشت گیرکردنی جن، ڕپ، کۆکاکولا، مادونا،

ساختمانی تایبەتی ماکدۆنالدو لەو بابەتانە. من خۆم لەو ڕەش بینانە نیم کەوا دەزانن ئیمە بەرەو جۆریك لەسەربازخانەی گشتی دەبرین. سەلماندنی یەکیك لەم دوو تیورە کاریکی دژوارە، چونکە ئەمانە پیشبینی کردنی ئایندەن‌و لەبارەی ئایندەیشەوە ناتوانین شتیك بسەلمینین. ئیمە زیاتر لەسەر بنەمای ئارەزوە ڕۆحیەکانمان کە خۆیشی وابەستەی کۆمەلیك لەهەلو مەرجی شەخسی یان میژوویی یان جوگرافی ئیمەیەو قابیلی سەلماندن نین بریارەکان دەدەین، بەلام من لەو باوەڕەدام کە ئەم یەکسان سازیە شتیکی زۆر ڕوالەتە، چوارچیوەی کارکردنی ئیمە لەئەسلا کلتوری مادیە، بەلام دوایی هەر نەریتیك شتیکی تر لەوە دروست دەکات. نموونەیەك دینمەوە: بەکارهینانی زمانی ئینگلیزی تا ڕادەیەك هەمان حالی هەیە، گومان لەوەدا نیە کە ئەمڕۆ زمانی ئینگلیزی زمانیکی جیهانیە، ئیتر وەزیری زمانی فەرەنسی لەدەولەتی ئەم ولاتەدا چی ئەکات با بیکات، ئیستا گومان لەوەدا نیە کە دەبیت فەرەنسیەکان فیری زمانی ئینگلیزی بن تا بتوانن لەئەلمانیا یان پورتوگال یان ئیسپانیا مەبەستەکانیان بگەیەنن، چونکە ئینگلیزی زمانیکی ناوەندە. من ئەلیم ئەم ئینگلیزیەی کە بەم جۆرە قسەی پی دەکریت فاکتەریکی ئاسایشەو زۆر ئاسانە، چونکە ئینگلیزیەکە کە چرکراوەتەوە بۆ تەنیا 2000 وشەی سەرەتایی‌و، ریگای بۆخۆش کردوویت کە لەهەر شوینیکی دنیا بیت، واتا لەپەکین یان تاران، ناونیشان یان ئەو زانیاریانەی دەتەویت‌و مەبەستتە لیی بپرسیت. جا ئایا ئەم حالەتە، هەرەشە لەزمانەکانی ئیمە دەکات؟ لەبەر ئەوەی کە ئینگلیزی جیگای ئەوانی گرتۆتەوە؟ من هەرگیز وا بیرناکەمەوە، وایش بیر ناکەمەوە ئەگەر هەزار وشەی زمانی ئینگلیزی بکەویتە زمانی فەرەنسیەوە ئیتر ئەمە هەرەشە بیت لەبوونی زمانی فەرەنسی، چونکە زمان بونیادەو پیرستی وشە نیە، بوونی هەر زمانیك بە ژمارەی ئەو وشە بیگانانە هەلناسەنگینریت کە کەوتوونەتە زمانەکەوە.

**-بەلام کەسانیک هەن لەگەل ریژەیی بوونی بەهاکاندا نین، وا ئەزانن کە ئیتر ئەو توانایە نیە Welt literatur واتا ئەدەبیاتی جیهانی وەک ئەوەی لەسەردەمی گۆتەدا هەبووە جاریکی تر بەدی بیتەوە، مەبەستم ئەوەیە کە لە دیدی گەلیک لەڕووناکبیرانەوە چونیەک تەماشاکردنی هەموو کلتورەکان لەدنیای ئیستادا مانای هیدمە (صدمە) دانە لەهەندیک لەبەها گیریە هەمەلایەنەکان.**

+دەبیت ئیمە لەم لایەنەوە بەڕاستی بکەوینە ناو باس‌و خواسی بەهاکانەوە، تا ئەو شوینەی پەیوەندی بەکلتورەوە هەیە، وا دەزانم دەبیت باسەکە کۆکتر بکریت. ئەگەر لەچوارچیوەی چەمکە تەواو ڕەهاکانەوە بیربکەینەوەو بلیین کە "ئایا تۆ پەیرەوی لەریژە گەرایی دەکەیت؟" یان "ئایا تۆ پەیرەوی لەڕەها گەرایی دەکەیت؟" لەهەردوو بارەکەدا دەتوانریت کۆمەلیك بەلگەی بەهادار لەبەردەم تۆدا قوت بکریتەوە، کەواتە مەسەلەکە ئەوە نیە، بەلکو مەسەلەکە ئەوەیە چۆن دەتوانین دەست نیشانی ئەو سنوورە بکەین کە لەنیوان ئەوەی بەبۆچوونی ئیمە پەیوەندی بە بەها ڕەهاکانەوە هەیەو ئەوەیش کە بە بۆچوونی ئیمە پەیوەندی بەنەریتە جیاوازەکان‌و شیوە جیاکانی هزرو نرخاندنە جیهانیەکانەوە هەیە. کەواتە من وای بۆ دەچم کە بەها ڕەهاکان‌و بەها ریژەییەکان دەتوانن لەم بوارەدا هەردووکیان لەپال یەکا دابنرین، بەرای من هەموو کلتورەکان لەسەرەتادا وەك یەك وا بوون. بەلام نەك لەکۆتاییدا، چونکە میژوویش هەیە، میژوو پیمان دەلیت هەندیك هەن زیاد لەشتی تر شایستەی دەست خۆشی لی کردنن. ئەو شتانە بۆیە زیاتر شایستەی دەست خۆشین

چونکە ئێمە دەتوانین ئەو شتانە لەگەڵ پێوانە گشتیەکاندا بەرانبەر کەین. من بڕوام بەپێوانەی گشتی هەیە. تارادەیەك ئەمیان ئەو شتەیە کە ئاسایی وەك چەمکی مافی مرۆڤ ئاماژەی پێ دەکرێت، لەم روانگەیەوە دەتوانم بڵێم کە دەتوانین رژێمی نازیو رژێمی کۆمۆنیستی نەك لەچوارچێوەی بەهای رێژەییەوە بەڵکو لەسەر بنەمای بەها رەکانیش تاوانبار بکەین، رەنگە هەمووتان لەم یەکەم هەنگاوەدا لەگەڵما بن، بەلام بۆ ئەوەیش دەچم کە بابەتێکی تر بێتە ئاراوە زیاتر گفتوگۆ هەڵگر بێت، ئەمەوێت بڵێم، لەروانگەی مێژووییەوە، هەندێك لەکلتورەکان لەهەندێکی تر دەوڵەمەند ترن، ئەمە بەو مانایە نیە کە ئەو کلتورە هەر بە سروشت لەوانی دی بالاترە، کلتوری فەرەنسی لەکلتوری بیابان بالاتر نیە، بەلام دەبینین کە لە کلتوری فەرەنسادا نووسین داهێنراوە، یان با وردی بکەمەوە، فەرەنسیەکان لەکلتوری دەریای ناوەڕاستا بوونەتە میراتگری نووسینی یۆنان، سەر زەویەك کە نووسینی تیا بوو بێت بۆ گەشەکردنی کلتور چاکترە لەسەر زەویەك کە نووسینی تیا نەبووبێت، ئەمە بەو مانایە نیە کە ئەوانەی خاوەن کلتوری بێ نوسینن لەوانی دی کەمترن. یان پلەو پایەیەکیان نیە، بەڵکو بەو مانایەیە کە ئەو کلتورەی نووسینی تیا بوە بۆتە خاوەن کەرەسەیەك بۆ گەشەکردن کە کلتورەکەی تریان نیەتی. نووسین بۆتە فاکتەرێك کە ئەدەبیاتی فەرەنسا لەپێش هەزار ساڵەوە تۆمار بکرێت. ئەمەیش دەستەبەرکردنی دەرئەنجامو لێکدانەوەیەکە کە تۆمارکراونو بوونەتە کۆیاد (خاطرەء جمعي) کۆیادیش قەت بەو مانایە نیە کە کۆمەڵگا خاوەنی یادوەریەکی دەماودەمی ئەمرۆیە، بەڵکو ئەوەیە لە کتێبەکاندا کۆکراوەتەوە، واتا یادوەریەکی تارادەیەك بێکۆتایی، بۆیە دەمەوێت بڵێم کە کلتوری ئەوروپا لەفلانە گەل کە نووسینی نەبوە دەوڵەمەندترە، هەرچەند ئەمە ناکرێتە بەڵگە بۆ بەسووك دانانی خەڵکی دی. لەگەڵ ئەم هەموو لایەنە مێژووییانەدا ئەوە دەردەکەوێت کە لەخۆراوادا گەلێك شت بەرهەم دەهێنرێت کە کلتورە بچووکو بێ نووسینەکان ناتوانن بیکەن، کەواتە وەك دەبینیت، دیسان پێوانەیەکی لەجۆری رەها لەبەرچاو ئەگرم بۆئەوەی ئاماژە بەمافی مرۆڤ یان شتی گشتی لەو بابەتە بکەم، چونکە ئەمجارەیان پێوانەکە دەوڵەمەندیو سامانی کلتوریەو رێگای داوەری کردنم ئەداتێ، کەواتە ناچار نیم بڵێم هەموو کلتورەکان بەهایەکی یەکسانیان هەیە، وەك هەندێك لەکلتورناسە ئەمریکیەکان لەم رۆژانەدا دووبارەی دەکەنەوە، ئەمانە چاو لە راستیەکان دەنوقێننو لایان وایە هەموو کلتورەکان یەك بەهایان هەیە، کەواتە ئیتر ئێمە بەدوای لێکۆڵینەوەی نەریتی ئەوروپاییەوە نین، بەڵکوو بەدوای نەریتی ئەفەریقاوەین، بەلای منەوە ئەمە بێمانایییە، ئەمانە بۆ سەلماندنی قسەکانیان بەڵگەی وا دێننەوە کە خودی بەڵگەکان هەڵقولاوی ناو جەرگەی نەریتە ئەوروپاییەکانە، یان لەو تیورانەی وەردەگرن کە یان مارکسیستین، یا نیچەیی، یا فرۆیدی، واتا هەر لەو کلتورانەوە هەڵهێنجراون کە ئەمانە دەیانەوێت رەتی بکەنەوە، کەواتە بەراستی ئەوەی دەمێنێتەوە تۆ چۆن لەنێوان ئەم تیورە جیاوازانەدا هەڵبژاردن دەکەیت. بێجگە لەمە هەندێك لەکلتورەکان لایەنێکی وایان هەیە کە بەکردەیی پێویست ناکات داوەریان بکەیت، بیرمەندانی سەردەمی رۆشنگەری سەبارەت بەم مەسەلەیە گەلێك حەساس بوونو کەسانێکی وەك مونتنی، دیدرو، یان مونتسکیو باسو کتێبی زۆریان لەم بارەیەوە نووسیوە، بۆ ئەوەی کە بڵێن لەبەرگ پۆشیندا شێوەی جیاواز هەیە، لەخانوو دروست کردندا

شێوازی جیاواز هەیەو لەم بابەتانە. کەواتە زۆرێك لەهەڵسو کەوتی ئاسایی ئێمە پێویستی بە داوەری رەهانیە. هەرچەندە ئەوەی ئەو شێوە مێژووییەی نەبێت- ڕێژەییە وەك لەبارەیەوە دواین.

-خۆراوا هەمیشەو بەدرێژایی مێژوو لەگەڕان بەدوای "ئەوی دیدا" بوە، لەیونانیەکانەوە تا سەردەمی رۆشنگەریو سەدەی نۆزدە هەم، خۆراوا بەردەوام شێتو شەیدای وێنەی "ئەوی دی"یە، ئایا ئەم گەڕانە بەدوای "ئەوی دی"یەدا لەراستیدا، جۆرێك لەگەڕانی خۆراوا نیە بۆ دۆزینەوەی مانای ناوەوەی خۆی؟

—ئەگەر خۆراوا وەك یەك مەسەلە بگرین، بۆنا، هەمیشە ئەم بیرە تایبەتیەو لەهەمان کاتدا بایەخدان بەوانی دی لای ئەوان هەبوە، ئەوروپا ناوچەیەکی جوگرافیە کەرووبەرەکەی چەند کیلۆمەتر چوارگۆشەی فراوانە، کۆمەڵە میللەتێکی زمان جیاوازی دراوسێی یەکتری تیا دەژی. ئەگەر بەراوردی ئەوروپا بەچینو هەندێك شوێنی تری سەرزەوی بکەین. ئەوروپا فرەچەشنە، بێجگە لەوەیش ئەوە دەبینین کە لەکەناری دەریای ناوەڕاست، کە پاشان بوە جەرگەی ئەوروپا، نەتەوە گەلێکی تەواو جیاوازی بەئاین جیا ژیاون. هەرگیز نایشتوانین رۆڵی ئاین لە مێژوودا بەکەم بزانین. کەواتە هەر لەکۆنەوە ئەوروپا، لەسەردەمی ئەسکەندەری گەورەوە، لەگەڵ گەلانی غەیری خۆیدا رووبەڕوو بۆتەوە. پەیوەندی نێوانیان لەگۆڕاندا بووە، زۆر جار ئەوان رەفتاری سووکیان نواندوە، بەڵام ئەمە لەتایبەتمەندی ئەوروپاییەکان نیە راستیەکی مێژوویی گشتیە، ئەوروپاییەکان خەڵکانێکی سووسەکەرو گەشتیاری گەورەیان تیا هەڵکەوتووە، گەشتیاری تریش هەبوون، چینیەکان لەسەردەمی کلاسیکداو موسوڵمانەکانی دوای ئەوە بەچەند سەدە دەستیان کردۆتە گەشتیاری، بەڵام ناتوانین بڵێین کە پێگەی خۆرهەڵات ناسی لە ئەوروپادا، لەرووی چەندایەتیەوە زۆر گرنگ بوە، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە رەوتی کارەکان بەو شێوەیە نەمان کە ناوی ئیمپریالزمی ئەوروپای لێنرابوو، واتا ئەو کاتەی کە ژیاری ئەوروپایی بەزۆرو لەرێگای وڵات گیریەوە فراوان ببوو، بەڵام ئاخۆ ئەمڕۆیش ئەوروپاییەکان هەر لەگەڕاندان بەدوای ئەوی دیدا؟ من وای بۆ ئەچم بەشێوەیەك وایە، بەڵام تارادەیەك ئەمە رووە ساکارەکەیەتی، چونکە ئەمڕۆ سەفەرکردن ئەوەندە ئاسانە کە گەڕان بەدوای ئەوی تردا تا ئەندازەیەك گۆڕاوە بۆ گەشتیاری. هەرکەس دەبینیت کە لە چین، هیند، ئەفەریقا، یان ئەمریکای باشوردا بووە هەمان ئەزموونی هەیە، من وا ئەزانم ئەگەر ئەمڕۆ بشێت شتێکی تازە بهێنینە گۆڕێ، نابێت چاوەڕێی ئەوەبین کە لەو پێك گەیشتنانەوە بەدەستی دێنین، لەسەفەرێکی کورتا تەنیا وێنەیەکی شێواومان لەیەکێکی تر دەست دەکەوێت، چونکە لەهەموو شوێنێك گەشتیارە ئەوروپاییەکان دەناسن، بۆیە رەفتارێکی وا لەخۆیان پیشان ئەدەن کە شیاوبێت لەگەڵ گەشتیارە ئەوروپاییەکانداو ئەمەیش وا دەکات کە هیچیان لێ تێ نەگەین، وا دەزانم کە تەنانەت رەفتارەکانیش دەگۆڕێنو گەلێك لەیەقینەکانیش دادەرمێن. ئەمڕۆ ئەوروپاییەکان زۆر لەجاران کەمتر هەڵگری گوتاری فەتح کردنن، بێگومان ئەو گوتارە تا ئێستاش وجودی هەیەو بنەبڕ نەبوە، بەڵام زۆری کەم هێناوە، ئەمریکایش، کە وڵاتێکی زۆر ئیمپریالیزمترە -بەمانای گشتی وشە- لەوڵاتانی ئەوروپا -کە وەسیلەی ئیمپریالیزمیان نیە- باشتر ناژین، ئەوەی ئەمڕۆ کرپاری هەیە، دەوری قوربانی بینینە، لەم لایەنەوە هەرکەس هەوڵی ئەوەیەتی وای دەربخات قوربانی شتێکەو چەندە ئەو قوربانی بوونە کۆنتر بێت

پێگەیەکی باشتری بۆ دەهێنێتە وجود، بێجگە لە رۆناڵد ریگان، هیچ کەس بیر لەوە ناکاتەوە کە دەبێت بەهاکانی ئەمریکا ببرێتە ولاتانی ترەوە، وا ئەزانم ئەم گوتارە کاتی ئەوەی هاتووە بزاوتە ناوەکیەکەی خۆی لەدەست بدات.

-بەڵێ لەگەڵ ئەمانەیشدا "باشور" وەک ئەو "ئەوی دی"ەی کەلێی دەترسن زیاد لەجاران دەخرێتە لاوەو کەمتر شوێنەوارێکی لێ ماوەتەوە، ئێستا خۆراوایش وێنایەکی وەهمیانەی سەیری لەسەر ولاتانی باشور هەیە. باشور لەنێوان بازووی بەشەریەتدا لەگیانەلادایە، بێگومان ئەمە حەقیقەتێکی ئابوری، سیاسیو، کلتوریە، لەگەڵ ئەمانەیشدا کە باشورەکەی "ئەوی دی" فرێ نەدراوە، ئەمەوێت بزانم تۆ چۆن لەم بارەیەوە بیردەکەیتەوە، بەتایبەت لەبارەی تیورەکانی کەسانێکی وەک ئەدوارد سەعیدەوە کە بڕوای وایە ئەو "ئەوی دی"ە تەنیا لەبەر ئەوە بوونی هەیە چونکە بۆ ئەزموونی ناوەکیو خۆنواندنی دەرەکی خۆراوا پێویست بوون.

+نا، من لەگەڵ ئەو تیورانەی سەعیدا نیم، چونکە ئەو تەواو توێژینەوەی لەسەر دیاردەیەکی تارادەیەک فراوان دەکات کە بەگشتی بەمن ئاشنان، من پێشەکیە فەرەنسیەکەی کتێبی خۆرهەلاتناسی سەعیدم نووسیوە. ئێمە بەردەوام هەستمان بەوە کردوە کە بەدوای ململانێیەکی هاوبەشەوەین، من لەگەڵ ئەو لایەنە تیوریەی ئەودا نیم کەوا پێی دەچێت زیاتر لەجۆرێک لەناوگەرایی (Nominalsme)ی تازەوە سەرچاوەی گرتبێت، چونکە ئەو بڕوای وایە هەر گوتار هەیەو هەر گوتاریشە دنیا چاک دەکات، بۆیە گوتاری خۆرهەلاتناسی لەسەر بنەمای خۆرهەلاتێکی خەیاڵی بنیات نراوە. بەلام ژیارەکان ئامادەگیو وجودیان هەبوە، ئەوان دەستەبەری ئەوەیان کردوە کە شێوە تایبەتیەکانی ژیانی خۆیان بۆ لەدنیاگەیشتن، ژیانی رۆژانە، پەیوەندی مرۆڤەکان -کە زۆر جاریش لەیەکدی جیاواز بوون- دیاری بکەن، ئەمەیان وانیە کە تەنیا "خۆرهەلاتێك" هەبوەو هەموو شتێك لەمەراکیشەوە تا ژاپۆنی گرتۆتەوە، ئەمە بەو مانایە نیە کە لە خۆرهەلاتی دوورەوە، دەوروبەری چین، کۆریا، ژاپۆنو مەگولستان دابو نەریتێك نیە، دابو نەریتێك شتێکت پیشان ئەدات کە لە شوناسی تایبەتی ئەودا دەی بینیت، ئەو دابو نەریتە ئەوانە دروستیان نەکردووە کە چین شناسن یان گەشتیاری ئەوروپایین، راستیەکی بەلگەنەویستن. ئەم خۆرهەلاتە لەگەڵ ئەو خۆرهەلاتەی کە ئێرانە جیاوازی هەیە. هەرچەندە من بەتەواوی شارەزا نیم. بەلام بێگومانم کە لەئێراندابوونو لەچیندابوون دووشتی تەواو لەیەکتر جیاوازن. بێگومانم کە ئێرانیش شاردنو تاورنیە دروستیان نەکردوە،

-نا، بێگومان وایە، لەم باسەدا گەیشتووینەتە جێگایەک کە کێشەیەک بخەینە روو کە هەمیشە پەیوەندی لەنێوان خودو ئەوی تردا هەیە، واتا لە بەرەورووبوونەوەی کلتورەکاندا، ئەو بەرەو رووبوونەوەیە لەلایەکەوە بیری لەناوبردنی هزری ئەوی تری تیایەو، لەلایەکی ترەوە کوشتنی خودیشە بەدەستی خۆی، ئەمەیش لەرێگای جۆرێک لەیەکسانی بوون لەگەڵ ئەوی تردا، بەلام ئەوەی زۆر سەرنجمان رادەکێشێت بیری سەرو بەها گوزاریە (Transvaluation)ە کە تۆ لەنورسروپ فرایت وەرگرتووە، ئەویش مانای گەڕانەوەیە بەرەو خودێک کە بەرهەمەکەی لە ئەنجامی تێکەڵ بوون لەگەڵ ئەوی تردا، بەدەربڕینێکی تر، دەتوانیت بچیتە لای ئەوی دی بێ ئەوەی لەرووی یەکسان بوون لەگەڵ ئەوی تردا خۆتو ئەویش لەناو بەریت.

+وا بزانم لەخستنەرووی مەسەلەکەدا، بەئاشکرا رێگا چارەی سێیەمتان لابردوە، خۆشبەختانە، مەسەلەکە تەنیا ئەوە نیە کە

لەنێوان یەکسان بوون لەگەڵ ئەوی تردا یان ڕاکێشانی ئەو بەلای خۆتدا یەکێکیان هەڵبژێریت.

چونکە مرۆڤو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بوونەوەرێکی سادەنین کە تەنیا یەکو سفری سیستمی کامپیوتەری بزانن، ئەوان 4\1، 2\1، 3\4و شتی تریش هەر دەزانن، واتا کاریگەریە جیاوازەکان، لێرەدا دەبێت باس لەچەند شتێکی تر بکرێت، یەکەمیان ئەمە وا نیە کە بەهای ئەوی دی گرنگترینو بەنرخترین لایەنی پێك گەیشتن بێت لەگەڵ ئەوی دیدا، چونکە ئەم ئەوی دیە ڕەنگە تەواو شیاوی دورخستنەوەو ڕەت کردنەوە بێت، وەك دەبینن لەفلانە کۆمەڵگا، یان لەفلانە چرکەساتی مێژووی مرۆڤایەتیدا چەند ڕاستیەك هەن قابیلی ڕەت کردنەوەو دەرکردنن، لێرەوە دەتوانین لەسەر هەژاریو ئازاری مرۆڤەکان بڕیار بدەین، یان ڕەخنە لەهەندێك کۆمەڵگا بگرین لەسەر نەبوونی ئازادی، کەواتە دەتوانین بەم شێوەیەیش داوەری بکەین، نابێت بەگیانی نەرمو نیانیەوە تەنیا بەوە قایل بین کە دۆستایەتی بێگانە بخرێتە جێگای دوژمنایەتی بێگانە، ئەمە زۆر ساکار بینیە، ئەوەی کە دۆستایەتی بێگانە -کە خۆشەویستیەکی گەنجاوە لەگەڵ بێگانەدا- بخەینە جێگای دوژمنایەتی کردنی بێگانە -کە نەفرەتی خودە لەبێگانە- لەمە هیچ شتێکی زیاد بەدەست ناهێنین، لەبەر ئەوەی کە مادام بێگانەیە ئیتر دەبێت خراپ بێت. لەبری ئەمە، من وای بۆ دەچم کە لەو بەیەکتر گەیشتنە لەگەڵ ئەوی تردا، ئەوەی بەلایەنە پۆزەتیفەکەیدا دەمێنێتەوە ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین لەلای خۆمانەوە تەماشایەك بکەین کەلەئەنجامی ئەو پێك گەیشتنەدا ئەو گۆڕانی بەسەرداهاتوە، بەجۆرێکی تر، باکۆتایی بەوە بێنین کە کێ لەخۆمان دەچێتو وەك خۆمان وایە، واتا مەودایەکی بچووك لەنێوان بوونو هەستماندا دابنێین، هەستمان واتا ئەو دەزگایەی دەتوانێت تەعبیرو دەرکی مانا بکاتو سەبارەت بە دابو نەریتمان، ئەوەی بەناوی خووڕەوشتو سونەتە باوەکانەوە فێری بووین کەمێك هەلبوێراون، واتا ئەوەی بەسروشتیمان ئەزانیو لەڕاستیشدا ئەوەندەیش -سروشتی- نیە لێرەدا ئێمە تووشی لەخۆنامۆبوون دێین. لەخۆنامۆبوون بە تەواوی مانای وشە واتا -وەك ئەوەی ژولیا کریستوڤا-ی هاولاتیم دەیوت -کە وەك بێگانەیەك تەماشای خۆمان بکەین- مەبەستم ئەوەیە کەمێك خۆمان بە ناتەواو دابنێین، ئاوا وەك مونتسکیو، ئەو پیاوە گەورەیەی سەدەی هەژدە کە توانیبووی بەهۆی بڕشتی بیریەوە وا لەگیانی ئێرانیەکان بکات، دیارە ئەو نەبوبوە ئێرانی بەلام لەبیریا هەوڵی ئەوەی دابوو بەرجەستەی ئەو کاردانەوانە بکات کە ئێرانیەکان بەرانبەر بە واقیعی ئەوروپا هەیان بوە (جا سەرکەوتوە یان نائەمەیان هێند گرنگ نیە) هەر ئەم هەوڵدانە بۆ خۆخستنە جێی ئەوی دی ئەوەی بۆ فەراهەم هێنا کە کارێکی مەزن بە ئەنجام بگەیەنێت، واتا "گیانی یاساکان" کە هەنگاوێکە بۆ بەدەست هێنانی تێڕوانینێکی جیهانی بۆ دەزگاو یاساکان، کەواتە، لەم ڕووەوە، من کەمتر ڕەش بینم لەوەی ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، وا بیرناکەمەوە لەنێوان یەکسان بوونو لەناوبردندا دەبێت یەکێکیان هەڵبژێریت، چونکە ڕێگای سێیەمیش بوونی هەیە، واتا شتێك کە لەناوەوەی ئەم پێك گەیشتنی کلتورانەوە دێتە دەرێ، ڕەنگە بەلایەنی کەمەوە ئەو هەستی خۆ بەیەکێکی تر زانینە، لەخۆگەیشتنو خۆخستنە ژێر باری پرسیاریشی بێت. لەلایەکی ترەوە من وای بۆ دەچم کە پێك گەیشتنی کلتورەکان، وەك ئەوەی ئێوە باستان لێ کرد، ڕوودەدەنو ڕەنگە زۆرجار ئەنجامەکەی ناهەموار بێت، ئەمە ڕاستیەکە دەبێت بەچاکی بیزانین، بەلام من وای بۆ دەچم کە ئەگەر ئێمە

فەرمان بەپێچەوانەکەی بدەین، ئەنجامەکەی خراپتر دەبێت، چونکە ئەوە بەو مانایەیە کە دەبێت ئاڵو گۆڕەکان بەپێی ڕێسا ئەنجام بدرێن، تەنانەت دەتوانرێت بڕیاری تایبەت بۆ ئەوانە بدرێن. بەڵام بەکام پۆلیسو کام سوپاوە؟ بڕوانە، ئەگەر بمانەوێت لەزەینی خۆماندا دەوڵەتێك دروست بکەین کە تیایدا رادەی ئاڵو گۆڕکردن لەژێر چاودێریدا بێت، ئەم دەوڵەتە لەرادەبەر پۆلیسیترین دەڵەت دەردەچێت، تەنانەت پۆلیسیترین دەوڵەت ناتوانێت ئەو پێك گەیشتنە کلتوریە سانسۆر بکات، ئێمە لەم لایەنەوە تارادەیەك دەستەمۆی هەلومەرجین، کە دەبێتە هۆی ئەوەی فلانە پێك گەیشتن بەرهەمی زیاترو ئەنجامی بەکەڵکی بۆ هەردوو کلتورەکە بووبێتو، ئەو پێك گەیشتنەی تر رووخێنەرو ویرانکەر بووبێت، لەم زەمینەیەوە لێکۆڵینەوەکانی من بەکتێبێك دەستی پێ کرد بەناوی فەتحی ئەمریکا، مێژووی ئەمریکا مێژوویەکی تراژیکە، چونکە پێك گەیشتنەکە ئەوەندە توندوتیژ بوو کە تارادەیەك هیچ شتێکی لەو کلتورە نەهێشتەوە کەلەپێش هاتنی داگیرکەرە ئەمریکاییەکاندا هەبوو. ئەم کارە بەپاکتاوکردنی جەستەو بلاوبوونەوەی نەخۆشی لەناو خەڵکی ناوچەکەدا دەستی پێ کرد، پاشان، وەك ئەوەی کە دەبینیت ئەم جۆرە پێك گەیشتنەی نێوان ئەو دوو کلتورە پێك گەیشتنێکی پۆزەتیفی نیە، ئەی ئەبێت لەبەر ئەم هۆیە ئەم پێویستیە تا ئەوپەڕی دنیا تاوانبار بکرێت؛ پێویستیەك کە ئەورووپی گەلێکی وەك کریستوف کولمبی وا لێ کرد دەست بەسەفەر بکەن؟ ئەمە پرسیارێکە لەپێنسەدەمین ساڵی دۆزینەوەی ئەمریکا لەساڵی 1492دا کەوتۆتەڕوو، بەڵام من تێ ناگەم لەبەرچی دەبێت ئەو پێویستیە تاوانبار بکرێت، من وای بۆ ئەچم کە ئەو پێویستیە دۆزینەوەی بەشێکی پێناسەی مرۆڤە. واتا بوونەوەرێك کەدەتوانێت "وڵاتەکەی خۆی" بەجێ بێڵێو بڕوات بزانێت لەسەر زەمینەکانی خەڵکی تردا چی ڕوودەدات. لەم حاڵەدا، واتا تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بەدۆزینەوەی ئەمریکاوە هەیە، هەموو شتێك نالەبار بوو، بەڵام ئێمە توانای ئەوەمان هەیە پێش بینی ئەوە بکەین کە لەکاتی پێك گەیشتنی کلتورەکاندا چ کوشتارو پاکتاو کردنێك ڕوودەدەنو ڕێگایشی لێ بگرین، بەڵام بەڕای من ڕێگرتن لەسەفەر گەلێك خەتەرناکترە.

**-سوپاست دەکەین جەنابی تودوروٚف.**

ژوییەی 1994

**سەرچاوە:** کتێبی (نقد عقل مدرن) بەرگی دووەم، سازدانی: رامین جهانبگلو، لاپەڕە 88-108

# وێستگەکانی سەردەم




- مەهابەهاراتا: نمایشی سەدەی بیستەم.
- گونتەرگراس و نۆبڵی 1999.
- هونەری کتێب خوێندنەوە.
- چاوپیاخشـاندنێك بەژمارەیـەکی ڕۆژنامەیـەکی سویدیدا.
- ئەراگۆن لەگفتوگۆیەکدا
- تەسلیمە نەسرین: "بەچەکی هیومانیزم دەجەنگم"




- (شوناس) ڕۆمانی تازەی میلان کۆندێرا
- ئەو پیاوەی دەیویست ڕێڕەوی مێژوو بگۆڕێت
- لەتاریکیەوە بۆ ڕووناکی
- "چەك و چیا" یاخود دوورگە لەبیرکراوەکان
- دواڕۆژی عیراق

# مەهاباهاراتا
# نمایشی سەدەی بیستەم

دانا رؤوف/ سوید

*مـەهاباهاراتا دادەنرێـت بەیـەکێك لـەگرنگترین پـرۆژە شـانۆییەکانی ئـەم سـەدەیە. پێتـەر بـروك(1) لـە روانگـەی هەڵکۆڵین‌و خوێندنەوەیەکی نوێ وە بۆ ئـەو ئەفسانە دێرینـەی رۆژهەڵات، خەون، پەژارە، ژان‌و چارەنووسی هـەموو مرۆڤایـەتی دەخاتەڕوو.*

*نمایش کردنـی ئـەو ئەفسانەیە دەبێتـە رووداوێکـی شـانۆیی گرنگ‌و هەموو ئـەورووپاو جیهان بەوپەڕی بایەخـەوە دەڕواننـە بەها پیرۆزو گرنگەکانی ئەو پرۆژەیە.*

*ئەمرۆ ئەو ئەزموونە بەهایـەکی گرنگـی لـە رەوتـی مێژووی شانۆی جیهانیدا هەیەو، تا ئێستاش جێگای باس‌و لێدوانـە. جا لەبەر گرنگی ئەو رووداوە شانۆییە بە پێویستم زانی بەکورتی هـەندێ باس لـە نـاوەرۆك‌و بارودۆخی هێنانـە بەرهـەمی ئـەو پرۆژەیە بکەم(2).*

***مەهاباهاراتا**

پێتـەر بـروك لەسـاڵی 1984دا لەگـەڵ کۆمـەڵێ پسـپۆڕو نووسـەری گـەورەو ئەکتـەرو سـینۆگرافی سـەر بەشانزە وڵاتـی جیا، دەکەونە خۆئامادەکردن بۆ نمایشکردنی پرۆژەیەکی گەورە. (رۆژهەڵات) وەك سـیمبولێکی میتۆلـۆژی دەبێتە دەروازەی ئـەو خەونە. خـەون لەفـەنتازیای داستان‌و ئەفسـانەکانی رۆژهەڵاتـەوە دەسـتەبەری ئـەو سـترکتورە ئەورووپیـە دەکـات. (مەهاباهاراتا)(3) وەك داستانە شیعرێکی نەفـەس درێـژی گەلی هندستان دەبێتە زەمینەی ئـەو گەشـتە پـڕ لەخـەون‌و ژان‌و فەنتازیایە.

(مـەهاباهاراتا) یەکێکـە لەگەورەترین‌و مەزنترین کتێبە دێرینەکانی جیهان. هـەروەها بـەدرێژترین چیرۆکـە شـیعر دادەنرێـت کـە لـە مێـژووی مرۆڤایـەتیدا تـا ئێسـتا نووسـرابێت. ئـەم شـاکارە بـەزمانی (سانسـکریتی) نووسراوەو زیاتر لەسەد هـەزار بەیتەو، لەهەژدە کتێبی گـەورە (وبگرە زیاتر)دا کۆکراوەتـەوە. مێـژووی یەکـەم دەستنووسـی مـەهاباهاراتا دەگەڕێتـەوە بـۆ



سەدەی شەشەم یان پێنجەمی بەر لە دایک بوونی مەسیح. بەڵام ئەم شاکارە شێوازی کۆتاییو تەواوەتی خۆی وەرنەگرتووە، بەڵکو دوای ئەو مێژووە بەردەوام لەحەوت، یاخود هەشت هەزارساڵی تردا، دارشتنو نووسینەوەی ئەو داستانە شیعریە هەر بەردەوام بووە، تا سەدەی سێیەم یان چوارەمی دوای لەدایک بوونی مەسیح. لەو مێژووە بەدواوە مەهاباهاراتا زیاتر فۆرمو شێوازی کۆتاییو تەواوەتی خۆی وەردەگرێت.

ئەو داستانە شیعریە مەزنە بۆ بروك دەبێتە زەمینەو دەروازەیەکی ئەفسوونی. پرۆژەیەك کە تیایدا سترکتوری میتۆلۆژیایەکی دێرین هەڵوەشاوەتەوەو سەرلەنوێ لەروانگەو دیدی ریژیسۆرێکی بلیمەتی وەك پێتەر بروکەوە دارێژراوەتەوە.

بنیات نانەوەی مەهاباهاراتا دارشتنەوەی میتۆلۆژیای سەردەمە. بروك خۆی سەبارەت بەو داستانە شیعریە وتوویەتی: شاکارێك تەنها (هند) توانیویەتی بیخولقێنێ، بەڵام دەنگدانەوەی دەبەخشێت بەهەموو مرۆڤایەتی.

*ناوەڕۆکی مەهاباهاراتا

ئەم شاکارە (شیعریە مەزنە جیهانیە) مێژووی چیرۆکی شەڕێکی درێژو خوێناوی لەنێوان دوو گرووپی بەیەك ئامۆزادا دەگێڕێتەوە: پانداڤاس، پێنج برا بوون؛ لەگەڵ کایۆراڤاس، سەد کەس بوون.

ئەم شەڕی خێزانە لەسەر ئەوە بووە کامیان دەسەلات بگرێتە دەست. ئەو ناکۆکیە بەجەنگێکی زۆر گەورەو خوێناوی کۆتایی دێت کە تێکڕای چارەنووسی جیهان دەچێتە ئەرازووی ئەو گەمەیەوە.

لەم داستانە شیعرییەدا شانزە کاراکتەری سەرەکی هەیە. هەر یەکە لەو کاراکتەرانە پێناسەیەکی ئاشکراو خودێکی چڕوگران لەخۆدەگرێت.

هەریەك لەو کەسێتیانەش ڕووداوو گێڕانەوەی تایبەت بەخۆی هەیە. بێگومان ڕووداوی هەر یەك لەو کاراکتەرانەش بەشێکە لە ڕووداوە گەورە سەرەکیەکە.

زۆربەی پسپۆڕو شارەزایان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە ئەو ڕووداوانەی لە (مەهاباهارتا)دا دەگێڕێتەوە، بنەمایەکی مێژوویی هەیە.

لەلایەکی دیکەشەوە هەندێکی تر دەڵێن. سەد دەر سەدی ئەو داستانە تەنها ئەفسانەو داستانێکی میتۆلۆژییە. داستانێکی شیعری وەها گەورەو مەزن چۆن لەپرۆژەیەکی شانۆییدا بەرجەستە دەبێت.

هاریکارو نووسەرو ئامادەکاری پرۆژەکە Jean-ClaudeCarriere سەبارەت بەو پرۆسێسە لەو نامیلکە تایبەتەی کە لەگەڵ پیتەر بروك سەبارەت بە فیلم کردنی(4) پرۆژەکەدا دەریان کردووە دەڵێت: کە مەشقو پرۆڤە لە سێپتێمبەری 1984دا دەستی پێکرد، پیەسەکە ئامادەکرابوو، بەلام هیچ ستركتورێکی کۆتاییو بەرەنجامێکی دیاریکراوی لەخۆنەگرتبوو. هەموو شتێك لە ڕوانگەی پرۆسەی ئەو نۆ مانگی مەشقو بنیات نانەوە بەشێوەیەکی بەردەوام گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. بۆ ماوەیەکی درێژ ئێمە نەماندەزانی پیەسەکە چەند دەخایەنێت، چەند کاژێر نمایشکردن پێویست دەبێت، یان بەشێوەیەکی گشتی چەند پیەس بەکار دەهێنرێت(5).

کەواتە گەڕانو هەڵکۆڵین، لەدیدێکی چڕو تێڕامانێکی قووڵەوە، یەکێك بووە لە بنەما زۆر گرنگەکانی ئەفراندنی ئەم پرۆژەیە. هەموو پرۆژەیەکیش ئەزموونێکە بەنێو کۆمەڵێ توخمو بەهای نادیاردا، لەبەر ئەوە هیچ پانتاییەك، دارشتەیەك لەو گەشتە پڕ لە ئەندێشەو هەڵچوونو تەقەلا مەزنەدا جێگیرو پیرۆز نیە. تەنها ئەگەری گەڕانو ئەزموونکاری فەلسەفەی بەردەوامیو بەدیهێنانی ئەو جیهانبینییە. ئەمەش یەکێکە لەبنەما گرنگەکانی فەلسەفەو کاری پیتەر بروك.

دواجار ئەم داستانە لە نمایشێکی دە کاژمێریداو لەڕوانگەی سێ بەشەوە، وەك نمایشێکی سێ کوچکەیی پێشکەش کراوە. دارشتەی گوتارە شانۆییەکە لەپانتاییەکی ئەفسووونیدا مۆسیقای ڕۆژهەلاتو نوێ، سەماو جلو بەرگێکی ڕەنگ دەولەمەند دەبێتە زەمەنی ئەو داستانە پڕ لە ئەندێشەیە. (بروك) لەو سێ کوچکە شانۆییەدا کە بریتین لە (یاری زار، پەناهەندە لەدارستانداو جەنگ) پێکهاتەیەکی هونەری مەزنی بەرجەستە کردووە. پێکداچوونێکی ئەو شانۆ (پیرۆز)ە کە بروك لە

کتێبەکەیدا (پانتایی خاڵی) باسی لێوە کردووە، لەگەڵ ئەو شێوازە (جەماوەر) بیەی کە سەرەتاکەی لەلای شەکسپیرەو بروك بەچاوێکی پڕ بایەخو ستایشەوە تێدەڕوانێت. پێتەر بروك ڕای وەهایە کە ئەو شانۆ شیعرئامێزە بەرزەی شەکسپیر نەفەسێکی قووڵی جەماوەریش لەخۆدەگرێت.

***پەراوێزو سەرچاوە:***

1- پێتەر بروك یەکێکە لە شانۆکارە بلیمەتەکانی ئەم سەدەیە. لەساڵی 1925 لە ئینگلستانو لەخێزانێکی بە نەژاد رووسی لەدایك بوە. لەساڵی 1948دا کە تەمەنی تەنها 24 ساڵ بووە، دەبێتە بەرپرسی Royal Opeara Covent Garden لە لەندەن. بەڵام تەنها دوای دوو ساڵ لەو دەزگا هونەریە گرنگە دەست لەو کارە دەکێشێتەوە. دوای ئەوە کۆمەڵی پرۆژەی ناتەباو سەرکەوتوو لە لەندەن، پاریسو نیویۆرك پێشکەش دەکات. بەدامەزراندنی لەشانۆی شاهانەی شەکسپیر لە ستراتفۆرد Royal Shakespeare Theateri Stratford- on-Avon بەرهەمەکانی پێدەنێتە قۆناغێکی ترەوە. پێتەر بروك لەم دەزگا هونەریە گەورەیەی لەندەن چەندین ئەزموونی گەورە پێشکەش بەکلتووری شانۆی هاوچەرخی جیهان دەکات، لەوانە: شالیر، مارا- ساد، خەونی نیوەشەوێکی هاوین، تیتوس ئەندرۆنیکۆسو چەندین شاکاری تری شانۆییو ئۆپێرار. بەڵام شانۆی شاهانەی شەکسپیر هەموو خەونو خولیای بروك ناهێنێتەدی. لەبەر ئەوە لەساڵی 1970 بەدواوە واز لەو دەزگا تقلیدیە مەزنەی شانۆ دەهێنێتو بەتەواوەتی لەپاریس جێگیر دەبێت. لەپاریس مەڵبەندێکی گرنگی نێونەتەوەیی بۆ لێکۆڵینەوەو پێشکەش کردنی شانۆیی دادەمەزرێنێت.

2- ماوەیەکە خەریکی نووسینو ئامادەکردنی کتێبێکم سەبارەت بە پێتەر بروکو یەك لەسەر چواری کارەکەم تەواو کردووە. بەڵام بەداخەوە ماوەیەکە بەهۆی سەرقاڵیم بەخوێندنەوە بەتەواوەتی بواری کارکردنم لەم پرۆژەیەدا تەسك بۆتەوە. بەو هیوایەی ساڵی ئایندەو دوای تەواوکردنی خوێندن بگەڕێمەوە سەری.

3- مەها لەزمانی سانسکرتیدا مانای "گەورە" یاخود "تەواوەتی- کل" دەگەیەنێت. مەهارایاها بەمانای پادشایەکی گەورە دێت. بەهاراتەش زیاتر بەرجەستەی ناوێکی ئەفسانییە. دواتر ئەو ناوە بەخشراوە بە یەکێك لەو هۆزانە. ئەکرێت ئەو ناونیشانە بەم شێوەیەش بخوێندرێتەوە "مێژووی بەهاراتای گەورەو مەزن". یاخود "مێژوویەکی گەورەو مەزنی مرۆڤایەتی". چونکە بەهاراتا لە هەندێ خوێندنەوەی تردا مانای /هیندۆ/ نەژادیش دەگەیەنێت کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چەمکی مرۆڤو مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

4- جێگای داخە کە من شانۆیی (مەهاباهاراتا)م ڕاستەوخۆ لەسەر شانۆ نەدیووە. بەڵام بە ڤیدیو لەڕوانگەی فیلمێکی شەش کاژێرییەوە زۆر بەوردی تەماشام کردووە. ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری تر لە بەرهەمە گرنگەکانی بروکم بە ڤیدیو دیوە وەك کەرەسەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ سوود لێوەرگرتن بۆ نووسینی ئەو کتێبەی سەبارەت (پێتەر بروك) بەدەستمەوەیە.

-5The Mahabharata. A Viewer's gude to Peter Brook's epic film.

# گونتەرگراس و نۆبڵی 1999

ئامادەکردن و وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی


گونتەرگراس

گونتەر گراس (Gunter Grass) ی نووسەرو ڕۆماننووس یەکێکە لە ئەدیبە دیارەکانی ئەڵمانیاو هەروەکو سکرتێری ئەکادیمیای شاهەنشاهی سویدی وتی: (لەبەر ئەوەی لەنووسینەکانیدا لایەنە فەرامۆشکراوەکانی مێژوو ڕەنگدەداتەوەو، لەسەر زمانی گیانەوەرانو لەفۆرمێکی تەنزئامێزی ڕەخنەییانەدا بابەتەکان دەخاتەڕوو) لەمانگی سپتامبەری ئەمساڵدا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی پێ بەخشراو بەمجۆرە چووە ریزی ئەو ئەدیبە گەورانەی ئەڵمانیاوە کە خەڵاتی نۆبڵیان لەبواری ئەدەبدا وەرگرتووە، لەوانەش تۆماس مانو هێرمان هیسەو هاینریش بۆڵ.

وەختێ گراس خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا، وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا "یۆشکا فیشێر" لەلێدوانێکدا وتی: "چل ساڵ زیاترە کە ناوی گونتەرگراس بەئەدەبی ئەڵمانیاوە بەندەو، ئەو نەك هەر لە بزاڤی ئەدەبی ئەڵمانیادا ڕۆڵێکی دیاری هەبووە، بەڵکو وەکو ڕەخنەگرێکی کەموکورتییە کۆمەلایەتیو سیاسییەکانی کۆمەڵگای ئەڵمانیش ناسراوەو ئەو هەمیشە بۆ ڕێبازە کۆمەڵایەتی- سیاسییەکەی خۆی ئەمەکدار بووەو بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ بەو لەمساڵدا گەورەترین ڕێزلێنانە لەوو شایانی ئاستی ئەدەبیەتی".

شایانی باسە گونتەرگراس بەردەوام یەکێك بووە لەلایەنگرانی مافی پەنابەرانو وڵاتانی ستەمدیدەو ئەوەبوو کاتێ یەشار کەمالیش لەگۆڤاری "دیر شبیگل"ی ئەڵمانیدا وتارێکی سەبارەت بە پێشێلکردنی مافی کورد لەلایەن حکومەتی تورکیاوە نووسی،

گراس لەو هەلۆیستەیدا لەگەڵ کۆمەڵێك نووسەری تردا پشتگیرییان لێ کرد، لەوانە: خۆزێ ساراماگۆ، نادین گۆردیمیر.

## ژیانی گونتەرگراس لەچەند دێڕێکدا:

- سالی 1927 لەشاری "دانسگ" لەپۆلۆنیا لەدایکبوو.
- سالی 1944 قۆناغی ئامادەیی لەخوێندندا تەواو کردووە.
- وەکو سەربازێکی هێزی ئاسمانی لەدووەمین جەنگی جیهانیدا بەشداریی کردووە.
- لەسالانی 1948-1952دا هونەری پەیکەرتاشیو گرافیکی خوێندووە.
- لەسەرەتای پەنجاکانەوە دەستی بە نووسین کردووە.
- لەسالانی 1956-1960 لەپاریس بووە.
- لەسالی 1968دائەنجومەنێکی بەناوی ئەنجومەنی هاندان بۆ هەڵبژاردنی سۆسیال دیموکراتی دروستکرد.
- لەسالی 1969دا لەهەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی فیدراڵدا بوو بە وتەبێژی حیزبی سۆسیال دیموکرات.
- سالی 1983 کرا بە سەرۆکی ئەکادیمیای هونەرەکان لەشاری بەرلین.
- لەژیانی ئەدەبیدا چەندین خەڵاتی گەورەی دراوەتێ.
- لەکارە بەناوبانگەکانی گراس: تەپڵی تەنەکە، مشکەکانو پشیلەکان، سالی سەگ، لافاو، هاواری بۆق.
- گراس جگ لە رۆمان دیوانی شیعرو شانۆنامەشی هەیەو لەبواری شێوەکاریشدا دەستی هەبووە.

کۆتایی بەشێك لەکتێبی مێژوو

## نامەیەکی گونتەرگراش بۆ کینزا بۆرۆئۆیی

کارەساتەکانی دووەمین **جەنگی جیهانی هەرچۆن** ئاسەواری خۆیان لەسەر بیرو ویژدانی گەلێ لەنووسەرانی دونیا جێهێشت، ئاوەهاش کاریگەریی خۆیان لەسەر رۆحو هەستو سۆزی گونتەرگراس هەبوو. هەربۆیە گراس پاش سالانێکی زۆر لەو جەنگە لەچەند نامەیەکی والادا کە ئاراستەی رۆماننووسی ژاپۆنی "کینزا بۆرۆئۆیی" کردوون (کە ئەویش لەسالی 1994دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرت) بەزمانێکی سادە بەلام پڕ لە هەستو سۆزی پاکو بیرێکی مرۆڤدۆستانەوە سەبارەت نەهامەتیەکانی ئەو جەنگە دەدوێ.

وا لێرەدا یەکێك لەو نامانە دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی "سەردەم":

### کینزا بۆرۆ ئۆیی ئازیز

نازانم، لەوانەیە تۆش دوچاری ئو گرفتە بووبیت کە من ئێستا دوچاری بووم. ئەم رۆژانە هەموو داوای ئەوەم لێدەکەن چەند وشەیەك یا تەنانەت بابەتی درێژ لەسەر ئەو رۆژانە بنووسم. سەبارەت پەنجا سال لەمەوبەر، واتە ئەو رۆژگارەی کە تیایدا دووەمین جەنگی جیهانی سەرەتا بۆ ئەڵمانیاو دواتریش بۆ ژاپۆن بەخۆبەدەستەوەدانێکی بێمەرج کۆتایی هات.

**بەلام لەبەر ئەوەی من** حەزناکەم لەسەر داوای خەڵك شت بنووسم، ئەو شتانە لەشێوەی نامەیەکدا بۆ تۆی دەنووسم، چونکە تۆش وەکو من سەر بەوەچەیەکیت کە لەرۆژگاری جەنگدا یان منال بوویتو یان لاو.

ئێمە هەروەکو سەکەی پێشوەخت لێدراو بووینە قوربانیی ئەم جەنگەو دەبووایە هەردووکمان شایەدی ئەوەبین **کە دەرەنجامەکانی جەنگ هەروا**

بەئاسانی دەسبەردارمان نابن.

هەم من هەم تۆش هەر دە ساڵ جارێك باشتر پەی بەوە دەبەین کە تارمایی تاوانەکانی ئەڵمانیەکانو ژاپۆنیەکان تا ئەمرۆش بەقورسی چۆکی داداوەتە سەر کۆمەڵگاکەمان.

من رۆژی 8ی مانگی ئایاری 1945 لە نەخۆشخانەیەکی سەربازیدا بووم کە ئەو یۆتۆپیاو ئامانجە هیچو گاڵەجارانەیەی ئەوان واتە "دوا سەرکەوتن" بەیەکجاری هەرەسی هێنا. منیش بەهەمان هەست بەپووچیەوە لەقوژبنێکدا وەستابوومو تەماشام دەکرد. دەستم بەشتێکەوە گیرنەبوو بەسەختیش هەسم بە لاوازی دەکرد. تاقە شتێکی زیندوو کە بەپەتەوی بۆم مابووەوە ئیرادەم بوو بۆ ژیان. نووسەران ئەمجۆرە ئەزموونانە دەپارێزنو لای خۆیان دەیانهێڵنەوە، ئەوان ناتوانن خۆیان دابەزێننە ئاستی بنیادەمێکی "فرە خۆشبەخت" وە کە هەوڵدەدات یادگاریەیە تاڵەکانی بەفەرامۆشی بسپێرێت. کەسێك کە شیعری داستانی دەنووسێت باش دەزانێت کەمێژووناسە پێشەند (موحتەریف)ەکان پێویستیان بەوەیە هەندێ قۆناغەکانی مێژوو وەکو کۆتایی بەشێك لەکتێبی مێژوو بەجۆرێك لەقەڵەمبدەن کە دەبنە مایەی ئومێدی کزو لاواز.

لەئەڵمانیا لەکاتی "جەنگی مێژوونووسان"ەوە ئەم مەسەلەیە بووەتە جێی باسو گفتوگۆی توندوتیژ. هەر لەبەر ئەمە زۆر حەزدەکەم بزانم لەوێ بیرورای گشتی لەم بارەیەوە چیە. لەودیو ئەم مەسەلەیەوە چ بەرژەوەندییەك بۆ ئێمە هەیە کەوامان لێ دەکات بەخواستێکی زیادەرەوانەو فۆرمەلە بووەوە خاڵی کۆتایی لەبەردەم مێژوودا دابنێین؟ کێ لە ئێوەش بێ پەروایانە خۆی دەخاتە بەردەم ئەم رووداوە "مێژووساز"ەوە؟

من بۆ تۆ دەنووسم، لەبەر ئەوەی کتێبەکانتم خوێندۆتەوەو دەزانم تۆیش بەکارە ئەدەبیەکانی من ئاشنایت. ئێمە لەتۆکیۆ یەکترمان بینیو چەند مانگێك پاشتریش لەفرانکفۆرت. ئیدی گفتوگۆکان تایبەتی بووبن یان گشتی، ئێمە زوو گەیشتینە ئەوەی مەبەستمانە. ئاماژە بۆ ئەو برینە دەکەم کە سارێژ نابێت. بێگومان ئێمە هەر لەتافی لاویمانەوە مۆری "گوناهکار"مان بەتەوێڵەوەیە، ئەوەش لەو دەمەرا کە ئەڵمانیاو ژاپۆن، تەوەری تۆکیۆ- بەرلین، بەلافە ئیمپریالیستیەکانیانەوە کە خۆیان بەدوو هاوپەیمان دەزانی: دو وڵاتی دیکتاتۆر کە حوکمی جیهانیان دەکردو بەئامێرە جەنگیەکانیانەوە هەرەشەیان لەدونیا دەکرد.

ئەوەشمان بینی کە دونیا چۆن وەڵامێکی لووتشکێنانەیان دانەوەو جەنگیش بەشکستی تەواوی ئەوان کۆتایی هات. فەرمانی دەسەڵاتە سەرکەوتووەکانیش واتە "خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدو شەرت" سەرەتاو بەر لەهەموو شوێنێك، لەناوچە سەربازییەکاندا جێبەجێ کرا. ئەمەش بەتەنها کۆتایی جەنگێکی تاوانکارانە نەبوو، بەڵکو لەنێوبردنی بەرنامەیەکی فراوانو دیاریکراو بوو بۆ کوشتارو جینۆسایدی جوولەکەکانو قەرەجەکانیش. زۆربوونی ئۆردوگا جەنگیەکانیش هەر لە "Auschwitz"ەوە بیگرە تا "Bergen- Belsen" بەڵگەی قووڵی ئەو کارەساتەن.

من تا ئەمرۆش- کە ئەوسا حەقدە ساڵان بووم- بەرامبەر بەو تاوانە هەست بەنەفرەتو شەرم دەکەمو لەراستیدا هیچ شتێك ناتوانێت ئەو نەفرەتو شەرمەی ناودڵم لەناوبەرێت، یان تەنانەت کەمیبکاتەوە.

تێکشکاندنی ژاپۆن تەنها بە خۆبەدەستەوەدانی سەربازییانەی ئەو کۆتایی نەهات. بەڵکو بەهۆی ئەو تێکشکانە سەربازییەوە بوو کە خەڵکی گەلێ وڵاتی وەکو: چین، کۆریا، بۆرماو تەنانەت ئەندۆنیسیاو فیلیپین توانیان

لەژێر چنگی هێزێکی داگیرکەری بێبەزەیی ڕزگاریان ببێت. ئێستاکە لەئەڵەمانیا باس لەوەیە -بەڵام بەسڵەوە- کە ئایا ڕۆژی 8ی ئایار بکرێ بەجەژنی ساڵڕۆژی کۆتایی جەنگ یان ڕۆژی ڕزگاری. بیرمە کە ساڵانی سەرەتای جەنگ خەڵکی سڵیان لەبەکارهێنانی وشەی "پاشەکشێ" دەکردەوەو هاوکات پێیان خۆش بوو کە ئەم مەسەلەیە ناوبنێن کۆتایی ناچارانەی دەسەڵاتی سەربازی. لەراستیدا ئەوە دەستپێکردنەوەیەك بوو لەسفرەوە. واتە دەبوایە هەموو شتەکان لە سەرەتاوە دەست پێبکەنەوە، بەبێ ئەوەی بڕواننە وێرانیە فراوانەکانی رابردووی خۆیان، بەبێ ئەوەی بیر لە پەڵەکانی شوورەیی خۆیان بکەنەوە. ئەو ئیرادە بێ سنورو زیندووەی قۆناغی لاوێتیی من بۆ ژیانو زیندووێتی، ئیرادەی ملیۆنەها کەسی دیکەش بوو.

ڕەوتی ئەم دزێوییە تاڵانە بەجۆرێك لەجۆران دەسکەوتی باشیشی لێ کەوتەوە: ئەو هێزە مەزنەی کە بەسەلامەتی لەبەڵای جەنگ ڕزگاری بوو، لەبواری ئابووریدا کەوتنە کارو بەرەنجامەکەش ئەوە بوو کە دواتر بە "ئابووریی ئەڵمانی" ناسرا. هێزی جیهانیانەی ئابووریی ژاپۆنیش بەهەمان شێوە گەشەی سەند. دەتوت تەوەری بەرلین-تۆکیۆ وەکو خۆی ماوەتەوە. هێزە سەرکەوتووەکانیش بەسەر سوڕمانو ترسو بگرە بەئێرەییشەوە شایەدی ئەوە بوون کە دوژمنە تێکشکاوەکانی دوێنێیان چۆن یەکێکیان بەسڵەوە لەبواری سیاسیدا خۆی نمایش دەکاتو، ئەوی تریشیان بووە بە لۆزەندەرێکی ئابووری. هەندێ جار مرۆڤ لەخۆی دەپرسێت؛ ئایا ئەڵمانیاو ژاپۆن نەبوون کە بە سەرکەوتوویی لەجەنگەکە هاتنە دەرێ؟

بێگومان ئەمەپرسیارێکی ساویلکانەیەو تیایدا ئەو لەبیردەکرێ کە جەنگ چ ئەوساو چ ئێستاش چۆن گورزێکی گەورەی لەبونیادی ئەڵمانیاو ژاپۆن وەشاندووە. ئەڵمانیاو ژاپۆن هەردووکیان دوو وڵاتی دەوڵەمەندن، بەڵام کە مەسەلەی بەها مەعنەوییەکان دێتە پێشەوە؛ ئەوا لەریزی هەژارترین وڵاتەکانن. ڕۆژ دوای ڕۆژ گەڕانەوە بۆ بەربەریەت هەڕەشە لەم کۆمەڵگایانە دەکات. خەڵکانی ئەم وڵاتانە وێڕای تواناو سامانی ئابووری هێشتا نەیانتوانیوە شوناسی خۆیان بدۆزنەوە. لە ئەڵمانیاداو بەم دواییە بەئاشکرا ئەو حاڵەتانە بەدی دەکرێن کە لەئەنجامی ئەو گوشارە دەروونیانەوە پەیدابوون.

پێنج ساڵ زیاتر لەمەوبەر، وەختێ کەپەردەی ئاسنین لەئەوروپادا هەڵگیراو دیواری بەرلین ڕووخا لەکۆتاییدا ئەڵمانیەکان بەختی ئەوەیان هەبوو کە وڵاتە دوو کەرتەکەیان بکەنەوە بەیەك؛ ئومێدی ئەوە هەبوو کە ئێمە بەسڵەوە ئەم دیارییە یەزدانییە وەربگرین. بەڵام کارەکە بەمجۆرە نەبوو. ئەم گرتنە خۆیەی دەوڵەت - لەراستیدا "کۆماری دیموکراتی خەڵکی ئەڵمانیا" بوو کە خرایە سەر خۆرئاوا- نەیتوانی ئەو درزە کۆمەڵایەتیە بشارێتەوە کە لەنێوان خەڵکی هەردوو بەشەکەدا دروست ببوو.

سەرباری زمانی هاوبەش، بەدرێژایی چل ساڵ لێك دابڕان درزێکی گەورە لەنێوان ئەو دوو بەشەدا دروست بووەو قووڵتریش بووە. ئەڵمانیای گەورەش لەم ڕووەوە تەنها هەنگاوی بچووك دەنێت. شەپۆلی ڕەزالەتو خراپە سایەی بەسەرکۆمەڵگادا کێشاوە. خەسڵەتە شوورەیی ئامێزەکەی جاران: دوژمنایەتیکردنی خەڵکی بیانی، خۆ دزینەوە لەمافی پەنابەران (کە ئەم ڕۆژانە بووە بە بەشێك لە یاسای سەرەکیی ئێمە) و دەرکردنی ئەو کەسانەی داوای پەنابەری دەکەن بەشێوەیەکی ڕۆژانەو

خالی لەهەموو بەزەییەك، ئەمانە هەموو بوون بەشتێکی زۆر ئاسایی.

نەخێر، یەکبوونێکی وەها ئازایانە بەکەڵکی ئەم وڵاتە نایەت. بەداخەوە بەرامبەر حیزبێکی لەخۆبایی حوکمڕان؛ ئۆپۆزسیۆنێکی دەستو پێ شکاو هەیە. ئێستا بڵاوکراوەکان بەشێوە ڕەنگینترن؛ بەڵام هەموو یەك ڕوخساریان هەیە. فەسادی ماڵیو ئیداری زیاتر تەشەنەی کردووەو هیچ یەکێکیش لەوانە نەك هەر سزا نادرێن؛ بەڵکو سەرزەنشتیش ناکرێن. لەم دارمانی بەها مەعنەویانەدا جێیەك بۆ چاندنی ئایدیا نوێیەکان نەماوەو وانەکانی دیموکراسی کە بەزەحمەت دەگوترێنەوە؛ تا بێت زیاتر دەچنە خانەی فەرامۆشیەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کە من کۆتایی ئەسەفباری ئەم سیناریۆیەم لەبەرچاوە– و پەنجا ساڵ پاش خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدو شەرتی وڵاتی ئەڵمانیای گەورە، بەڕوونی شکستی تازەی کۆماری فیدراڵی گەورەی ئەڵمانیا دەبینم– دەمویست بزانم ئێوە چۆنن؟ کینزا بۆرۆ ئۆیی ئازیز، ئەی تۆ گۆرانکارییەکانی وڵاتەکەت چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

ئێمە لەتافی لاویدا لەکوێ چاوەڕێی ئەوە بووین کە ڕۆژێك ئەڵمانیەکانو ژاپۆنیەکانو تەنانەت دونیاش، پاش ئەو دادگا نێودەوڵەتیانەی بۆ تاوانبارانی جەنگی ئەڵمانیو ژاپۆنی ئەنجامدران، دیسانەوە جێی هەڕەشە دەبن؟ تەنانەت تاوانی شەڕی پاش ئەو، واتە بۆردومانی ئەتۆمیی دوو شارە ژاپۆنیەکە ئێمەی دووچاری نائومێدی نەکرد. پەنجا ساڵ دوای ئەو جەنگە هێشتا ئێمە لەگۆشە جیاجیاکانی دونیادا جەنگی خوێنین دەبینینەوە. هێشتاکە دوا قسە هی جەنگە. لەژێر ناوی "پاکسازیی نەژادی"دا هێشتا لە بەڵقان شەڕ بەردەوامەو دونیاش لەکاتێکا خەمی بەرژەوەندیی خۆیانە بێدەسەڵاتانەو نیگەران تەماشای ئەم شەڕە دەکەنو بەس. بەڕواڵەت وا پێدەچێت کە بە کۆتایی شەڕی سارد، بۆ جارێکی دی شەڕی ڕاستەقینە دەستی پێ کردبێتەوە. بەراستی هەست نەکردنە بە بەرپرسیاری گەر بمانەوێ لەم هەلومەرجانەدا ئومێدی گەورەمان هەبێت.

هاوڕێی ئازیز، ئێمە پیرو پیرتر بووین، بەڵام ئێمە ڕۆڵەی مارانگازین. منو تۆ بەناچاری فێربووین کە بەیادی نووسەرانمانەوە بەرامبەر ئەڵمانیاو ژاپۆن بوەستینەوە.

ئێمە هەردووکمان فێربووین کە تەماشاکەربین.یان بەدەربڕینێکی دی ئەوانەی بەرد فڕێ ئەدەنو بەخانووی شووشەوە وابەستەنین. بەم لێکدانەوەیەش کاری ئێمە هەمان تێڕوانینی ڕەخنەییانەیە کە لە خۆشەویستیمانەوە بۆ نیشتمانەکەمان سەرچاوەی گرتووە. بۆیە بۆشت دەنووسم تا زیاتر لەیەك نزیك بینەوە، جگە لەوە وا هەستدەکەمو ئومێدەواریشم کە ئەم نامە گۆڕینەوەیەی ئێمە ببێتە جێ سەرنجی بیروڕای گشتی.

لەگەڵ سڵاوی گەرممدا

**گونتەرگراس**

<u>تێبینی:</u> دەقی نامەکەی گونتەرگراس لە گۆڤاری (آدینە) ژمارە (130)ی ای شەهریوەری 1377 (1998)ەوە کراوە بە کوردی.

# هونەری کتێب خوێندنەوە

و: ستار کەریم


ڤلادیمیر نابۆکۆڤ

رادیۆی ئیتالیا گفتوگۆیەکی لەگەڵ شاعیری ئیتالی ئۆگینۆمۆنتاڵ (EUGENIO MONTALE ، 1896 – 1981) وەرگری خەڵاتی نۆبڵ، دەربارەی هونەری کتێب خوێندنەوە پەخش کردبوو، رۆژنامەی "کۆریر دلاسرا " دەقی ئەو گفتوگۆیەی بڵاوکردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

- ئایا لەگەڵ شێوازی خوێندنەوەی لەسەرخۆ دایت؟

+ بەبێگومان رێگەی بیرکردنەوە خێراییەکی وەرگرتووە، بەڵام لەبارەی کتێب خوێندنەوە وەمەسەلەکە جیاوازە. بەهەرحاڵ، شێوازی کتێب خوێندنەوەمان هەیە و شێوازی دووبارە یا پیاچوونەوەش هەیە.

ناکرێ "پروست – PROUST" بەخێرایی و سەرپێیی بخوێنرێتەوە، بەڵام لە جارێك زیاتر دەکرێت خێراتر بێت.

هەندێ کتێب بۆ نموونە کتێبە پۆلیسییەکان ناچارت دەکات بەخێرایی بخوێنیتەوە. پێویستە بڵێم باشترین بۆچوون ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێ کتێبە بازاڕی و پۆلیسییەکان

نەخوێنینەوە، یا ئەگەر بیخوێنینەوە لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا دەست پێبکەین، لەبەرئەوەی تەنیا لایەنی سەرنج ڕاکێش و ئاراستەکراو لە کۆتاییدایە. لەلایەکی ترەوە پێویستە پێشەکی دووردرێژ و ماندووکەر نەبێت، خوێنەرەکە دەهێنێتە جۆش و خرۆش.

- بەم جۆرە بە ڕای ئێوە، شێوازی خوێندنەوەی لەسەرخۆ یاسایەکی گشتی و باو نییە؟

+ بە هیچ جۆرێ. بەپێچەوانەوە، لەمڕۆدا بەهۆی چاپ کردنی زۆری کتێبەوە، خوێندنەوەی لەسەرخۆ زیاتر لەناوچووە. بەشێوەیەکی باو ئێستا خەڵك زیاتر چاو بە کتێبدا دەگێڕن، ئەوانە شێوازەکە قورس دەکەن. هەم عادەتێکی خراپ نییە. لە هەموو بوارێکەوە 99٪ دەتوانی لە پێنج خولەکدا لایەنەکانی تێبگەیت ئایا کتێبەکە بۆ خوێندنەوە دەشێت یان نا.

- بە بڕوای ئێوە خوێندنەوەی کتێب بەشێوەیەکی هونەری بۆ سەرگەرمی و خوێندنەوەی ڕەخنەییانە، دوو شێوازی لێک جیاوازن؟

+ لە زۆربەی لایەنەکانەوە بەڵێ و لە زۆر لایەنی ترەوە نەخێر، بۆ نموونە کتێبێکی دلگیر زۆر جار بێبەها و بازاڕییە، گەرچی هەمیشە هەندێ نووسەر هەن کە بەرهەمەکانیان مەقبوول و دلگیرە. نامەوێ هەندێ لە نووسەرانی هاوچەرخ برەنجێنم و ناویان بێنم، بەڵام بۆ نموونەی باسەکەمان نووسینەکانی "ئەناتۆل فرانس" بەبێ دوودڵی بە چێژ و سەرنج ڕاکێشن، هەرچەند ئەم لایەنە بە هیچ جۆرێ لە گرنگی ئەو کەم ناکاتەوە. بەپێچەوانەوە هەندێ نووسەر هەیە کە بەردەوامن لەسەر نووسینی ئاڵۆز و دژوار. لە گرنگترین ئەو نووسەرانە "جیمس جویس" ە. زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە "ئولیس" ی ئەویان خوێندۆتەوە و چێژیان لێوەرگرتبێ. بەڵام بەبێ دوودڵی ناوبانگی جیمس جویس بەبێ "ئولیس"، سەرەڕای داستانە کورتە جوانەکانی، زۆر کەمتر دەبوو.

ئێمە خۆمان "ئەنتۆنیۆ پیزوتۆ – ANTONIO PIZZUTO" مان هەیە، خەڵکی "سیسیل" ە ئەو نووسەرێکی زۆر دیارە. ئێستا پیر بووە. کتێبەکانی لە ڕادەبەدەر بە سەختی دەخوێنرێتەوە. ناوبانگی ئەو کە لەوانەیە لەلای ڕەخنەگران و پسپۆڕانی هونەر زۆر مەقبول و جدی و هەڵکەوتوو بێت. ئەو لە ڕیزی گەورەکانی ئەدەبیاتی ئێمە دادەنرێت. من لەگەڵ پیزوتۆ لە نزیکەوە ئاشنای نیم، بەڵام ڕێزێکی زۆرم بۆی هەیە، لە ڕاستیدا دەبێ مرۆڤێکی لە ڕادەبەدەر خۆشەویست بێت.

بەڵام خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پێویستی بە ماندووبوون و زانیاری فراوانە. بەبێ لێکچوون بەبێ هۆ نییە بۆ حاڵەتی کەسێك کە دەیەوێت بڕواتە لای قەشەیەك ئیعتیراف بکات، بۆ هەمان مەبەست بە نیازە بە جۆرێك پێشتر خۆی بۆ ئامادە بکات خۆی لە کارە خراپەکان دووربخاتەوە. هەموو خوێنەران ئامادەییەکی مەعنەوی لەو جۆرەیان نییە.

- پێش چەند ساڵێك ڕەخنەیەکت لەسەر کتێبی "لولیتا" ی "نابۆکۆف" نووسیبوو. ئەوەت بە چێژەوە، لە هەمان کاتدا بە زەوق و شەوقەوە خوێندبووە. ئەمڕۆ ڕاتان دەربارەی ئەو کتێبە چیە؟

+ پرسیارێکی قورسە "لولیتا" بەرهەمێکی بەچێژ و دلگیرە. بەڵام دیاریکردنی ئەوەی کە ئایا کتێبێکە زۆر بازاڕییە یا بەرهەمێکی ئەدەبی زۆر باشە، ئاسان نییە. بە ڕای من ڕەخنەگران نە ئەم

مەسەلەیەیان ئالۆز و دژوار هێناوەتە پێش و نە توانای چارەسەری ئەوەیان هەیە. بە کورتی دەڵێم بە ویژدانەوە ناتوانم بڵێم "نابۆکۆف" نووسەرێکی خراپە. هەتا هەندێك خۆیان والێکردووە بە خوێندنەوەی "ئادا" بەرهەمی تازەی ئەو کە بەڕای من زۆر باڵایە. ئەم بەرهەمە بە لیستی ناوی پاڵەوانەکانی داستانەکە دەست پێدەکات و ... لەوێدا توانا و لێهاتوویی تەواوی ئەدەبیش هەستی پێدەکرێ. بۆیە ناکرێ "نابۆکۆف" لەبەرچاو نەگیرێت بەلام ... ئەم "بەلام" ە هەمیشە لە دەقەکەدا دەمێنێتەوە.

جارێك دەبینین وەرزشکارێکی وەك "نینوبنونوتی" رۆژێك دەبیاتەوە، رۆژێکی تر دەیدۆڕێنێ تا لەئەنجامدا لەگەڵ مونافیسی بەرامبەری رووبەڕوودەبێتەوە و شکست دەهێنێت. رەخنەگری وەرزشی دەڵێت: "یاری پایەیەکی پتەوی نییە". دڵنیا نیم کە نابۆکۆف پایەی پتەوی هەبێت، لە هەمان حاڵدا، دەوڵەمەندیی هۆش و بیری رەت ناکەمەوە.

(دەڵێن لە ستایش کەرانی بنیات نەرانی هێڵی ئاسنی میلانۆیە، بەلام ئەڵبەتە ئەمە نیشانەی زیرەکی ئەو نییە، بەلام لەوانەیە هەر ئەو تاوانبار بکەن).

**- ئایا تا ئێستا ئەوە رێك کەوتووە کە لە داستانێکی عاشقانەدا شەیدای کەسێتییەك بیت تا ئەو رادەیەی کە کەسێتی ئەو لە ژیانی رۆژانەدا بەرجەستە بکەیت و قبووڵی بکەیت؟**

+ نەخێر، ئەبێ بڵێم تا ئەو رادەیە نا. بەلام رێك کەوتووە کە هاوتای کەسایەتیەکی ئەدەبی لە ژیانی کەسێکی زیندوودا ببینم، گەرچی زۆر بە کەمی. لە فلۆرەنسا خانمێکم لەیاد ماوە کە بۆ من هەیکەلی تەواوی "ئانا کارنینا" (*) بوو. ئەوم یەك دووجار زیاتر نەدییەوە. بەلام ئەم حاڵەتانە دەگمەنن. بۆ ئەوەی رووبەڕووی **کەسانێکی ئاوەها بیتەوە** پێویستە زیاتر لە هەشتا رۆمانی بالزاك بخوێنیتەوە.

**- یەکێ لە دۆستەکانم کە بەهرەمەندە لە سۆز و هۆشمەندی، حەز بە رۆمانی "سقیقۆ" (**) ناکات. دەڵێت "زینۆ" کەسێتییەکی لەرادەبەدەر لاوازە. هەڵەی ئەو لەچیدایە؟**

+ لەم دەربڕینەدا هەڵەیەکی زۆر هەیە. هەڵەی یەکەمی ئەم خوێنەرە ئەوەیە کە ژیانی واقیعی لە هونەر جیاناکاتەوە. ئاشکرایە کە لە کەسانی لاواز بێزارە، لەوانەیە بەهۆی تاقیکردنەوەی خودی خۆی بێت، بەلام تێناگەم بۆچی نابێت کەسێکی لاواز قارەمانی سەرەکی رۆمانێك بێت. بەڕای من کەسانی لاواز، توانای مانەوە و پایەی زیاتریان هەیە لە جیهانی هونەردا، لەبەرئەوەی بەهێزەکان زیاتر کەسێتیی کارتۆنی و ساختەیین، ئەو کتێبەی کە قارەمانی سەرەکی کەسێکی بەهێزە، بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمێکی سەرپێیی و کارتۆنییە، هەتا ساختەییەکی زیرەکانەیە. بۆ نموونە، کەسێتیی بەهێز لە هەموو رۆمانەکانی رووسیدا بوونی هەیە، گەرچی بەبێ جیاوازی ئەڵمانییە ...

**- بەلام شیعر، ئایا فێری هونەری شیعر خوێندنەوە بووین؟**

+ مەسەلەیەکی ئالۆزە، چونکە هەندێ لە کەم و کووڕییەکان دەتوانرێ لە هەمان حاڵدا بەنرخ بکرێت. بۆ نموونە "سەبا – SABA" شیعرەکانی زۆر خراپ دەخوێنێتەوە. یەکەمین جار کە چوومە دیداری دێتەوە یادم. وابزانم ساڵی 1925 بوو. ئەوکاتە من زۆر گەنج بووم. بە

خۆشی و زەوق و ڕێزەوە چوومە دیداری، ئەو هەروەکو جاران بە ڕێزێکی بێوێنەوە پێشوازیی کردمو تازەترین پارچە شیعری خۆیشی بۆ خوێندمەوە. ئێستا ئەو شیعرە بە دەنگی خودی ئەو بۆتان دەخوێنمەوە، بەڵام دیارە ناتوانم بە تەواوی دەنگی ئەو دەربهێنمەوە، بەتایبەتیش جووڵەی لەرزینی دەستی:

*سەگی سپی لەسەر چەوی سپی*
*بە بەردەوامی دوای سێبەرێك دەکەوێت،*
*سێبەری ڕەشی پەپوولەکە*
*پەپوولە زەرد باوەکە بەسەر ئەودا*
*باڵەفرێ دەکات*

ئێستا ئەم دێڕانە ناشیرینن یا جوانن، نازانم. بەڵام ئەگەر ئەم دێڕانە لە زمانی "گاسمان – GASSMAN" یا "ئەلبەرتازی – ALBERTAZZI" گوێم لێ بێ وامدەزانی ئەمانە نوسخەی کۆپی و ناشیرینی نوسخە ئەسڵیەکەن. ئەم وشانە لە زمانی ئەکتەرەوە هەموو سەرنج ڕاکێشی‌یەکی لەدەست دەدات. کەم و کووڕی‌یەکە لە ئەکتەرەوەیە؟ نەخێر، خەڵکی ئاسایی گوناهی نی‌یە. بەڵام بەداخەوە شاعیریش بێخەتایە.

**- کتێب خوێندنەوە دەتوانێت ژیانی واقیعی بخاتە مەترسی‌یەوە؟ بەواتایەکی تر لەوانەیە عەشق بەرامبەر بە کتێب، مرۆڤ لە ڕێڕەوی ژیانی ئاسایی دووربخاتەوە؟**

+ دەپرسیت ئایا دەتوانی لە یەك کاتدا هەم خوێنەر بی و هەم ژیانی ئاسایی بەسەربەریت؟ بەڵێ وای بۆدەچم. ناکۆکی لەنێوان هزر و ژیاندا نابینم، مەگەر لەهەندێ کاتی نائاسایی زێدەڕۆییدا. کەسانێك هەن بەتەواوی هزریان خستۆتەلاوە، هەندێکی تر بەپێچەوانەوە، ژیانیان بەیەکجاری فەرامۆش کردووە. خوێنەری ناو ڕیا (نازانم ئەم پێناسەیە لە کێوەیە)، خوێنەری سەرسەخت، خوێنەری برسی کە هەموو شتێك دەخوێنێتەوە چۆن دەتوانن لەگەڵ ژیانی واقیعی‌دا پەیوەندی بەرقەراربکەن؟

ئەوە ئیتر نەخۆشە. لەم بارەوە خەڵکانی مام ناوەندیش هەیە. بۆ نموونە وا دەزانیت "لیۆپاردی" پشتی کردە ژیان؟ بەتەواوی نا. ئەگەر ژیان بەپێوەری مانگ و ساڵ و هەفتە، گەشت، تاقی‌کردنەوە، ژن، عەشق، کارو کردەوە بەراورد بکەین ئەوکاتە دەتوانین بڵێین بەڵێ لیۆپاردی کەم ژیاوە. بەڵام ئایا بە ڕاستی کەم ژیاوە؟ ئەمە هەمیشە لەژێر نیشانەی پرسیاردا دەمێنێتەوە.

* لە بەرهەمێکی تۆلستۆی‌دا بە هەمان ناوە (ANNA KARENINA).

** SVEVO.

سەرچاوە:

"گۆڤاری بخارا ژمارە (5).

# چاوپیاخشاندنێک بەژمارەیەکی ڕۆژنامەیەکی سویدیدا

ئامادەکردنی

لە سویدییەوە: زۆراب




## ڕۆژنامەی (Expressen)

سوید، ڕۆژی هەینی، 22ی ئۆکتۆبەری 1999

ئەم ژمارەیە لە ڕۆژنامەکەو پاشکۆیەک پێک هاتووە. پاشکۆکە 16 لاپەڕەیەو تەرخان کراوە بۆ وەرزش. ڕۆژنامەکە خۆی (40) لاپەڕەیە، سەدان وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی تیایە.

لاپەڕەی یەکەم وێنەی یارییەکی تۆپی پێی تێدایە. کارەساتی قاچ شکانی یەکێك لە یاریزانە ڕەش پێستەکانی سویدی بەوێنە نیشانداوە.

ئامانج لەخوێندنەوەو چاوپێداخشاندنی ئەم ڕۆژنامەیە شارەزاکردنی خوێنەری کوردە بەژیان لەسوید. هەوڵدەدەین هەندێك لە وتارو ڕاپۆرتەکان بکەینە کوردی

لاپەڕەکان بەم شێوەیە پڕکراونەتەوە:

لاپەڕە (2): وتەی سەرنووسەر بەناونیشانی (Ledare).

لاپەڕە (3): نامەی هاوڵاتیان بڵاو دەکاتەوە.

لاپەڕە (4-5): کلتوورو ڕۆشنبیری.

ئەو ناونیشانانەی تێیدا دەخوێنرێتەوە:

1-پیاسەیەك لەگەڵ سپینوزا

2-دژی ڕاسیزمو نازیزم

3-دەنگی جنۆکە، خوێندنەوەی ڕۆمانێکی سویدی.

4-ڕەخنەو لێدوان.

لاپەڕە (6):

تەقاندنەوەی ئوتومبیلێك بەتەقەمەنیو کوێربوونی پۆلیسێك بەهۆیەوە.

یەکێك لەتاونباران هاوڕێکانی بەگرت دەدات.

لاپەڕە (7): جەنگی هەواڵەکان، بەراوردێکی بێژەری کەناڵە جیاجیاکانی سوید.

لەهندستان ژمارەیەك فیلی مەست بەرەلا دەبنو چوار دەكوژرێت. ساڵی پار لەبەر پەلاماری هێرشی فیلەكاندا نزیكەی (100) مرۆڤ گیانیان لەدەست داوە ئەو ناوچەیە (5000) پێنج هەزار فیلی كێوی تیایە.

لاپەڕە (8-9): (من كۆیلەی سێكسی بووم لە سوید).

لاپەڕە (10): سكاڵای (لارس ڤەیس) لەدەست بڕیارێكی باج.

لاپەڕە (11) ڕێكلام بۆ تەلەفۆنی مۆبایل.

تالاپەڕە (17): بابەتی جۆراوجۆر.

لاپەڕە (17): لەهێرشێكدا بۆ سەر نەخۆشخانەی منداڵبوون ژمارەیەك ژنو منداڵ دەكوژرێن. (هەواڵ لەبارەی چەچینیاوە).

لاپەڕە (20-21): وەرزش، كارەساتی قاچ شكانەكەی لاپەڕە (یەك).

لاپەڕە (22-27): وەرزش

لاپەڕە (27): بیۆرن بۆری، (ستیفان ئێدبێری)و (ماتس ویلاندەر) لەیارییەكی تێنسدا بەیەك دەگەن.

لاپەڕە (28): یاری لەسەر پارە واتا (یانصیبەكان).

لاپەڕە (29): ڕێكلام بۆ كاسێتو (CD)ی گۆرانیبێژان

لاپەڕە (30-33): خۆشگوزەرانی

لاپەڕە (34): بورجەكانو كاریكاتێر.

لاپەڕە (35): مەتەڵ

لاپەڕە (36): ڕێكلام بۆ سەندیكاكانی سوید. بانگەوازە دژی نازیزم.

(ئێمە بەتوندی دەڵێین نەخێر بۆ نازیزمو توندوتیژی).

لاپەڕە (37-39): TV هەواڵو بەرنامەكانی تەلەفزیۆن.

لاپەڕە (40) دوا لاپەڕە، دانیشتنی ڕۆژنامەنوسێك لەدادگایی كردنی نازیستێكدا.

كەشو هەوای سویدو پلەكانی گەرماو ڕێكلام.

* * *

بانگەوازی (دژی راسیزمو نازیزم) لە لاپەڕە (4)دا بەم جۆرەیە:

"كاتی ئەوە هاتووە نارەزایی نیشان بدەینو دەری بخەین كە هیچ جۆرە كارێكی



تیرۆریستانە بێدەنگمان ناکات. نە ئێستاو بۆ هەمیشەش".

ئەم نارەزایی دەربرینە لەلایەن سەندیکاکانی سویدەوەیە، دەبێتە گەورەترین نارەزایی دەربرین دژی فاشیزم لەمێژووی سویددا.

ئەمە دوای ئەوەی هێزە نازیو رازیستیەکان بەهێز دەبن، دەچنە رێکخراوە جۆراوجۆرەکانی وڵاتەکەوەو خەڵك رادەکێشن.

(بیۆرن سوێدەربێری) لەیەکێك لە سەندیکاکاندا ئاشکرای دەکات کەسێکی نازی خۆی هەڵبژاردووە. کەسەکە دەردەکرێت، بەڵام نازی‌یەکان (بیۆرن) دەکوژن.

لەم ساڵانەی دواییدا لەوڵاتی سوید کارەساتی پەیوەندیدار بە (نازیزمو راسیزمەوە) زۆر روویداوە.

*راپۆرتی یەکەم*

لاپەرە (8-9):

"من کۆیلەی سێکسی بووم لە سوید"

(Expressen) هێلینای (22) ساڵە دەبینێت، دوای هەڵهاتنەکەی.

نووسینو ئامادەکردنی (نیکلاس سڤێنسۆن- Niklas Svensson).

پراگ: شەوان ئەو کچە گەنجانە لەسەنتەری شاری ستۆکهۆڵم لاشەی خۆیان دەفرۆشتو رۆژانیش لەلایەن گەوادەکانیانەوە لێیان دەدرا تا گیانیان دەبوو بەخوێنو دەست درێژی سێکسیان دەکرایە سەر.

(Expressen)، هێلینا کە خەڵکی وڵاتی چیکە دەبینێت.

هێلینا بۆ ماوەی چەند مانگێك کۆیلەی سێکسی گروپێك لە گەوادەکان بوو.

–توانیم هەڵبێم وەختێك ویستیان بم فرۆشن بەگرووپێکی تر.

ئەو پێی وابوو ژیان لە (چیك) دێوەزمە بوو. ئەوکاتە ئەو سویدی نەدیبوو.

کۆتایی ساڵی پار هات بۆ سوید، پیاوێکی باش کە ئەو لەوڵاتی خۆی تووشی بوو و پەیمانی دابوویەئیش، پارەو "خۆشەویستی" بداتی رایکێشابوو بۆ سوید.

*هەرگیز پارەکانی نەبینی*

ئیشەکە لەش فرۆشتن بوو. ئەو هەرگیز پارەی نەبینی. خۆشەویستییەکەش بریتی بوو لە لێدانو دەست درێژی بۆ کردن.

ئەو پۆلیسانەی لەچالاکی‌یەکەیان کۆڵیوەتەوە باسی لە بازرگانی‌یەتی کۆیلەی سپی دەکەن.

هێلینا هێشتا لەو گەوادانە دەترسێت کە خاوەنی کاری بوون بۆ ماوەی چەند مانگێكو لەبەر ئەوە ناوێرێت بەناوی راستەقینەی خۆی بێتە روو.

–ئەوان پەیوەیەندی‌یان لەگەڵ هەموو شوێنێکدا هەیە، دەزانم گەر بیانەوێت دەتوانن بمدۆزنەوە.

ئەمرۆ هێلینا لەگەڵ کورە دۆستە نوێکەیدا لەوڵاتێکی ئەورووپی دیکە دەژیو لەبەرنامەیدایە شووی پێ بکات.

ئێمە، کاتێك ئەو سەردانی دایکیو خوشکو. براکانی لەشارێکی کرێکاریی (چیك) دەکات دەیبینین.

گەوادەکان لێرە ژمارەیەك لە قوربانیەکانی خۆیانیان دیوەتەوە. **هەموو کچەکان گەنجو جوان بوون. هەروەها** هەژارو بێکار بوون.

هێلینا دەڵێت تێگەیشت کە کاتێك بە ئیشەکەی سکاندیناڤیا رازی بوو، ئیشەکە لەش فرۆشتن (Prostitution) بوو.

–ئەو دەڵێت: من پارەم هیچ نەبوو، ماڵ، ئیشو دوارۆژم لێرە نەبوو لە (چیك).

بۆیە بریارمدا بچم بۆ سوید.

کاتێك باسی ئەو خەونە دەکات کە لەلایەن هەزاران کچی



ترەوە کە هەلو مەرجی ئەویان
**هەیەو بۆ ساڵانێکی زۆر هەڵیان**
گرتووە کەمێك پێدەکەنێت.

وام دەزانی ئەوەندە پارە پەیدا دەکەم بتوانم لێرە بگوێزمەوەو، خانوو بکڕمو خێزان پێك بهێنم.

لەبری ئەوە لە ئەپارتمانێکی یەك ژووریدا لەگەڕەکێکی باشووری ستۆکهۆڵم، دۆشەکێك، پەتۆیەكو سەرینێکی پێ درا.
**لەگەڵ دوو کچی چیکی تردا لەوێ ژیا.**

### دەبرا بۆ سیتی (City)

هەموو شەوێك کچەکان لەلایەن گەوادەکەوە بەماشین دەبران بۆ سیتی. بەیانی زوو، کاتێك کاتی کارکردن تەواو دەبوو، پارەکەیان لەلایەن ئەوەوە لێ دەسێنرا.

—ئەو هەمووی دەبرد. ئێمە پارەی خواردنیشمان نەدەدرایە. ئەو ئەوجۆرە شتانەی دەکرد.

**ئەو لێکۆڵەرەوانەی (دە) کەسێك لەو کچانەیان خستۆتە بەر لێپرسینەوە ئەم دیاردەیە پشت راست دەکەنەوە.**

هێلینا یەکێك لەو پیاوانەی کە ئێستا گیراون، بە دێوو درنج دادەنێت، ئەوەیان کە تەمەنی 46 ساڵە.

—دەڵێت ئەو مرۆڤ نییە، جانەوەرە. ئەو پیاوە دڵی نییە. جارێکیان ئەوەندەی لەکچێکدا هەموو گیانی بوو بەخوێن.

کاتێك هێلینا بۆی **دەردەکەوێت (46) ساڵەکە ئێستا گیراوەو گومانی گەوادیی**

بەهێزو دەستدرێژیکردنی لێ دەکرێت، دەڵێت:

—هیوادارم ئەو هەرگیز بەرنەدرێت.

هاوینی رابردوو هێلینا لەلایەن پۆلیسی نەرویجیەوە خرایە بەر لێپرسینەوە، لەو کاتەدا کە یەکێك لە گەوادەکان لە ئوسلو (Oslo) گیرا. وتەی هێلینابوو وای کرد ئەو پیاوە، لەوێ، بەهۆی گەوادیەوە حوکم بدرێت.

بەڵام ناوێرێت دووبارە گەواهی بداتەوە..

—دەڵێت: من ئێستا ژیانێکی تر دەژیم. وە حەزدەکەم بەردەوام بم لەژیان.

* * *

لەم وتارەدا نەخشەیەکی بەشەکانی سوید بڵاوکراوەتەوەو ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لەشی خۆیان دەفرۆشن بەنزیکی دیاریکراوە.

چوارکەسی کە گومانی ئەو کارەیان لێدەکرێت، واتە پیاوەکان، هەمان کات بەداوای داواکاری گشتی لە زینداندا دەهێڵرێنەوە.

*راپۆرتی دووەم*

لاپەرە (36).. رێکلام، بانگەواز بۆ خۆسازان دژی نازیزم..؟

*سوید، وەزعت چۆنە؟*

پێمان وابوو نازیزم بەشێك بوو کۆتایی پێ هاتبوو. بەڵام ئەمڕۆ لەسوید بەشێکی نوێ دەنووسرێت. بەشێکی ترسێنەر.

توندوتیژیو تیرۆری نازیستەکان هەڕەشە لە دیموکراتی دەکات. بیانیەکان (Invandrare) راودەنرێنو لێیان دەدرێت. لەباشووری ستۆکهۆڵم، لەبەردەمیماڵەکەی خۆیدا، ئەندامێکی سەندیکایی دەکوژرێت— سیان لە نازیستە نوێکان گیراون. نازیستە نوێکان گومانیان لێ دەکرێت ئەنجامدەری ماشینە بۆمب چێنراوەکەی ناکا (Nacka) بن، دژی ئەو رۆژنامەچیەی خەریك بوو بە پەردە لەرووڵادانی رێکخراوە نازیستیەکانەوە. چەند نازیەکی نوێش گیراون، بەهۆی کوشتنی پۆلیسەوە لە مالێکساندەر.

ئەوەچیە خەریکە لەوڵاتەکەماندا روو دەدات؟ ئایا دەبێت بەبێ دەنگی رازی بین، نازیستەکان هەوڵ بدەن بە هەڕەشەو توندوتیژی بمانترسێنن بۆ ئەوەی بێدەنگ بین؟

ئێمە لە سەندیکای (TCO) دەڵێین نەخێر. نەخێرو دووبارە نەخێر! تا ئێستا ئەو کۆششانەمان بەهەند نەگرتووە. کورتو باریك، ئێمە تەمەڵ بووین. بەڵام ئێستا ئەوە رەت دەکەینەوەو کردارمان دەبێت.

بزووتنەوەی سەندیکایی پێویستە هەوڵ بدات زانیاری لەبارەی تاوانی نازیزم بڵاوبکاتەوەو پارێزگاری لە بەهای مرۆڤایەتی بکات.

یەکێتی ئەندامانی (TCO) گوڕ دەدات بە گفتوگۆ لە پێناوی دیموکراتیو لەدژی نازیزم لەشوێنی کارەکاندا.

ئیتر سەندیکا لەزگەی سەردەمی لادەبات. بەهاوئاهەنگی لەگەڵ ئەندامەکانمانو هێزەکانی تری کۆمەڵگا دەمانەوێت نیشانی بدەین هەڵوێستمان چیە.

ئێمە بەتوندی دەڵێین نەخێر لەدژی نازیزمو توندوتیژی!

هەڵبژاردنی ئەم بابەتانە دەرخستنی ئەو گرفتانەیە کۆمەڵگای سویدی بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.

هەموو ئەوانەی لەو وڵاتە دەژین لەبەردەم گۆڕانکاریی ترسناك دان.


ئەراگۆن

# ئەراگۆن لەگفتوگۆیەکدا

## مرۆ دەبێ شێت بێ تا سەبارەت شیعر بنووسێت

سازدانی:
جان جاك بروشێ
و: رۆژە

**ئەراگۆن دەڵێت؛ مرۆ دەبێ شێت بێ تا سەبارەت بەشیعر بنووسێت.**
**بێرناردۆڤیلیش دەڵێت؛ دەبێ شێتتر بێ گەر بیەوێ سەبارەت ئەراگۆن بنووسێت.**

وا یازدە سەدە بەسەر ئەدەبی فەرەنسیدا تێپەڕیوە، ئەراگۆن تەنیا خۆی سەدەیەکیانی داگیر کردووە. ئەراگۆن شوێن پەنجەی خۆی لەسەر هەموو ئەدەبی فەرەنسایی جێهێشتووە، هەر لەیەکەم قەسیدەیەوە کە شاعیری گەورەی فەرەنسایی "پیر ریڤیر دی" لەساڵی 1918دا لە گۆڤاری (نور-سود)دا بۆی بڵاوکردەوە.

ئەراگۆن بە تەنیا شایەتی سەدەی خۆی نەبووەو بەس، بەڵکو لەزۆربەی رووداوە ئەدەبیو سیاسیەکانی فەرەنسادا، هەر لەیەکەمین جەنگی جیهانیەوە تا کۆتایی تەمەنی 82 ساڵەیی خۆی بەشدار بووە. لەدادایزمەوە (1919) تا سوریالیزم (1924) تا بوونی بەئەندام لە حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنساداو تا بەرەنگاری نازیەکان

(1939–1944) و دواتریش ئەو مەسەلەیەی کە بەناوی خۆیەوە ناسراوە. ئەمانە مێژووی قۆناغێکی ئەدەبیو سیاسی لەخۆ دەگرن کە سەدەیەکی خایاندووە.

ئەم گفتوگۆیەی دادێ؛ رۆژنامەوانی فەرەنسایی جان جاك بروشێ لەگەڵیدا سازی داوەو گۆڤاری "مەگەزین لیتیریر" لەژمارەیەکی تایبەت بەئەراگۆن، کە ناوی لێنرابوو "چاخی ئەراگۆن" بڵاوی کردۆتەوە. گرنگی ئەم گفتوگۆیە لەوەدایە کە رۆشنایی ئەخاتە سەر قۆناغێکی زۆر گرنگی مێژووی ئەدەبی فەرەنسایی، هەر لە دامەزراندنی دادایزمو سەریالیزمەوە تا گەڕانەوە بۆ ئەو قۆناغەی کە ئەراگۆن خۆی ناوی ناوە "ریالیزمی پەسەندکراو".

**بەرلەوەی بزانم خوێندنەوە چیە دەستم بە نووسین کرد**

*کاتێ لەساڵی 1914دا جەنگ راگەیەنرا؛ تۆ هەم سەرگەرمی نووسینو هەم خەریکی خوێندنی پزیشکی بوویت، هیچ پەیوەندیەك لەنێوان ئەو دوانەدا هەیە؟

–بێگومان هیچ پەیوەندیەك لەنێوانیاندا نیە. بۆ رازیکردنی دایکم پزیشکم دەخوێند، تا دڵی ئەو رایی بکەم، رۆژانی جەنگ لەو کەسانە بووم کە بۆ بەرەکانی شەڕ دەنێرران، ئەگەری ئەوەش هەبوو کە بەسەلامەتی نەگەڕێینەوە. بەڵام نووسین هەموو ژیانمی داگیر کردووە، من بەرلەوەی فێری خوێندنەوەو نووسین ببم شیعرم دەنووسی. من شیعرەکانم دەگوتەوەو پوورەکانم دەیان نووسیەوە. هێشتا نەمدەزانی ئایا بەڕاستی نووسەرم یان نەء، تەنانەت ئەوکاتەش کە بۆ یەکەم جار لەساڵی 1917دا دەستم بە بڵاوکردنەوە کرد نەمدەزانی بەرەو کوێم دەبات. من نووسینم بە "پیشە" نەدەزانی، ئەم وشەیە مایەی پێکەنینم بوو، هەروەها بەنیسبەت ئەوانی دیکەشەوە کە سەر بەنەوەیەك بووین.

*ئەم باسە بەرەو لێدوان لەسەر جەنگمان دەبات، جەنگ رۆڵێکی گرنگی لەژیانتدا بینیوە؟

–بەر لە وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە کەمێك دوودڵی دامدەگرێو لەخۆم ئەپرسم مەبەستت کام جەنگەیە، ئێمە زۆر جەنگمان دیوە. ساڵی 1914 جەنگێ هەڵگیرسابوو، کەس نەیدەتوانی خۆی لێ بدزێتەوە. کاتێ بەچاوی خۆیشم بینیم، ئیدی تێگەیشتم کە جەنگ خودی ترسو تۆقین خۆیەتی. من هێندەی ئەوەی ئەو شتانەی تووشی هێدمە (صدمە) یان کردم کە خەڵکو بەتایبەتیش کەفوکوڵی رۆشنبیران لەبارەیانەوە دەیانگوت، هێندە خودی جەنگ تووشی هێدمەی نەکردبووم. ئەوەبوو کەفوکوڵ بۆ جەنگ بووە مایەی ریسوایی بۆ گەلێ لەنووسەرە فەرەنساییەکان لەنێوان ساڵانی 1914و 1918دا.

ئەوکاتە من سەر بە نەوەی دواتر بووم، خۆمو نەوەکەم وەك هەر نەوەیەکی نوێ رقێکی زۆرمان لەوانەی پێش خۆمان دەبووەوە. ئەوەش کە منو ئەندرێ پرۆتۆنیشی پێکەوە کۆکردەوە کۆمەڵێك راوبۆچوونی هاوبەش بوو سەبارەت بە ئەوانەی پێش خۆمانو سەبارەت بەشیعرو هونەر، ئەمەش کاتێ لەساڵی 1917دا لە نەخۆشخانەی ڤال دوکراس یەکترمان بینی، ئەوکاتە پرۆتۆنیش وەك من پزیشکی دەخوێندو هەردووکمان وەك یاریدەدەری پزیشك لەسوپادا کارمان دەکرد.

## شوورەیی جەنگ

*ئەو نووسەرانە کێ بوون بوونە مایەی شوورەیی بۆخودی خۆیان، ئایا گیوم ئەپۆلینێر بەیەکێک لەوان دادەنێیت لەبەر ئەوەی کە دەڵێت "خودایا، جەنگ چەندێ جوانە؟!"

—ئەتوانین "خودایە جەنگ چەندێ جوانە؟!" بەچەند جۆرێك بخوێنینەوە، یەکێك لەوانە گاڵتەجارانەیە، پاشان ئەپۆلینێر بەشێوەی جۆراوجۆر دەدوا، هەندێ لەهاوچەرخانی من لایەنی ئەکادیمی ئەپۆلینێر یان لاببووە هێدمە. لەراستیدا پارادۆکس (موفارەق)ە کەش لەم لایەنەدا لەوەدا بوو کە دەیگوت نەك ئەوەی کە دەینووسی، بۆ هەر یەکێکیش لەئێمە ئەپۆلینێر سیمبولێکی **شیعری گرنگە، نەك ئەوەی** نووسیویەتی بووەتە مایەی شوورەیی بۆی.

*پاش ئاگربەست بەماوەیەك کەسێتی تریستان ترازاو رێبازی دادایزم پەیدا بوون، ئێوەش، واتە ئەندرێ پرۆتۆنو فیلیپ سۆبۆو تۆ، بەرلەوە یەکەمین گۆڤاری دادایزمتان بەناوی "لیتراتۆر"ەوە دەرکردبوو.

—ترازا لەکۆتایی ساڵی 1919دا گەیشتە پاریس، واتە پاش ساڵێك لەئاگربەست، ئێمە لەو دەمەدا گۆڤارەکەمان دەرکرد، هێندەی نەبرد هاورێیەکی تریشمان بۆ زیاد بوو کە ئەویش پۆل ئێلوار بوو، دواتر لەمانگی ئاداردا یەکەمین ژمارەی گۆڤارەکە دەرچوو ئەوجا بریارماندا ترازا بۆ پاریس بانگهێشت بکەین تا لەدەرکردنی گۆڤارەکەدا دەستی هەبێت، ئەویش لەپێناوی بەردەوامبوونی بزووتنەوەی دادایزمو کە خۆی (ترازا) لە زیوریخ دایمەزراندبوو. هەر لەکۆتایی هەمان ساڵدا (1919) یەکەمین چالاکی بزووتنەوەکەمان ئەنجامدا؛

تریستان ترازا فەرەنسی دەزانی بەلام نەیدەویست لەبەردەم جەماوەردا بدوێ، بیرۆکەیەکی زۆر سادەو دادایزمانەی بەهات ووتارێکی (لیۆن دودێ)ی لەرۆژنامەیەکی رۆژانە دەرهێناو لەبەردەم جەماوەردا خوێندیەوە، ئێمەش (منو پۆل ئێلوار) بەزەنگی بچوك زەنگمان لێدەداو جەماوەریش گوێیان لەوە نەدەبوو کە دەیگوتو هیچیش تێنەدەگەیشتن. ئاوها دادایزم لەپاریس دەستی پێ کرد.

## دادایزمو ریسوایی

*دادایزم بەوکردانە ناسراوە کە ریسوایی ئامێزەو ریسوایی دەنێتەوە، یاخود چاوەرێی ئەوەی لێدەکرێ کە ریسوایی بنێتەوە، ئیدی پرۆتۆنو سۆبۆو تۆ کشانەوە، پاشان ئەوانی دیکەش.

—سەرەتا با بەکارهێنانی وشەی "ریسوایی"ت بۆ راست بکەمەوە، بەڵێ دادایزم ریسوایی دەنایەوە، ئەمە شتێکی هێند گران نیە، چونکە هەریەکێك لەئێمە لەخودی ریسواییدا دەژیاین ئەوەی بیرمان لێ دەکردەوەو ئەوەشی دەمانکرد خودی ریسوایی خۆی بوو کاتێکیش دەبینین دادایزمەکانی ئەمرۆ، هەر لە ئەکادیمیەکانەوە تا رۆژنامەوانەکان، زۆر بە جدی پەنا بۆ گرنگی پێدانی خەڵکی دەبەن، پێکەنینی خنۆم پێ راناگیرێ، چونکە ئەوەی ئەمرۆ لەسەر دادایزم دەوترێ ئەوپەرِی گێلێتیە. خۆ ئەگەر ئەم دادایستانەی ئەمرۆمان خستە ناو ئەو ماوە زەمەنیەی ئەوکاتەوەو رووبەرووی وێنەی ئەمرۆیان، ئەوجا ئەوان توورەیی خۆیان پێ رانەدەگیرا، ئێستەش توورەییەکیان نەماوە بەڵکو توورەیی خۆی لەخۆیدا بووەتە شێوەیەك لەشێوەکانی

دادایزم، بەڵام بەهەڵگەڕاوەیی ئەمە هەموو مەسەلەکەیە.

بەڵام دادایستی راستی کەسانی جۆراوجۆرن، بۆ (تزارا) دادایزم شێوەیەك بوو لە شێوەکانی هیگڵیزم، لەکاتێکدا ئێمە بەرەو بەهایەك تێدەکۆشاین کە لە ناوەڕۆکدا دژی دادایزم خۆیشی بوو. بەم شێوەیە سەرەتاکانی لێك دابڕبوون هاتەکایەوە.

تزارا دەیویست هەموو شتێك رەت بکاتەوە. وەنەبێت ئێمەش دژی خودی رەتکردنەوە بووبین، بەڵام بەمەبەستی شاراوە. نەشدەکرا بۆدلێر یا رامبۆ یا ئەوانی دیکە رەت بکەینەوە. بەم شێوەیە تێگەیشتنی ئەوانەی مەیلیان بەلای سوریالیزمدا هەبوو، لەسەر بەرگریکردن لە بۆماوەیی شیعریی مرۆیی، کە شتێکە دەستی لێ هەڵناگیرێ، زەق بووەوە.

*کەواتە "هیچ شتێك هیچ شتێك هیچ شتێك" لەقۆناغی یەکەم زیاتر هیچی دیکە نەبوو..

—ئەم دەستەواژەیە، بەسەر هەموو شتێکی دەوروبەرماندا دەگونجا. بەسەر ئەم دونیایەشدا کە بەهۆی جەنگەوە خۆی لە قوڕو چڵپاو و خوێندا گەوزاندووە. بەڵام مەسەلەکە لەم دەستەواژەیەش گشتگیر تر بوو. سوریالیزم لەڕێی بلیمەتی شیعریەوە بە خولیای دۆزینەوەی شتە نەستی دەروونیەکان مەحکووم بوو، چونکە لەمەدا ناتوانێت واز لەو بلیمەتیە بهێنێ، ئەمەیە ئەو ناکۆکیە بنەڕەتیەی بەردەوامبوونی دەبێتە مایەی ونبوونی.

*ئەوجا لەکاتی بەستنی کۆنگرەی پاریسدا جیا بوونەوە روویدا.

—لەراستیدا جیابوونەوە پێش کۆنگرەکەش دەرکەوتبوو، هەر لەو کاتەوەی سەردانی (سان جۆلبن لۆبۆڤور)مان کردبوو، چیتر پەیوەندیە توندو تۆڵەکە لەنێوان ئێمەو دادایزمدا نەمابوو. دوای ئەوە پرۆتۆن زەمینەی بۆ کۆنگرەی پاریس خۆش کردبوو، کە دەیویست بە هۆیەوە ئەو رێسایانە ئامادە بکات کە دابڕاوەکانی بزووتنەوەکە، یاخود هەموو ئەوانەی کە پێشتر هێرشمان کردبوونە سەر، لەخۆبگرێ. ئەمەوێ ئەوەش بڵێم کە من بەو پرۆژەیە رازی نەبووم، ئەویش لەبەر ئەوەی کە پێم وابوو گەر سوریالیزم ببێتە تێکەڵەیەك لەخەڵك، ئەوە رێڕەوی یەکەمینی خۆی کە تا ئەوکاتە پاراستبووی، ون دەکات. کەچی بەهۆی هاوڕێیەتیمەوە بۆ پرۆتۆن رازی بووم. وەك دەشزانن پرۆژەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

## دەربارەی سوریالیزم

*کەواتە سوریالیزم پێکهاتبوو لەگروپ یا (تیمێك) کە تۆو پرۆتۆنو سۆبۆ رەگەزە سەرەکیەکانی بوون. رەخنەگرانیش کردیانە بزووتنەوە، وانەبوو؟

—تەواو وانیە. ئێمە خودی ناوەکەمان لەدەرەوە، لەجیرارد دو نرڤالو (ئەوکەسەی دەربارەی سەروو سروشتی "سووپەر ناچراڵ" دەدوا)، بۆهات بەتایبەت لەلایەن ئەپۆلێنێرەوە بوو کە وشەی سوریالیزمی لەکتێبی (مەمکەکانی تریزیاس)ی خۆیدا بەکارهێنابوو، هەرچەندە وشەی سوریالیزم تەواو هەموو ئەوانەی نەدەگرتەوە کە ئێمە دەمانکردن، ئیدی وشەکە کەوتە سەرزارو رۆژنامەکانیش بەهۆیەوە ئیشارەتیان بەئێمە دەدا، وای لێهات پێی رازی بینو هەوڵ بۆ ئەوە بدەین دەلالەتێکی بدەینێ.

بەڵام بوونی سوریالیزم لەنووسیندا پێش پێکەوەنانی

گرووپەکەمان کەوتبوو. ئەتوانین لەدایکبوونی یەکەم نووسین بگێڕینەوە بۆ مانگەکانی ئایارو حوزەیرانی ساڵی 1919، کە هێشتا من لەسوپادا بووم، کاتێك لەئەڵمانیاوە بەمۆڵەتێك گەڕامەوە، پرۆتۆنو سۆبۆ بەشەکانی یەکەمی کتێبی (کێڵگە موگناتیسیەکان) یان نیشان‌دام، دەقێك بوو پێکەوە نووسیبوویانو بەیەکەمین پراکتیزەکردنی بیرەکانی پرۆتۆن لە نووسین‌دا دادەنرێ؛ خێرا نووسین لەپێناوی رەتکردنەوەی سانسۆری ناوەکی. لەسەرەتادا سوریالیزم بەم جۆرە بوو. پاشان ئەم شێوە نووسینەمان ناونا (نووسینی ئۆتۆماتیکی) کە پێش ئێمە دادایزم لەگۆڕێ بوو، هێدی هێدی وایلێهات سوریالیزم بەنووسینی ئۆتۆماتیکی دیاری نەکرێ، بەڵکو بەو کەشو هەوا فیکریەی کە بۆمان دارشتبوو، هەروەها بەو تێگەیشتنانەمان کە لەسەر شیعرو رەوشتو تەنانەت سۆسیۆلۆژیاش هەمان بوو.

*ئەگەر کێڵگە موگناتیسیەکان لاوە بخەین ئەوا تۆ یەکەمین کەسی کە تێکستی سوریالیزمت نووسیبێت ئەویش لە (شەپۆلی خەونەکان)دا.

—نەخێر ئەوە یەکەمین تێکست نەبوو، بەڵکو یەکەمین تێکست بەیانێکی سوریالیزم بوو کە لە گۆڤاری (کۆمێرس)دا بڵاو بووەوە، لەو بەیانەدا هەوڵمداوە هەندێ وشە پێناسە بکەم، بۆ نموونە لەپێناوی بەکارهێنانی وشەی سوریالیزم، بەواتا گشتیەکەی، هەوڵم دەدا ئەو دەلالەتانە دیاری بکەم کەمەدلوولە دیاریکراوەکان دەگەیەنێت وەك "سەروو واقیع" و "سەروو واقعیەت"، بەڵام من یەکەمین کەسم ئەم دوو وشەیەم بەکارهێنابێت دەتوانرێ بوترێ کە هەموو ئەوانەی لەنێوان ساڵەکانی 1919و 1923دا نووسیومانە ئەچێتە چوارچێوەی سوریالیزمەوە، سوریالیزم بەو مانایەی کە پرۆتۆن لە بەیانی (سوریالیستی لەشتێکدا) دیاری کردبوو، ئەو بەیانەی کەماوەیەك دوای دەرچوونی کتێبەکەم (شەپۆلی خەونەکان) بڵاوی کردبووەوە.

هەروەها دەتوانرێ وشەی سوریالیزم بۆ ناسینەوەی ئەو کۆمەڵەیە بەکاربهێنرێ کە پێکهاتبوون لە پرۆتۆن، سۆبۆ، ئیلوارو ئەراگۆن، پاشانیش ئەوانەی کە پێمان دەوتن نەوەی دواتر، کەسێ تا چوار ساڵێك لەئێمە کەم تەمەنتر بوونو دوای دەرچوونی گۆڤاری "شۆڕشی سوریالیزم" هاتبوونە پاڵمان وەك (ڤیتراك، لامبۆر، بارۆنو دیسنۆس) کەبەهەموویان کۆمەڵەی "ئەڤنتۆر"یان پێکهێنابوو. ئەوجا کۆمەڵەی "ئۆف دۆر"یش کە پێکهاتبوون لە (ماتیاس، لوبیك، ناڤیك، فرانسی جیرارد)و ئەوجا (ئارتۆ) کە پەیوەندی بەهیچ کۆمەڵەیەکەوە نەبوو، هاتنە پاڵمان. هەروەها کۆمەڵەی "رۆبلۆمێ" کە پێکهاتبوو لەهەردوو شێوەکار (ماسۆنو میرۆ)و هاوڕێیانیان (رۆلان توال، میشێل لیریسو جۆرج باتای)، و هەر لەو ماوەیەدا بۆنۆیەڵ ی سینماییش کە بە هاوڕێیەتی سلڤادۆر دالی هاتبووە پاریس پەیوەندیان پێوەکردین پاش هەموو ئەمانە کۆمەڵەی "رۆشاتۆ"؛ جاك بریڤێر، تانگیو مارسیل رۆشان.

بەم شێوەیە هەروەك دەبینی سوریالیزم کەسانی جۆراوجۆرو جودا لەیەکدی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە، تا ئەو رادەیەی کە بوترێ سوریالیزم بەکاری هەموو ئاستەکان دێت، و بەڵکو هەندێکیش خاڵی بەیەك

گەیشتنیان لەسوریالیزمدا دەبینیەوە.

*سوریالیزم نێوەندێ بوو هەموو ئاراستەکانی لەخۆدەگرت...

—بابڵێین هەموو یەکێك لەئێمە لەدەوری چەمکێکی دیاریکراوی هەرکارێکدا کۆدەبینەوە، ئەدەبی بێت یا هونەری، یان هەرکارێکی تری سوریالی.

*ئیدی رێڕەوی سوریالیزمیانەی خۆت، بەرەو ئەوەی بردیت رەچاوی ئەوە بکەیت کامە سیاسیەو کامە کۆمەڵایەتی، وانیە؟

—ئێمە هەموومان جەنگمان بەتاوان دەزانی، پێشمان دەوترا؛ چیتر جەنگ هەڵناگیرسێتەوە کەچی فەرەنسا شەڕی دژ بە مەغریب بەرپاکرد، کە یەکەم جەنگی ئیمپریالیزمیانەی فەرەنسا بوو، ئەم جەنگە تاساندینی، کە دژیشی وەستاینەوە کەوتینە پاڵ کۆمۆنیستەکانو باربۆس، کەکۆمەڵەیەکی (کلارتی) نزیك بە کۆمۆنیستەکان بوو، لەو ماوەیەدا زۆر بە پەرۆشەوە کتێبە سیاسیەکانمان دەخوێندەوە. پاش دوو ساڵ بووم بەئەندامی حیزبی کۆمۆنیست، کە یەکەمین سوریالیزم بووم بچمە پاڵیان، دوای منیش پرۆتۆنو ئێلوار وەك منیان کردو پاشتریش هی تری وەك جۆرج سادۆڵ کە وەك من تا کۆتایی مایەوە، بەڵام پرۆتۆنو ئیلوار پاش سێ هەفتە لەبوون بەئەندامییان، کشانەوە. ئەمەش شتێکە تێگەیشتنی ئاسانە چونکە ژیان لەناو حیزبدا بۆ کەسێکی وەك پرۆتۆن ئاسان نیە.

*مانای وایە ئەندامێتی پرۆتۆن کەمی خایاند.

—تەواو وایە، وەك دەشزانن ئەو نەگەڕایەوە بۆ ناو حیزب، بەڵام ئێلوار لەساڵی 1943 دا گەڕایەوە، واتە لەو کاتەدا گەڕایەوە کە بوون بەئەندام لەحیزبی کۆمۆنیستدا مەترسیدار بوو، ئەمەشی بۆ تۆمار دەکرێ.

*ئەی پرۆتۆن؟

—پرۆتۆن لەناو حیزبدا لەبەردەمی کەسانێکدا کە نرخیان نەدەزانیو هیچ بیرۆکەیەکیان لەسەر ئەو رۆڵانەی نەبوو کە بەراستی دەیگێڕا خۆی دەبینیەوە، ئەو کەسێکی وا نەبوو هێندەی ئارام هەبێت تا بەرگەی شتی وابگرێ، بۆیە بەرگەشی نەگرت. رای من ئەوەیە؛ هەڵە هەڵەی خۆی نەبوو.

## شۆڕشو خەون

*دوای بەئەندام بوونت لەریزەکانی حیزبدا رووداوێکی گرنگ بەنیسبەت خۆتو بەنیسبەت مێژووی سوریالیزمەوە روویدا، مەبەستم کۆنگرەی خراکۆفی ساڵی 1930یە.

—مەسەلەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە باس دەکرێت، چونکە لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە لە فەرەنسادا قێزمان لێدەکردەوە، خەونێك هەبوو کە خەونی سۆڤیەتیو شۆڕشی ئۆکتۆبەری سەرکەوتوو بوو، ئەم خەونو شۆڕشەش لای من لەکارێکی (ئەیزنشتاین)دا بەرجەستە بوو کە بریتی بوو لە فیلمی (زرێپۆشی پۆتمکین).

بیرۆکەی رۆیشتن بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت بووە شتێکی ئاسایی، هەروەها بەختیش لەدروستبوونی شتەکاندا هەندێ جار کاری خۆی دەکات؛ من لەساڵی 1928ەوە ئێلزام ناسیوەو چیتر لەیەکتری جیانەبووینەتەوە، ساڵی 1930 پێکەوە چووینە یەکیەتی سۆڤیەت، بۆ کۆنگرە نا، بەڵکو بۆ سەردانی خوشکی ئێلزا کە هاوسەری مایکۆفسکی بوو، چونکە پێش سێ مانگ مایکۆفسکی خۆی کوشتبوو،

لەوێ جۆرج سادۆڵ هاتە لامانو لەبەر ئەوەی لەوێ بووین، داوای لێکردین بەشداری کۆنگرەی جیهانیی نووسەرە شۆڕشگێڕەکان بکەین کە لە خارکۆف دەبەسترا. هەڵوێستو کێشەو ڕووبەڕوو بوونەوەکان بەجۆرێك ئاڵۆز بوون کە لێرەدا ناتوانم کورتیان بکەمەوە، ئەوەی کە بەپلەی یەکەم بەلامەوە گرنگ بوو ئەوە بوو کە ئەم وڵاتە فەقیرو خەمبارو پاڵەوانەم دەدیو هەموو جیهانیش دژێتی، ئەم لیریکیەتە شۆڕشگێڕانەیەم لەخودی کۆنگرەکە پێ خۆشتر بوو، وتوێژی زۆرو دوورو درێژ لەسەر کۆنگرە بەڕێ کراو هەروەها وتەی نالایەقیش دەوترا.

بەڵام ئێمە (جۆرج سادۆڵو من) هێندە بەکۆنگرەدا تێپەڕین کە بارودۆخ ڕێی پێبدات چونکە کۆنگرەکە نوقمی جۆرە کێشەیەك بوو کە ئێمە تێی نەدەگەیشتین، ئیتر نازانم چۆن هاوڕێ سوریالیستەکان لەپاریسەوە توانیان لەڕووداوەکانی خارکۆف تێ بگەن! ئەوکاتەشی بۆ پاریس گەڕامەوە مشتو مڕی زۆر بەڕێوە بران کە بەدوو ڕۆژ نەگەیشتە ئاکامو بگرە بەدوو ساڵیش. جێی باسە کۆنگرەکە لەساڵی 1930دا بەسترا و دابڕانم لە پرۆتۆن لەساڵی 1932دا بوو. ئەم دابڕانەش بووە مایەی شەقارێك لە دەروونمدا. ئەم شەقارە بەهۆی پرۆتۆنەوە نەك بەهۆی خۆمەوە، زیاتر یەکالابووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە بەهێرشەکانیان بەناوی سوریالیزمەوە ماندوویان کردبووم، هەرگیز هێرشم نەکردە نە سەر پرۆتۆنو نە سەر سوریالیستەکان. ئەوساو ئێستاش پرۆتۆن بەشاعیرێکی گەورەو پەخشان نووسێکی مەزن دەزانم. ئەمەم لەوکاتەشدا وتووە کە پرۆتۆن هێشتا لەژیاندا بوو، ئێستاش دەیڵێمەوە کە ئەو کۆچی کردووە، چونکە ئێمە ناتوانین هیچ کەسێك لەسەر تێگەیشتن یان پلانڕێژی بۆ ژیان ناچار بکەین.

## پلانڕێژی.. وشەیەکی پێکەنیناویە

*کاتێك تەماشای پەیوەندی نێوان دوو کەس دەکەین کە لەهەمان سەرکێشیدا (موغامەرە) ژیابێتنو هەمان مێژوو یەکی خستبن، کەمجار پلانێکی دارێژراو لەپشتەوەی دەبینین.

—ئێمە پلان دابڕێژین؟ ئەم وشەیە مایەی پێکەنینێکی زۆر بوو بۆ هەریەك لەمنو لە پرۆتۆنو هەموو هاوڕێ سوریالیستەکان.

*لەساڵی 1930 یەوە، گۆڕانی زۆر بەسەر نووسینەکانتدا هاتو تەنانەت دەستت دایە ڕۆمان نووسینیش، کەچی ناتوانرێ "ئەنیسە"و "سەرچڵیەکانی تیلماك" لەچوارچێوەی ڕۆماندا پۆلێن بکرێن!

—ئەگەر "ئەنیسە" بەشێوەیەکی تایبەتی بخوێنرێتەوە، کە ئەم خوێندنەوانە باو نین، ڕۆمانە. من هەر لەسەرەتاوە وتوومە ڕۆمان بەژیانی نووسەرەوە بەندەو لە ئەنیسەدا کەسێتیەکان هاوڕێکانمن، بۆ نمونە ئەمەیان لەڕۆمانەکەدا پیکاسۆیەو ئەویش نیە، ئەمەیان پرۆتۆنەو ئەویش نیە، ئەنیسەش ئەراگۆنەو ئەویش نیە. ئەمە جۆرە خۆ خەریك کردنێکی قۆناغەکە بوو کە لەڕۆمانەکەدا ڕەنگی داوەتەوە.

بەڵام لەڕۆمانی "تیلماك"دا، ئەو وتارانەی کە تلیماك ئاراستەی ئەتاكو کلیبۆ و ئۆردیس ی دەکرد، هەموویان وتارە دادایزمەکانی خۆمان بوو کە لەساڵی 1920ەوە دەمان

وتن. ڕووداوەکانی هەریەکەش کە لە "زەنگەکانی بازل"و "زیندەوەرە جوانەکان"دا هاتوون ڕۆڵی ئەزموونە کەسیەکان دەبینن.

لەسالّی 1933دا، شۆفێرەکانی تەکسی، مانگرتنێکی گشتییان ڕاگەیاند، داوام لێکرا دەربارەی ئەم مانگرتنە شت بنووسم، ئەمە بووە یارمەتیدەرێکی باشم بۆ ئەوەی لەیەکێك لە ڕۆمانەکانمدا لە باسی مانگرتنی گشتی سالّی 1911دا سەرکەوتووبم. ئەوەش ئەلّێم کە لە هەموو نووسینەکانمدا پرەنسیپی یەکێتی هەیە. ڕەنگە ئەم قۆناغانە سوودمەند بن بۆ مێژوونووسان، هەرچەندە لە خودی ئەدەبدا بوونیان نیە، وەك چۆن نووسەرێکی کلاسیك هیچ کات خۆی بەکلاسیسیت نازانێ.

*بەلّام هەرچۆنێك بێت تۆ چوویتە ناو مێژووی ئەدەبەوەو تا ئێستاش لەژیاندای.

—بەلّێ وەك ڕۆچوونی ئیسقان بەپووکدا. ئەمە تەنیا هەر من نیم، پرۆتۆنو تزاراش لەژیانی خۆیاندا چووبوونە ناوی. ئەمە بوو کە دەبووە مایەی خۆشحالّیو لەهەمان کاتیشدا خستبوونیە هەلّوێستێکی دژوارەوە.

*بەلّام جیاوازی نێوان تۆو ئەوان لەوەدایە کە تۆ زیاترت نووسیوەو تێکستەکانیشت ڕێرەوێکی سیاسیانەی دیاری لەخۆگرتووە.

—ئەمە ڕاستە، بەلّام لە پۆلێکی جیاواز دانانرێم. لەسالّی 1920دا کە لە گەشتێکدا بووین، یەکێکمان خانوویەکی بەدی کردو وتی؛ ئەمە خانوویەکی ناشرینە. (دۆشان)یش پێی وت؛ هیچ خانوویەك ناشرین نیە.. ئەم وتەیە بۆ هەموو کارێکی ئەدەبی دەگونجێت دەنا هەموویان ناشرینن، نووسەر هەن شت لەنووسینەکانیاندا بەدی دەکەین بەلّام لەڕاستیدا خۆیان هیچ نین.

*تۆ لە چاخی خۆتدا ژیاویت، ئەمە نهێنی "یەکێتی"یە لە نووسینەکانتدا.

—ژیان نووسینە. ئەمە بەواتا ڕاستیەکەی بەسەر سوریالیزمدا دەچەسپێت، نووسینی ئۆتۆماتیکی بەحەقیقەتی مرۆ نامۆ نیە، ئەو مرۆیەی کە دەنووسێتو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە دەبینێت ئەوجا بەئۆتۆماتیکی خۆی دەنووسێتەوە.



# تەسلیمە نەسرین:

# "بەچەکی هیومانیزم دەجەنگم"

سازکردنی دیدەنی:
رافائیل ریرۆل
لە ئینگلیزییەوە:
زەینەب کوێستانی

پرسیار: تۆ لە وڵاتی خۆتدا (بەنگلادیش) دووچاری گێرمەو کێشە بوویت، دواجار لەژێر هەڕەشەی (فەتوا) یەک لە وڵاتی خۆت وەدەر نرای.. هەنووکە ژیانت چۆنە لە سوید؟

تەسلیمە: من لێرە بەتەنیا دەژیمو کە دەچمە دەرەوەش پۆلیسێك یاوەرمەو چاودێریم دەکا. چواردە هەزارو پێنج سەد پاوەندی ئیستەرلینی بەناوی کۆمەکەوە وەردەگرمو پێی دەژیم. کاتێکی کەمم بە دەستەوەیە بۆ نووسین، بەڵام رۆمانێکم بەدەستەوەیەو هەوڵ دەدەم تەواوی بکەم، ئەو رۆمانە پەیوەندی بەحاڵو گوزەرانی ئافرەتانی وڵاتەکەی

خۆمەوە هەیە. ئەو وەختەی بۆم دەمێنێتەوە سەفەری تیا دەکەم، خەڵکێکی زۆر دەبینم، وا خەریکە دۆستو هاورێ پەیدا دەکەم.

**پرسیار: ئایا پەیوەندی تۆ لەگەڵ "نووسین"دا گۆڕاوە لەو ساتەوەختەوەی کە "فەتوا"کە لەدژی تۆ بلاو کرایەوە؟**

**تەسلیمە:** لەبنەڕەتدا نەگۆڕاوە. هەر ئەوەیە کە هەست دەکەم لەجاران بەهێزترم، چونکە ئێستا تێ دەگەم کە چەندە شتێکی کاریگەرو زیندووە ئەو وەختەی مرۆڤ دەجەنگێ. من نەتووڕەمو نەبێزارم لەوەی کە رووی‌دا دەرهەق بەمن.. مەسەلەکە لای من تەنها ئەوەیە کە لەبەرامبەر کۆمەڵگای بەنگلادیش‌دا خۆم بە بەرپرسیار دەزانم.

**پرسیار: لەکوێوە ئەو هەستی لێپرسینەوەیەت لەلا دروست بوو؟**

**تەسلیمە:** گەر بۆ رابردوو بگەڕێمەوە، دەتوانم بڵێم دەمێکە، من هەمیشە دەمنووسی، یەکەمجار شیعرم دەنووسی، ئەو وەختەی هێشتا قوتابی بووم، پاشان کەوتمە پەخشان نووسین. ئەو وەختەی لەبەشی -نوشداریش- دەمخوێند هەر بەردەوام بووم لەنووسین. من هێشتا منداڵ بووم کە هەستم کرد من لە کۆمەڵگایەکدا دەژیم کە هەموو جۆرە فەرقو جوداییەکی تیایە. هەر لەبەر ئەوەش بوو حەزم کرد بنووسم تا بتوانم لەگەڵ ئەو هەموو ناهەقیو نایەکسانیەدا بجەنگم.

**پرسیار: ئایا تۆ لەپێناو چاککردنی باری ناهەمواری ژنان جەنگایت یان شەڕی تۆ بەگشتی دژ بە هەموو شێوەکانی نایەکسانیو ستەمو بێمافی کۆمەڵایەتی بوو..؟**

**تەسلیمە:** ئەو وەختەی دەستم بە نووسین کردو نووسینەکانم بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکان دەنارد، دەمویست دژی هەموو شێوەکانی ستەمو نایەکسانی بوەستمەوە، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخم بە باری ناهەمواری ژنان دەدا. پاشان تێگەیشتم کە کەمایەتی تریش هەن کە رووبەڕوو هەمان چارەنووس دەبنەوە. ئیدی شەڕەکەی من گەورەتر بۆوەو وای لێ هات دژ بەهەموو شێوەکانی فەرقو جودایی بجەنگم، ئەگەر لەژێر هەر ناوێکدا بێ: جیاکاری رەگەز بێ، توخم یان ئایینی بێ. هەڵبەتە بۆ من وەکو ژنێک لە نزیکەوە بەو جیاکارییە ئاشنا بووم کە هەموو ژنانی دەگرتەوە، چونکە من خۆم ئەوەیانم تاقی کردەوە. تەنها هۆیەک کە وای کرد من خوێندنم تەواو بکەم ئەوە بوو کە باوکم کابرایەکی خوێندەوار بوو.. بەپیشە پزیشك بوو، بەڵام زۆر لەدەستە خوشکەکانم ئەو بوارەیان بۆ نەڕەخسا. هەتا گەر بواریشیان هەبوایە... زۆر بەدەگمەن لێ دەگەڕان لە ساڵێك پتر لەزانکۆ بخوێنن- تەنها ئەوە بوو کەمێ خوێندەوارو وریابن. ئەویش بۆ رەزامەندی مێردەکانیان ئەوکاتەی لە ئایندەدا شوو دەکەن. ئەو وەختەی رێ بەکچان دەدرێ بخوێنن بۆ ئەوە نییە خۆیان وتو و وریاو رۆشنبیر بن. باوکانو دایکانی ئێمە مەبەستیان نییە کچەکانیان لەڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆبنو پشت بەخۆ ببەستن، تەنها شتێك کەبیری لێ دەکەنەوە ئەوەیە کە مێردی چاکو مێرخاسیان بۆ بدۆزنەوە.

**پرسیار: باشە لەئێستادا هەڵوێستی خێزانەکەی تۆ چۆن خۆی دەنوێنێ؟**

**تەسلیمە:** من لەخێزانێکی موسڵمانو کۆنەپارێزدا گەورە بووم کە ساڵ لەدوای ساڵ وای لێ هات لیبرالو سەربەستانەتر

بیر بکاتەوە. دەبوو بجەنگم.. هەنووکە دایکو باوکم، براو خوشکەکانم حەز لەو شتانە دەکەن کە دەیاننووسم، پشتگیریم دەکەن، هەرچەندە زۆریان لەسەر کەوتووەو باجی قورسیان داوە. باوکم هەندێ لەهاوڕێکانیو بگرە نەخۆشەکانیشی لەدەستدا. لەلایەن ئیسلامییە توندڕەوەکانەوە هەڕەشەشی لێ کرا، بگرە داوای پارەشیان لێ کردبوو کە بیدا، ناچار بۆ پاراستنی ژیانی خۆی ملیدا. خوشکەکەشم کە بڕوانامەیەکی لە (رووەك ناسی)دا هەیە لەسەر کار دەرکرا، تەنها گوناهی ئەوەبوو کە خوشکی منە. ئێستاکە وای لێ هاتووە کە سەربەستی ئەوەی نەماوە بەدڵی خۆی بچێتە دەرەوە.

**پرسیار: لەرۆمانەکەتدا بەناوی لاجا (شوورەیی) تۆ باس لەتەنیایی (سورابخۆن) دەکەی کە دیارە ئەم پاڵەوانەت لاوێکی هیندۆسییە، ئەو هەستکردن بەتەنیاییەش لەو چەوسانەوەو تەنگ پێ هەڵچنینەوە هاتووە کە دوابەدوای رماندنی مزگەوتی (ئایدویا) لەهیند دەستی پێکرد. ئایا تۆ خۆت هەست بەهەمان تەنیاییو لاتەریکی دەکەی؟**

**تەسلیمە:** بەڵێ، هەندێ جار زۆر هەستی پێ دەکەم، بەڵام هەمان تەنیایی پاڵەوانەکەم نییە. راستە ئەو پیاوێکی ئایدیالیستە بەڵام ئایین پەروەر نییەو شەڕی بۆ ناکات، بەڵام ململانێو شەڕی مەزهەبگەریو ئەو توندو تیژییەی دوای رماندنی مزگەوتەکە وای لێ دەکا ئەویش ببێ بەکەسێکی مەزهەب خواز. من وەکو ئەو نیم. ئەوەی ئامانجی منەو بۆی دەچم: کارکردنە دژی مەزهەب گەراییو شەڕی تائفی، من ئەو چیرۆکەم نووسی تا بە خەڵکانی خۆمانو سیاسەتمدارەکانی پیشان بدەم کەوا هیندۆسەکانی ناو (بەنگلادیش) روویان لە مەزهەب خوازی کرد پاش ئەوەی کە هیچ ئومێدو بڕوایەکیان بەم وڵاتە نەما. هەر هەموو خەریکە وڵات بەجێ دێڵنو رەو دەکەن، وا بڕوات کۆمەڵێکی زۆر لەلاوانی رۆشنبیرو دڵو دەروون پاکو نموونەیی لەدەست دەدەین، چونکە دەوڵەت ناتوانێ ژیانیان بپارێزێو لەمەترسی دووریان بخاتەوە. پەیامەکەی من زۆر سادەو ساکارە.. بەڵام کێ هەیە گوێم لێ بگرێ؟ من زۆر بەسادەیی دەمەوێ بانگەشە بۆ وەستانی شەڕو وێرانکاری بکەم کە بەناوی ئایین[illegible]ە دەکرێ.

**پرسیار: ئایا تەنیاییو دوورە پەرێزی تۆ هی ئەوە نییە کە هەندێ لەکەسانی دیاریکراوی پێشکەوتووخوازیش لە بەنگلادیشدا دژی تۆ وەستانەوە؟ تۆ ئەوەیان چۆن شی دەکەیتەوە؟**

**تەسلیمە:** مەسەلەکە بەتەنها دیوێکی نییە. سەرەتا دەبێ بڵێم ژمارەیەکی زۆر هەن لەپێشکەوتووخوازەکان کە بەراستی منیان خۆش دەوێ. زۆریشن ئەوانەی کە هێرش دەکەنە سەرمو ناویان لەخۆیان ناوە پێشکەوتووخواز، وەلێ لەحەقیقەتدا وا نییە، بەڵکو لەدڵەوەو بەقووڵی کەسانی ئایین پەروەرن. ئەوان حەز بەو شتانە ناکەن کە من دەینووسم، چونکە من هەوڵ دەدەم ئەوە بخەمە بەرچاوان کە تا چ سەروحەدێك خەڵکێك هەن بەناوی ئایینەوە دەچەوسێنرێنەوە. لەڕوانگەی منەوە مەسەلەکە وا دەبینم کە شەرعو یاساکانی (ئایین) تاو توێ بکرێتەوە. دەمەوێ بڵێم دەبێ ئەو دەستەڵاتەی ئایین بەسەر کۆمەڵگاوە هەیەتی کۆتایی بێ.

سەبارەت بەماف پەروەرانی ئافرەتو یەکسانیخوازەکان، زۆریان بڕوایان وایە کە دەکرێ

باری ناهەمواری ژن لە چوارچێوەی یاساکانی ئیسلامدا رێك بخرێتەوەو چاك بكرێ. من لەگەڵ ئەوەدا نیم. من لەپێناو یەکسانی نێرو مێدا دەجەنگم، ئەوەشیان مەحاڵە گەر تۆ خۆت بەیاساکانی ناو ئاین بەستەوە. فێمینیستەکانی ناو (بەنگلادیش) کە دەکا یەکسانیخوازەکان وای رادەگەیەنن کە ئیسلام هەمان مافی یەکسانی بەژنو پیاو بەخشیوە: وەکو یەك. هەروەها وای بۆ دەچن کە دەبێ من لەگەڵ ئەواندا کار بکەم. بەڵام شێوەی کارکردنو دەربرینی من نووسینە. من دەتوانم لەوەدا کەڵکم هەبێ، بەوەی بتوانم خەڵکی قەناعەت بەو شتانە بکەن کە دەینووسم. من دەنێو خەڵکی ئاساییدا ناو وشۆرەتم هەیە. کتێبەکانی من بازاڕیان گەرمە. ژنان دەیخوێننەوە بێ ئەوەی بەمێردەکانیان بڵێن.

**پرسیار:** هەندێ لەپێشکەوتووخوازەکان تۆ بەوە تاوانبار دەکەن کە رۆحی رادیکاڵانەی تۆ وای کردووە ئیسلامیە توندڕەوەکان قازانجی لێ بکەن، واتا ئاکامی کاری تۆ بەقازانجی ئەوانو دژ بە خۆت بشکێتەوە.

**تەسلیمە:** ئەوەیان بۆچوونێکی هەڵەیە، سەرەتا لەبەر ئەوەی "ئوسوولیەکان- فوندەمێنتالیستەکان" لەناو (بەنگلادیش)دا خەریکە رۆژ بەرۆژ هێز پەیدا بکەن، ئێمەش ئەو کەسانەمان پێویستە کە ئامادەن ئازایانە بەڕوویاندا بوەستنەوە، ئەگەر کەسێك لەشوێنی خۆیەوە بێ دەنگ بێتو قسە نەکات، هیچ شتێك ناتوانێ رێیان لێ بگرێ لەوەی دەستەڵات وەدەست نەهێنن.

سوپاس بۆ کاروکردەوەی رێکخراوە ناحکومیو مرۆڤ دۆستەکان، چونکە وایان کردووە کە ژنانی لادێ لەژێر چنگی ئەوان بێنە دەرێو کارو ئیشێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، بەم پێیەش وای لێ هاتووە کە لەڕووی ئابووریەوە (داراییەوە) سەربەخۆ بن. ئوسوولیەکان لەدژی هەموو ئەوانەدا (فەتوا) دەردەکەنو هەندێ جار دەیانکوژن، چونکە بەو جۆرە سەربەستیە تازەیەی ئەوان بۆیان دیاری دەکەن رازی نین. ئایا دەکرێ یەکێك لەگەڵ ئەو "توندڕەوانە" هەڵبکات ئەو وەختەی ژنان بە جۆرەها تۆمەتی جیا تاوانبار دەکەن.

**پرسیار: تۆ بەتەنها رەخنە لە "شەریعەت" دەگریت یان لە سەرچاوەکانی بەگشتی؟**

**تەسلیمە:** ئەوەی من دەمەوێ پێی لەسەر دابگرم ئەوەیە کە ئێمە پێویستمان بە "هیومانیزم" واتا (مرۆڤ پەروەری) هەیە.. لەسەرووی هەموو شتێکەوە پێویستەو ئەرکی سەرشانمانە دژی ئەو هێزە تاریکی خوازە بجەنگین، ئەو کەسو لایەنانەی دژ بە پێشکەوتنن، بەناوی ئایینەوە دەیانەوێ سیاسەتی (کوێرم هیچ نابینم) بەسەر ئێمەدا بسەپێنن، دەیانەوێ ناکردەو مل کەچ بژین بەوەی رێ لەخەڵکی دەگرن پرسیاری هەبێ، بەڵام من حەز دەکەم بپرسم.. من ئاوام.

هەزاران ساڵ لەمەوبەر ئایینەکان پەیدا بوون، کۆمەڵگە هاوچەرخەکانمان کە لەدەمێکەوە قۆناغ بەقۆناغ رەنگیان گرتووە، لەگەڵ رێو رەسمو یاساکانی ئەو زەمانە دوورو دێرینە بەڕێوە ناچێت. بەڕای من چیتر یاساکانی ئایین لەگەڵ ئەم سەردەمەی ئێمەدا یەك ناگرنەوە، بۆیە من رەخنەم هەیەو لەسەر ئەو یاسایانەش کە لەو کتێبانەوە هاتوونەتە دەرێ. سیستمی شەرعی لە

(بەنگلادیش) لەسەر شێوەی بەڕێوەچوونی بەریتانی دامەزراوە. ئێمە لەوڵاتێکی ئیسلامیدا ناژین، بەڵام ئەو یاسایانەی لەنێو خێزاندا بەڕێوە دەچن و مەسەلەکانی شووکردن و میراتی بەڕێوە دەبەن هەر هەمووی لەئایینەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەو یاساو شەرعانەش ئافرەتیان لەبارێکی نایەکسانی و زۆر ناجۆردا هێشتۆتەوە کە دەبێ هەر هەمووی بگۆڕێ.

من وای دەبینم کە چیتر پێویست ناکات کە یاساو دەستووری نێو ئایینەکان بوونێکی رەسمی دەنێو وڵاتێکی مەدەنیدا هەبێ. ئێمە دەبێ یاسایەکی تازەو عیلمانی بدۆزینەوە کە بەچاوی جیاواز سەیری خەڵك نەکات. کۆمەڵێ یاساو دەستووری مەدەنی و یەکسانی و یەکگرتوو کە بەیەك چاو سەیری هەموان بکات.

**پرسیار: ئایا شەڕی تۆ دیوێکی سیاسی هەیە؟**

تەسلیمە: من لەپێناو کۆمەڵگەیەکی باشترو بەختەوەرتردا دەجەنگم. لەپێناو خۆشی و بۆ بەرژەوەندی خەڵکی بێ ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە ئەو هەوڵەی من سیاسیانە دەکەوێتەوە یان نا.

من نامەوێ لەژێر هیچ پێناسەو دروشمێکدا بانگەشە بۆ نووسینەکانم بکەم. شەڕی من، بەمانا فراوانەکەی شەڕێکە لەپێناو ئینسان دۆستی. من ئەوە دەنووسم کە دەیبینم، ئەوەی کە هەستی پێ دەکەم بەپێنووس و بەدڵ دەینووسم.

**پرسیار: تۆ چ جیاوازییەك لەنێوان خۆت و "سەلمان روشدی"دا دەبینی؟**

تەسلیمە: ئێمە هەردووکمان رووبەرووی هەمان مەترسی دەبینەوە، بەڵام ئەو بە (فەتوا)یەکی حوکمەتی ئێرانی فشاری خرایە سەر، کەچی سەبارەت بەمن گرووپێکی ئوسوولی (فوندامێنتالیست) هەڕەشەیان لێ کردووم. "سەلمان روشدی" وەك نووسەر لەمن باشتر ناسراوە. بەڵام منیش هەوڵ دەدەم خزمەتێك بەکۆمەڵگای خۆم بکەم.. شتێك بۆ وڵاتەکەم بکەم. رۆمانی (ئایەتە شەیتانییەکان) رووی راستەقینەی ئایینی خستە بەرچاوان کە زۆر گرنگو پێویستە. من رێزێکی زۆری دەگرم کە کارێکی وای کردووە. سوپاس بۆ ئەو.. ئێستا روون بۆوە کە هیندۆسەکان و عیسا پەرستەکان هەقی ئەوەیان هەیە رەخنە لەئایینی خۆیان بگرن، بەڵام موسڵمانەکان بۆیان نییە، هەتا دوای تێپەڕبوونی (1400) ساڵیش ئەو هەقەیان نییە.

خۆ دەبێ ئێمە رێزی ئەو کەسانە بگرین کە بڕوایان بەیەزدان هەیە، بەڵام "سەلمان روشدی" توانای هەبووە لەنێو رۆمانەکەیدا رەخنە لەئایین بگرێ.. منیش هەر هەمان شتم کردووە.

**پرسیار: ئایا تۆ دژی هەموو چەشنە دۆگمایەکی؟**

تەسلیمە: من وای بۆ دەچم کە هەر هەموو ئایینەکان تۆوی فەرقو جوداییان تیایە. من ئەگەر لەوڵاتێکی دیکەش لەدایك بوومایە، لەوانەبوو هەمدیس رەخنە لەو ئایینە زاڵەی ئەو وڵاتە بگرم. من بەگومانم.. ئایا دەکرێ چیتر قەناعەت بەو شتانە بکەم کە دەنێو ئینجیلدا دەیخوێنمەوە.. هەر بۆ نموونە ئینجیل دێنمەوە. لەڕوانگەی منەوە ئایین بۆ سەردەمانێکی زوو پێویست بوو، بەڵام لەوەدایە بۆ ئەمڕۆکە ئەو پێویستە نەبێ. ئێمە دەتوانین زۆر چاك بەڕێوە بچین گەر ویژدانمان بکەین بە قیبلەنوما.

**پرسیار: تۆ خۆت بەکەسێکی نەتەوەپەرست "ناسیونالیستی" دەزانی چونکە**

لەرۆمانی (لاجا)دا چەندین برگە لە دەوری بیرۆکەی "زێدی یان خاکی باووباپیران" دەخولێتەوە؟

**تەسلیمە:** زۆر بە سادەیی پێت دەڵێم کە من مرۆڤم. بڕواشم بە پەساپۆرتو ڤیزا نییە. من خەون بەدونیایەکەوە دەبینم کە خەڵکی تیایدا بتوانن بێ کۆسپو تەگەرە سەفەر بکەنو بێنو بچن. بەڵام دیارە کە دەیەها جیاوازیو نابەرابەری دەنێو وڵاتەکاندا هەیەو بەهەموو چەشنە دیوارو بەربەستێك سنووردار کراوە– دەوڵەمەندیان تیایەو لەولاوەش هەژار.. سەرەڕای جیاوازی لەکەلتوورو لەهەڵبژاردنی ئایین. من شتێکی وام وتووە، من زمانو کەلتووری خۆمانم لەهەمووان پتر خۆش دەوێ، بەڵام ئەمەیان مانای ئەوە نییە کەیفم بە زمانو کەلتووری گەلانی تر نایە، من هاوڕێو دۆستێکی زۆرم لەدەرەوەی (بەنگلادیش)دا هەیە، جیاوازی زمان ڕێم لێ ناگرێ لەوەی دلسۆزانەو ئادەمیانە گفتو گۆیان لەگەڵدا سازبکەم.

**پرسیار: ئەگەر بڕیاری ئەو (فەتوا)یە لەدژی تۆ هەڵبوەشێتەوە، ئامادەی بگەڕێیتەوە لە (بەنگلادیش)دا بژی؟**

**تەسلیمە:** کێ لای بباتو هەڵیبوەشێنێ؟ میری (حوکمەت) لەدژی ئەو کەسانەی کە بڕیارەکەیان دەرکرد هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. (ئوسووڵییەکان) هەرگیز ئەو فەتوایە بەتاڵ ناکەنەوە، بەڵام من ئامادەم هەر بچمەوە (بەنگلادیش) گەر بارو دۆخەکە بەرەو باشتر بچێ، ئەوەش وەستاوەتە سەر ئەو کەسانەی خۆ بەپێشکەوتووخواز دەزانن. بەڵام من گوێ بەمەترسی نادەم، چونکە وابزانم ئەوەیان ئەرکی سەرشانمە کە خۆم بۆ مەسەلە هەڵایساوەکانی ناو وڵاتەکەم تەرخان بکەم. من دەمەوێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا بم کە دژ بە (فوندەمێنتالیستەکان) دەجەنگن. سەرەڕای ئەوەش کە من لە وڵاتی خۆمدا وەك نووسەر کاری باشترم لەدەست دێ بیکەم.

**پرسیار: ئەگەر پێشکەوتووخوازەکان دەستەڵات بگرنە دەستو ئیشێکی دەوڵەتیان دا بەتۆ.. پێی ڕازی دەبیت؟**

**تەسلیمە:** ئەوەی من دەمەوێ ئەوەیە کە ببمە نووسەر.

**پرسیار: تۆ زۆر جاران پێ لەسەر نەبوونی سەربەستی سێکسی دادەگریت کە ژنانی بەنگلادیش بەدەستییەوە دەتلێنەوە.**

تەسلیمە: هەڵبەت ئەمەیان مەسەلەیەکی گرنگە، بەڵام مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە کە دڵنیا بین لەوەی ئافرەتان خۆیان ڕۆشنبیربن. ئیتر دوای ئەوەی چیمان بوێ ئاسانتر دەبێ. لەوڵاتی مندا دەتوانی وەك نموونە سەیری من بکەی– کە بۆ ئافرەتێك لەنێوەندێکی ڕۆشنبیریدا بێو شتەکانی ئەوەندە بە زەحمەت بۆ دەستەبەر بکرێ. هەمیشە دووچاری گرفت دەبێ. بەڵام گرفتەکە ئەوەیە ئەو ئافرەتانەی کە سەر بە چینێکی هەژاربن لەهەموو جۆرە خوێندەواریو ڕۆشنبیرییەك بێبەری کراون. لەوەدایە شۆڕشو هەڵگەڕانەوە لەنێو ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکانی چینی ژێرەوەدا بتەقێتەوە.

پرسیار: شۆڕش..! تۆ لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە لە کوێ وەستاوی؟ تۆ مارکسیت؟

**تەسلیمە:** من (مارکس– و –ئەنجلزم–م) خوێندۆتەوە، من ڕقم لەستەمو نایەکسانیو نابەرابەرییە، من دژی ئەو



میلان کوندرا

هویت

ترجمهٔ پرویز همایون پور



# شوناس

## ڕۆمانی تازەی میلان کۆندێرا

و: مەسعوود ڕەحیمی

مرۆڤ بەردەوام لەجیهان و گۆڕانکارییەکەی ئەڕوانێت و بیر لەناسینی دیاردەکانی هەستی ئەکاتەوە. ئەم تێڕوانین و بیرکردنەوە هەرچەند بەزانیاری زیاترەوە بێت، بازنەی ناسین بەرفراوانتر، قووڵترو بەچێژتر ئەبێت. لەم بوارەدا، ناسینی هەلومەرجی مرۆڤ بایەخی تایبەت بەخۆی هەیەو پێزانین بەقوژبنی سەرسووڕهێنەری ڕۆح و ڕەوان پتر لەهەر شتێك سەرنجی بیریارو هونەرمەندەکان ڕائەکێشێت.

میلان کۆندێرا بەردەوام هەوڵ ئەدات کەلەژێر تیشکی "هونەری ڕۆماندا" لەم هەرێمە بێسنوورە تێپەڕێ و لەبەرهەمەکانیدا دەروونی مرۆڤ بپشکنێ. ئەو پێی وایە کەڕۆمان ئەتوانێ یارمەتیدەری مرۆڤ بێت لەتەکوین و پێگەیشتنیداو "جیهانی ژیانی" ئەو ڕووناك بکاتەوە. بەبڕوای ئەو، هەر ڕۆمانێك ئەبێ تیشکێکی زیاتر بخاتە وجوودی مرۆڤەوەو قوژبنە تەماوی و نەناسراوەکانی ڕوون بکاتەوە. کۆندێرا زۆرجار وتەی هێرمەن بڕۆخ، بیریارو ڕۆمان نووسی نەمسایی وەبیرئەهێنێتەوە: "ڕۆمانێ کەرەگەزێکی نەناسراو لەم کەونەدا نەدۆزێتەوە، دوور لەئەخلاقە. ناسین، تاکە ئەخلاقی ڕۆمانە."

ئەو لە وتو وێژێکیدا لەگەڵ گۆڤاری نۆڤل ئەبزێرو یچێر بەبۆنەی دەرچوونی ڕۆمانی


میلان کۆندێرا

شوناس، دەبێژێ کەهەر رۆمان نووسێك پێویستە لەدوو فرمان پەیڕەوی بکات: سەرەتا، بەس ئەو شتە بڵێ کەتا ئێستا نەیوتووە؛ پاشان بەردەوام لەحاڵی پشکنینی شکڵو فۆرمێکی نوێدا بێت؛ و درێژە ئەدات: "سەرەڕای ئەمە دۆزینەوەی شتی نوێ حەددو سنوورێکی هەیەو ئەگەر رۆمان نووس بیەوێ لەسنووری خودی خۆی تێپەڕێ، رەسەنایەتی خۆی لەدەست ئەدات... بازنەی تەلیسماوی چەند بابەت، واتە چەند بابەتی وجوودی، خەیاڵی ئەو لەسەرتاسەری ژیانیدا دائەگرێتو تەنانەت بنۆسو هۆکاری نووسینی بۆ دا ئەتاشێ." ئەگەر کافکا یان ناچار بکردایە کە "سەبارەت بەئەڤینەکانی مێترنیخ، یان ناحەزی شەڕ، رۆمان بنووسێ، هەروەك خوێندکارێکی وردیلانەی تەمبەڵ ناکام ئەمایەوە. لەبەرئەوەی کە، جگە لەو تاکە بابەتانەی کەئەویان تەلیسم ئەکرد. ئەو بابەتانەی کەرۆمانە گەورەکانی ئەو بەئێمەی ئەناسێنێت. مونەرەکەی، بیرکردنەوەی‌و رەسەنایەتی‌یەکەی، بەخێرایی بەجێیان ئەهێشت."

کۆندێرا شکڵو قالبی رۆمانەکانی تا ساڵی 1988 بەزمانی مۆسیقا هەروەك "مونەری سونات" وشکڵو قالبی دوو رۆمانە تازەکەی کەهەروەك "مونەری فوك" وەسف ئەکات. داڕشتنی گەورەی (سونات) بەچەندین موومانی دژ بەیەکەوە، جێگەی خۆی ئەدات بەداڕشتنێکی کورتتری (فۆگ)ەوە کەتەنیا لەیەك "بلۆك"ی دابەش هەڵنەگر دروست ئەبێت. بەوتەیەکی‌تر، رۆمانە پێشووەکان بریتین لەچەند بەشی گەورە (حەوت بەش) بەبابەتو ناوەڕۆکی جیاوازەوە. لەحاڵێکدا کەدوو رۆمانی نوێ ساختارێکی هەیە بریتی‌یە لەبەشی زۆر بە بابەتو ناوەڕۆکی چوون یەکەوە. رۆمانی شوناس‌و رۆمانی خاوی هەریەك بریتی‌یە کەپەنجاویەك بەشی پەیوەستەو جودایی هەڵنەگر. رۆمانە پێشووەکان بەزمانی چیكو دوو رۆمانی ئەخیر بەزمانی فەرەنسی نووسراوە. کۆندێرا دەیەوێت زمانەکەی "سانا، وردبینانەو

شەفاف" بێت و لە هەموو زمانەکاندا ئەم تایبەتمەندی‌یە بهێڵێتەوە. بەبڕوای ئەو هزرو زمانی گێڕانەوەی بیر، لەقاڵبی ڕۆماندا ئەبێ شاعیرانە بێت و بەرزترین داخوازی‌یەکانی شیعر (گەڕان بەدوای جوانی‌دا، گرنگی تایبەتی هەر وشەیەک، میلۆدیی دەقەکە، جوانکاریی هەموو شتە وردو درشتەکان) بهێنێتەدی. ڕۆمان پێویستە لەبەشە هزرمەندەکەیدا، هەندێ جار بگۆڕێ بۆ نەغمەو ستران.

ناوەڕۆکی وجوودی ئینسان لەڕۆماندا بەشێوەی "وشەی بنەمایی" یا "وشە کلیلی‌یەکان" دەرئەکەوێ و قووڵایی هەست و بیرکردنەوەی پاڵەوانەکانی پیشان ئەدات. ڕۆمان نووس هەوڵ ئەدات تاوەکوو ئەم وشە بنەمایی‌یانە لەشوێنی جوانی خۆیاندا بەکاربهێنێت و لەشێوەی کاتیگۆرییەکانی بوون دا بەرجەستەیان بکات. بۆ نموونە، ماهیەتی وجوودیی کەسێتی‌یەکانی ڕۆمانی (باری بوون) لەم تەوەرانەدا دەخولێتەوە: لەش، ڕەوان، سەرگێژە، لاوازی، ئەڤینی شاعیرانەو، بەهەشت بۆ تیریزا؛ سووکی و قورسی بۆ تۆما؛ ژن، وەفاداری، خیانەت، مۆسیقا، تاریکی، ڕووناکی، ڕێپێوان، جوانی، وڵات، وەگۆڕستان بۆ فرانزو سابینا، گرنگترین کلیلی ڕەمزی وجوودیی کەسێتی‌یەکانی ڕۆمانی شوناس واتە شانتاڵ و ژان مارک، بریتین لە؛ لەش، ڕەوان، بەهەڵەتێگەیشتن، دۆستایەتی، خەمۆکی و.. هەڵبەتە ئەڤین و شوناسیش.

بەسەرهاتی ژیانی شانتاڵ و ژان مارک زەمینەی ڕووداوەکانی دوایین ڕۆمانی کۆندێران. ئەوان یەکتریان خۆش ئەوێ، هاوبەشی ژیانی یەکترین و لەو جیهانەیدا کەپەسەندی ناکەن بەتەنها لەژێر تیشکی ئەڤینی خۆیاندا خۆڕائەگرن. شانتال، لەڕاستیدا تاکە پێوەندی عاتیفی ژان مارک لەگەڵ جیهاندایە؛ "هیچ کەسێک جگە لە شانتاڵ ناتوانێ ئەو لەو حاڵەتی بێدەربەستی‌یە دەربێنێ" و تەنها بەهۆی ئەو دەژی.

شانتاڵیش لەیەکەم دیداریدا، خولیای ژان مارک بوون؛ "شانتاڵ هەر لەسەرەتاوە لەپەنایەوە بوو، لەبەرامبەری بوو، نزیکی بوو".. "کەوتبووە داوی‌یەوە" "مانەوە لەتەک ژان ماركدا بۆ ئەو هەموو شتێک بوو."

ڕۆژێ شانتاڵ، بەبێ ئەوەی کەبەباشی لەواتاکەی تێبگات ئەڵێ: "چیدی پیاوەکان بۆ دیتنی من ئاوڕنادەنەوە." ژان مارک، بێزارو سەرسووڕماو، هەوڵ ئەدات لەهەست و بیری شانتاڵ تێبگات. ئەگەرچی سەرەتا ئێرەیی پێدێ، بەڵام سەرەنجام ئەڤین سەرئەکەوێت. وا هەستدەکات شانتاڵ لەخەم و پەژارەی پیری دەدوێ. کەوابوو بۆ ئەوەی لەخەمۆکی ڕزگاری بکات لەژێر دەمامکی نامۆیەکدا نامەی بۆ ئەنووسێ: "من هەروەکوو شۆفار (جاسوس) لەدووت ئەگەڕێم، تۆ جوانیت، زۆرجوان." کاتێ دەبینێ شانتاڵ هەر گیرۆدەی بێهیوایی و بیرکردنەوە لە مەرگە، درێژە بەنووسینی نامە ئەدات. ئەم نامانە شانتاڵ شەیدا ئەکەن و هەست و ئاواتەکانی تافی لاوێتی‌ی بۆ ئەگەڕێننەوە. بەم شێوەیە زەمینەی بەهەڵە تێگەیشتن و وەدی دێت و کاردانەوەی لەسەر پەیوەندیی ئەوان ئەبێت.

ژان مارک لەمەڕ شوناسی شانتاڵەوە گومانی لادروست ئەبێت. پێی وا ئەبێ کەشانتاڵ ئەو ژنە نیە کەئەو خۆشی ئەوێ و، لەسیمای ئەودا دەموچاوی ژنێکی بیانی ئەبینێت، پێی‌وایە کە سەبارەت بەشوناسی شانتاڵ و بەهەڵەدا چووەو ئیتر هاوسەرە مەحبووبەکەی جارانی نی‌یە. شانتاڵیش لە "شۆفارێتی" ژان

مارك تێناگات. ئەو بەدووڕوو و چوختـی ئـەزانێو ژیـانی هاوبەشیان بەهیچوپووچ ئەزانێ. كاردانەوەی شانتاڵ كەنیشانەی دڵڕەقیو بێڕەحمی ئەوە، ژان مارك بەسەختی ئـازار بەدات؛ ئیحساسی بێمەیلی بەنیسبەت هـەموو شـتێكەوە لادروست ئـەبێتو پـەژارە هـەموو گیـانی دائەگرێ. ئـەوان چیدی پـەی بەشـتەكانی یـەكدی نابـەنو لەیەك تێگەیشـتن لـەنێوانیاندا نامێنێت.

ژیانی شانتاڵو ژان مـارك، سەرەنجام، بەشێوەیەكی نادیار ئەبێ بەخـەونێكی شووم. ئـەم خەونە تاقەتپڕووكێنو ترسناكەو كەشـێكی كافكـایی وەدی ئەهێنێ. شانتاڵ هەست ئـەكات كەئەیانـەوێ "خــودی لـێبستێننەوە، چارەنووسی لـێبدزن! " و لـەناو كەسانی نەناسراودا بەرەڵڵای بكـەن. ژان مـارك توانـای دووركەوتنـەوەی لەشـانتاڵ نیــە، بــەدوایدا وەڕێئەكـەوێ تـا بیدۆزێتـەوەو یارمەتیی بدات، لەبەرئـەوەی كەبەباشی ئـەزانێ كـە "شـانتاڵ هیچ كەسی دیكەی لەم جیهانەدا نیە، هیچ كەسی دیكە لـەهیچ كوێی جیهاندا." ڕۆمـان نـووس لـەكۆتایی ڕۆمانەكەیدا، لـەخۆی ئەپرسێ: كێ خەونی بینیوە؟ و لەسەرەتاوە كامە چركەساتی ژیانی ڕاستەقینەی ئـەمان بووە بـەو خەونـە شـوومە؟ كـەس وەڵامەكەی نازانێ.

لــەڕۆمانی شــوناس دا هەڵومـەرجی مرۆڤی هاوچـەرخ ئەكەوێتـە ژێـر زەرەبـینو سەرلێشـێواوی و گــرژی ڕۆحو ڕەوانی ئەو ئەكەوێتە پێش چاو. كەسـێتیـیەكانی ڕۆمانەكـە لەچۆنیەتی گۆڕانكاریی جیهان ڕازینـین، بەرگـەی بەشداریكردنی واتـەواتی "ئـەم بـازارە شـێواوە بێبایەخـە" ناگرن هەروەها هـی "گێلێتیـیە بێچارەسـەرەكەی". هــزرو هەستو سـۆزی شـانتاڵو ژان مارك خوێنەر دەهەژێنێو زەینی ئـەو بــەرەو ئاسـۆ دوورە دەسـتەكانی خـەیاڵ دەبـات. ئـەوان بەجـەخارەوە بـیر لەئەرزشە بەنرخـە لەدەست چووەكانیـان ئەكەنـەوە، سـەبارەت بەهەڵومـەرجی هەنووكەیی ژیانی مرۆ وتـووێژ ئەكەنو بۆ ڕزگاركردنی خۆیان پەنا بۆ ئەڤین ئەبەن. (....)

میلان كۆندێرا حەز ئـەكات كەڕۆمانـەكانی هــەروەك سـەمفۆنیا بـنو هەوێنـەكانی نـاخی مـرۆڤ بهێننـە دەنـگ. باشـترین ڕۆمانـەكانی ئـەو ئەتوانین ناوبنێین "سـەمفۆنیای بـوون" و جوانـیو بێسـنوری "هونـەری ڕۆمـان" لەبەرهەمەكانیدا ستایش بكەین. چـەند بـاش ئـەبوو ئەگـەر بمانتوانییایە خۆمـان لەكەشـی ڕۆمانـەكانیدا ڕەهـا بكـەین؛ كەشێكی ئازاد، شەفاف، پڕاوپڕ لەبیركردنـەوەو داهێنـان، پـڕ لەسەدان حەقیقـەتی نیسبی دژ بەیـەكو نـەگونجاو. وەچـەند باشـە گـەر بتوانـین جیـهانی ڕۆمـانی بەڕاسـتی بناسـین، ڕۆمانەكەی كۆندێرا شاعیرانەیەو پـەیوەندیی بەهــەموو بوونـی مرۆڤــەوە هەیــە، هەسـت ئـەلاوێنێ. هــزرو خــەیاڵ ئەهەژێنێ، ئاڵۆزیی دیاردەكانی وجوود ئەخاتـە پێش چـاو. ڕۆمان نووس جاروبار قورسترین دیاردەكـان وەهـا "سـووك" دەخاتە ڕوو كەژیانو هەموو ئەو شـتانەی كەتیایدایە هـەروەك یاری دێنە پێش چاو.

بـەڵام جاروباریش وەهـا خـەمو پـەژارەی مـرۆڤ ئەگێڕێتەوە كە"قورسایی" باری بوون گیانو ڕەوان دەڕەتێنێت. ڕۆمانەكـەی كۆندێـرا ئـەبێ بەسـۆزێكی شـاعیرانەوە و شەوقێك بۆ تێگەیشـتن لەنهێنی وجوودی مـرۆڤ، بخوێنرێتـەوەو دیسان بخوێنرێتـەوەو بـەردەوام تێیدا ڕابمێنین.






# ئەو پیاوەی دەیویست ڕێڕەوی مێژوو بگۆڕێت

ناوی کتێب: دۆن کیشۆت

نووسەر: سێرڤانتیش

وەرگێڕانی لە سویدییەوە: کاکەوەیس

*لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم*

عەتا محەمەد

لەپاڵ ئەو کەسایەتیە ئەدەبیانەی وەك هاملێت – فاوست– مەدام بۆڤاریو زۆری تر، ئەدەبی ئیسپانی توانی لەسەدەی حەڤدەداو لەپاڵ _دۆن جوان)دا کەسێتی دۆن کیشوت بخولقێنێت کە تا ئێستا بەزیندوویی ماوەتەوە چونکە ئەم کەسایەتیە توانی سنووری ئەدەبی ببڕێتو وەك زاراوەیەك یاخود سیفەتێك بەکاربهێنرێتو دەستنیشانی هەڵوێستی مرۆڤی پێ بکرێت لە بەرامبەر واقیعدا چونکە دۆن کیشۆت ئەو کەسێتیە پێکەنین هێنەرەیە (لە هەڵسوکەوتیدا نەوەك لەنیەتیدا) کە ڕەهایانە لەواقیع یاخی دەبێتو ئەم یاخی بوونە پێکەنیناویەشی دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵ کردنی وەهم بەواقع. بۆ تێگەیشتنی ئەم خاڵەش دەبێت لەدۆن کیشۆت وردببینەوە کە سێرڤانتیس دەیەوێ وەك حەقیقەت بیخاتەڕوو، ئەوەتا تا لاپەڕە 17 کاتێك باسی ناوی نەجیب زادەکە دەکات دەڵێ (خۆ ئەمە، کاریگەرییەکی

ئەوتۆی نیە بۆ باسەکەمان بەمەرجێ خۆمان بەراستیەوە خەریك بکەین).

دۆن کیشۆت (ئەم نەجیبزادەیە، لەکاتی دەستبەتاڵیدا- کە زۆربەی کاتی ساڵ دەستبەتاڵ بوو، داستانی پاڵەوانانی دەخوێندەوە، بەزەوقێکی وەهاشەوە دەیخوێندەوە کە زۆری نەدەما رابواردنی راوی بیر بچێتەوەو لەوەش زیاتر، کاروباری زەرعاتەکەی لەبیر کردبوو حەزی خوێندنەوەی، لەدوای ئەو خوێندەوانەدا هێند زۆر بوو کە گەلێ بەرهەمی کشتوکاڵی بۆ ئەوە دەفرۆشت، پارەی کڕینی کتێبی تری هەبێ‌و هەر داستانێکی دەربارەی پاڵەوانان دەست کەوتبا دەیکڕی.. لە ئەنجامدا بەهۆی نەخەوتن‌و بیرکردنەوەوە مێشکی وەها تێك چوو، هۆشی خۆی لەدەستدا) ل17.

ئەگەرچی سێرڤانتیس ئامانجی گاڵتەکردن بووە بەچیرۆکی شۆڕەسواران کە لەو سەردەمەدا باوبووەو هەوڵ دەدا ئەم داستانە وەك حەقیقەت بخاتەڕوو، بەڵام جیهانێکی تایبەت دروست دەکات بەوەی بەقووڵیەوە لەسەردەمەکەی خۆی دەڕوانێت چونکە باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی ئیسپانیا لەنیوەی سەدەی شانزەهەمەوە کە دۆن کیشۆتی تیا بەرهەم هات بارێکی تایبەتی هەبوو بەوەی ئەورووپاو بەتایبەت ئینگلترا ڕێگای گەشەسەندنی سەرمایەداری گرتبووە بەر کەچی ئیسپانیا چاوی لەڕابردوو بڕیبوو، ئەمەش وایکردبوو کەچینی سەرەوە کارنەکەن‌و کارکردن بەشتێکی نەشیاو دانێن پاشان لەپاڵ ئەواندا سواڵکەرو هەژار بەڕێژەیەکی زۆر بڵاو بوونەوە.. لەم بارودۆخەدا ئەفسانەو ئیمان باڵیان بەسەر ئەو کۆمەڵگایەدا کێشابوو کە وەك دەبینین لەدۆن کیشۆتدا رەنگدانەوەی دەبێت بەتایبەت لەخولقاندنی یۆتۆپیا لەلای ئەم پاڵەوانە. دۆن کیشۆت ئەو نەجیبزادەیەیە کە ژیانی بە خوێندنەوەی داستانی شۆڕە سوارانی پێش خۆیەوە دەباتەسەر تا مێشکی تێك دەچێت‌و (بڕیار دەدا کە لەپێناوی ناوبانگی خۆی‌و بەرژەوەندی گشتیدا، ببێتە پاڵەوانێکی سەرگەردان‌و بەهەموو چەکەکانیەوە بەهەر چوار قوڕنەی دنیادا بسوڕێتەوە تا بەرگری لەغەدرلێکراوان بکاو خۆی بهاوێتە ناو مەترسی واوە کە تیایاندا سەرکەوت، ئیدی ناوی تا هەتایە بەنەمری بمێنێ..) ل18 سەدەکانی ناوەڕاست سەردەمی ئەو پاڵەوان‌و سوارچاکانە بوو کە بەدوای بەدیهێنانی بیرۆکەکانی خۆیاندا دەڕۆشتن کە دۆن کیشۆت لەرێگای خوێندنەوەوە لاسایی کردنەوە بەڵام جیاوازی دۆن کیشۆت لەشۆڕە سوارەکانی پێش خۆی ئەوە بوو ئەم بۆ ئامانجی بەرز هەوڵی دەدا کە لەعەدالەت‌و بەرگری کردن لەغەدرلێکراواندا خۆی دەبینیەوە دەشێت ئەمە بگەڕێتەوە بۆ دەرکردن بەسەرەتای گۆڕانی کۆمەڵ‌و ئەم خەونەی دۆن کیشۆتیش لەوێوە سەرچاوەی گرتبێ، دەکرێ لێرەدا دوو خاڵ دیاری بکەین.

1-دۆن کیشۆت داستانێکە واخۆی نیشان دەدا کە بۆ گاڵتەکردن بەسەردەمی سوارچاکان (رابردوو) نوسراوە.

2-لەهەمان کاتیشدا ئەوەی لێ تێ دەگەین کەکاتێك رابردوو وەك پرۆژە لەپشت خەونی مرۆڤێکەوە دەوەستێت دەشێت بیکاتە مایەی گاڵتەجاڕی ئەوەتا دۆن کیشۆت لەرێگای خوێندنەوەی چیرۆك‌و داستانی سوارچاکانەی یۆتۆپیای لا دروست دەبێت کە دەکرێ پێی بوترێت یۆتۆپیایەکی پارێزگار

چونکە لەسەر نموونەی رابردوو بنیات نراوە کە ئامانجێکی سەرلەنوێ دروست کردنەوەی رابردوو لە ئێستادا بەدیدێکی خەیاڵییەوە، چونکە ئەو بیرانەی دۆن کیشۆت هەڵی گرتووە هی سەردەمی خۆی نین، لێرەشەوە دەیویست رەورەوەی مێژوو بوەستێنێت، دەکرێ بڵێین ئەم دیدە خەیاڵییەش لەنەبوونی قەناعەتێکی قووڵەوە بووە بەرامبەر واقیع ئەگەرچی لەگەڵ هەموو هەڵگرانی بیری یۆتۆپیای سەدەی هەژدەهەم جیاوازە چونکە هیچ گرنگی بەئابوری نەداوەو ئەم لەجیهانی ئەخلاقە باڵاکاندا دەژیا کە ئەخلاقی ئەو نەجیبزادانە بوو کە هیچ لەکاروباری ئابووریو کار تێنەدەگەشتن.

دەکرێ وا سەیری دۆن کیشۆت بکرێت کە سەپاندنی ئیرادەی تاکە بەسەر واقیعدا چونکە ئەو بەقووڵی باوەڕی بەوەیە کە ئیمان شاخ دەجووڵێنێ، لێرەوە دۆن کیشۆت دەبێتە ئەو شۆڕشگێرە سەرسەختەی بەدوای راستیو خێرو دادپەروەریدا دەڕوات بەڵام لەوەهمو خەیاڵەوە ئەوەتا دەتوانین هەرلەخۆ رازاندنەوەی بەچەکی باوباپیرانییەوە کە دەبێتە مایەی پێکەنین تابینینی ئەسپە لەڕو لاوازەکەی کەوەك ئەسپی ئەسکەندەر دێتەبەرچاویو چوار رۆژ بەوەوە دەکۆڕێت تا ناوێکی بۆ بدۆزێتەوە کەشیاو بێ بۆ ئەمی پاڵەوان ناونانی خۆی بە هەشت رۆژ تا ناوێك لەشێوەی ناوی پاڵەوانەکان بدۆزێتەوە، پاشان دروست کردنی دڵدارێکی خەیاڵی بۆ خۆی (چونکە پاڵەوان بێ ئەوین وەك داری بێ گەڵاو بێ بەروایە ل19).

دواتر گەشتەکانی دەست پێ دەکات کە دۆن کیشۆت لەرووبەڕووبوونەوەی واقیعدا دەکەنە گاڵتەجاڕ ئەگەرچی خۆی دەستی هەیە لەم بەگاڵتەجاڕیبوونەی بەوەی خانێکی بچووکی لێ دەبێتە قەڵاو خانچییەکەش بەقەڵادارو دووکیژی ناو خانەکە بەخانمانی خانەدان بانگ دەکات.. یا خود شەڕکردن لەگەڵ ئاشی با و گەلێك دیمەنی تر..

دەکرێت ئەم چەند وشەیە تەنها ناساندنێکی رووکەشیانەی ئەو کتێبە بێ کە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستدا وەرگێڕاوەتە سەر کوردی ئەگەرچی نزیکەی چوار سەدە بەسەریدا رادەبورێت، تایبەتمەندی ئەم کتێبەش لەوەدایە کە تەنها خوێندنەوەی دەتوانرێ پەی بەو زمانە گاڵتەجاڕیەی ببرێت کە گەیاندویەتیە ئەو ئاستەی رۆژێك فیلیبی سێهەم لە کۆشکەکەیەوە دەڕوانێت، کەسێك دەبینێ بەدەم خوێندنەوەی کتێبێکەوە پێ دەکەنێ، فلیبی پاشا دەڵێ: ئەمە یا شێتە یاخود دۆن کیشۆت دەخوێنێتەوە، هەرواش دەبێ... ئەو کەسە دۆن کیشۆت دەخوێنێتەوە..

تایبەتمەندیەکی تری ئەم کتێبە ئەوەیە کە توانایەکی سەیری هەیە بۆ کورت کردنەوە، هەر بۆیە دەکرێ لەیەك کاتدا چەندین چاپی قەبارە جیاوازی ببینین وەك ئەوەی ئەم کارە تا سنووری یەك رستە کورت بکرێتەوەو چەندین سەدەشی تیاجێبکرێتەوە.

دۆن کیشۆت کاری رێگا خۆش کردن بوو بۆ مرۆڤ تا لەواقیع یاخی ببێتو هەموو بێ دۆن کیشۆتەکانی مەحاڵە.




# لەتاریکیەوە بۆ رووناکی

کتێب: لەتاریکیەوە بۆ رووناکی

سەرچاوە: بەڵگەنامەکانی ناو ئارشیفی بەریتانی.

وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە:

جەمال میرزا عەزیز

چاپی یەکەم: 158 لاپەرە بەتیراژی 750

*لەبڵاوکراوەکانی: دەزگای چاپو پەخشی سەردەم*

**فەرهاد**

ئەوەی باوبووەو تا ئێستایش لەهەندێك لە وڵاتانی دنیادا هەر رەواجی هەیە ئەو وتەیەیە کە دەڵێت: مێژوو دەسەڵات دەی نووسێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەیشە لای ئەو بیرمەندو روناکبیرانەی نەبوونەتە بەشێك لەدەسەڵاتو رەنگە خۆشیشیان پێ نەهاتبێت بەردەوام تۆماری مێژووە دێرینەکانیان بەچاوی گومانەوە تەماشا کردووە. هەر ئەوەیش وای لێ کردوون کە زۆرجار ئەرکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو بەدواداگەڕانێکی ماندوونەناسانە بۆ دەرخستنی حەقیقەتەکانی مێژوو لە ئەستۆ بگرنو، گەلێك بیروباوەڕی تاڕادەیەکیش چەسپاو رەت بکەنەوە. بێگومان درێژبوونەوەی ئەو چەمکی گومان کردنە لەگەڵ گەڕانەوەدا بۆ رووداو و مێژووە کۆنەکانی ژیانی مرۆڤ هاوتەریبن بەباڵاکردنو فراوان بوون، چونکە یەکەمیان لەبەر ئەوەی کە بەشێکی ئەو مێژووانە لەباتی

تۆمارکردنیان بەنووسین زیاتر دەماو دەم گەیشتوونو، دووەمیشیان لەبەر ئەوەی کە ئەگەر نووسینیش هاتبێتە ئاراوە زۆربەی هەرە زۆری خوێندەوارەکان لەناو چینی سەرەوەدا پەیدا بووە کە ئەویش بەئاسانی ڕێگای دەسەڵات گرتنە دەستی بۆ خۆش بووەو هەر ئەوانیش ڕووداوەکانیان تۆمارکردووە، دیارە ئایدیۆلۆژیای دەسەڵات خوازی خۆیان لەحەقیقەت وتن پێ باشتر بووە، یان بابڵێین ئاسایی دەسەڵات شەرعیەتێك بەرەفتاری خۆی دەدات کە ڕاستیەکان ناپارێزێتو گوناهە گەورەکان بەخۆی ڕەوا نابینێت، دیارە دروستیو نادروستی تۆمارەکانیش بەپێی کۆمەڵگاو هەلومەرجە کلتووریو تێگەیشتنی تەواو لەئەرکی قۆناغەکانو خودی مێژوو جیاوازیان هەیە. مەبەستمە بڵێم نووسینەوەی مێژوو لەکۆمەڵگایەکی شارستانیا جیاوازە لە نووسینەوەی مێژوو لەکۆمەڵگایەکدا کە لە قۆناغی سەرەتایی یان وەحشەتگەریا بێت، هەروەها ئەبێت ئەوەیش لەبەرچاو بگرین کە هەندێك لەڕووداوە مێژووییەکانی میللەتێك لەلایەن کەسانێکەوە تۆمارکراون کە دژی خودی میللەتەکە بوون. دیارە ئەم حاڵەتە بۆ گەلانی ژێر دەستە خەتەرناکو شێواندنی ڕووی ڕاستەقینەی ڕووداوەکان بووە، یان ئەوانە لەئاسایی ترین هەڵوێستا بێلایەن نەبوون، هەندێك جار ئەو جۆرە تۆمارانە بوونەتە ڕاستیەك لای خەڵکانی تر و وەك ڕەگی گوڵی بە هەر چالاکیەکی ئەو گەلانەوە ماوەتەوە. نموونەی ئەم حاڵەتە بۆ کورد زۆرە، تەنانەت لای هەندێك لەو خۆرهەڵاتناسانەی کە بۆ گەشت یان بەنیازی تر ڕوویان لە کوردستان کردووە. بەداخەوە کە ئارشیفی کورد خۆیشی بەردەوام خاڵی بووە. بۆیە تۆمارکردنی بەڵگەو دیکۆمینتەکان لەکاتو شوێنی خۆیانداو بەو گیانی بێلایەنیو شارستانیەوە قەناعەت بەخشو ڕووناکیەکی تەواو پێویستن بۆ دەرئەنجام گیریو دۆزینەوەی لایەنە شاراوەو گوم بووەکانو، کەرەسەیەکی بەنرخیشن بۆ ئایندەی مێژوو، جا بۆ سیاسەت بێت یان بۆ کاری ئەدەبیو داهێنانی دی.

کتێبی لەتاریکیەوە بۆ ڕووناکی کە کۆمەڵێك بەڵگەنامەن لەسەر شۆڕشی ساڵی 1880ی شێخ عوبەیدوڵای شەمزینی یەکێکە لەو بەرهەمە بەنرخانەی کە بۆ مێژووی هاوچەرخمان گەورەترین سەرچاوەو ڕاست ترین بەڵگەنامەن. چونکە نە دوژمن نووسیونیو نە کەوتۆتە بەر بۆچوونو بەرزیو نزمی هەڵچوونەکانی تاکە کەسێکەوە، ڕووداوەکان وەك خۆیان تۆمارکراون، ئەوانەیش کە تۆماریان کردووە یەکەمیان عەقڵێکی شارستانیان هەبووەو دووەمیش ناچار بوون ڕاستیەکان وەك خۆیان باس بکەن چونکە نوێنەری دەوڵەتێك بوون کە دەوری لەناوچەکەو کارەساتەکاندا هەبووەو تاڕادەیەکیش -وەك سیاسەت- بێ لایەن بووە. من بێگومانم ئەگەر ئەو بەڵگانە لەلایەن تورکێك یان ئێرانیەکەوە تۆمار بکرانایە، یان خودی ئەو دوو دەوڵەتانە لەسەر ڕاسپێری خۆیان باسیان لێ بکرایە حەقیقەتی ئەو شۆڕشە دەخرایە ژێر زبڵی درۆ و بوختانەوەو ڕووە گەشەکەی تاریك دەکرا، ڕووداوەکانیش لەوە تراژیدی تر دەبوون کە ئێمە لای خۆمان وێنای دەکەین. بێگومانم تەواوی ئەو شۆڕشە دەکرایە شەڕی تۆڵەسەند لەشیعەو مەسیحیو ئەرمەنیەکان.

لەکاتێکدا کە ئاشکرا –وەك لەبەڵگەکاندا هەیە– شێخ خۆی پارێزگاری لەو بەهایانە دەکاتو دەیەوێت بیانگرێتە لای خۆی، هەروەها دەکرایە بزاوتێکی یاخیگەرانە بۆ راوو رووتو جەردەیی. بەڵام بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوەی گوزارشت دەرەکان تا ئەندازەیەکی زۆر پێچەوانەی ئەو راستی شاردنەوەیەن حەقیقەتەکان وەك خۆیسانو فاکتەری سەرکێشی هەر بەنیازە پاکەکەوە ماوەتەوە. هەموو ئەوانەی کە بەدوای رووداوەکانەوە بوون ویستوویانە لەرێگەی بروسکەو نامەو رای خۆیانەوە گوزارشت بکەن، وڵاتەکەیان لەمەترسی هەڵەی سیاسی بپارێزن، هەموو ئەو نوێنەرو لێپرسراوە ئینگلیزیانە (کلایتن، گرانڤیل، بلانکیت، تومسن، گۆشن، ترۆتەر) جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە مەبەستی سەرەکی لەشۆڕشەکە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیو رزگار کردنی ئەو میللەتەیە بەزوڵمو سیاسەتی هەردوو ئیدارە نەخۆشەکە:

*(من لەو باوەڕەدام کە –شێخ– پلانێکی بەربڵاوی هەیە بۆ یەکخستنی هەموو کورد لە وڵاتێکی سەربەخۆدا بەسەرۆکایەتی خۆی، یەکەم شت هەلومەرجەکان سەرنجیان بۆ لای کوردستانی ئێران راکێشاوەو، هەوڵئەدات حکومەتی ئێرانی ناچار بکات وەك فەرمانڕەوای کوردەکان ئێران دانی پیا بنێت، پاشان لا ئەداتەوە بۆ ئەم تەرەفەو هەوڵ ئەدات مافەکانی لەتورکەکان وەدەست بێنێت.* ل58 رای کابتن کلایتن بۆ مەیجەر ترۆتەر)

*(شتێکی بەڵگەنەویستە کە بەنفوزترین کەس لەرۆژهەڵاتی کوردستاندا شێخ عوبەیدوڵایەو شەخسی خۆیو دەسەڵاتی لەناو کوردەکانی سنووردا زۆر لەوەکانی سوڵتان پیرۆزترە، گومان لەوەدا نیە کە ئامانجی ئەم پیاوە رزگارکردنی وڵاتەکەیە لەکاربەدەستانی سوڵتانو، دانانی خۆی بە حوکمداری کوردستان کە پێك هاتوە لەبەشێکی باشووری وانو بەشێکی باکووری ویلایەتی موسڵو زیاتریش بەهەموو لایەکدا ئەوەندەی کە بتوانێت نفوزی فراوان بکات.* ل29 رای مەیجەر ترۆتەر بۆ مستەر گۆشن).

*(ئێستا شێخ هیچ نهێنیەکی نەهێشتووەو لەسەنیازەکانی، پرۆژەکەی ئەوەیە کە خۆی بەسەرۆکی ئەمارەتێکی کوردی دابنێتو هەموو کوردستانیش لەتورکیاو ئێراندا بلکێنێت بەیەکەوە.* ل84 رای ئابۆت بۆ مستەر تومسن).

چاکە هەر لێرەدا بۆ روونکردنەوەی رووی گەشی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵای شەمزینیو لادانی هەر خەوشێك کە بیەوێت لەگەورەییو نیازپاکیو دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی کەم بکاتەوە، چەند پەرەگرافێك لەنامەیەکی خودی شێخ بنووسینەوە:

*(گەلی کورد کە زیاتر لە 500 هەزار بنەماڵە پێك هاتووە، میللەتێکی تایبەتیە، مەزەبیان لەمەزەبی ئەوانی تر جیاوازەو، یاساو نەریت، خووو رەوشتی تایبەتیان هەیە، لەناو میللەتاندا بەنەتەوەیەکی زیان بەخشو کەللە رەقو درِناو دەبرێن، بەو جۆرە باسی کوردستان کراوە، گەر یەکێك لەناویاندا کردەوەیەکی نارەواو ناشیرینی لێ بوەشێتەوە، ناوی هەزارەها پیاو چاكو بێوەیی پێوە لەکەدار دەکرێ. با لاتان ئاشکرابێت ئەم هەموو سیفەتە خراپانە لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانیو ئێرانیەوە بەخۆرایی بۆ کوردستان دروست کراونو هەڵبەستراون، چونکە*

کوردستان لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدایەو، هەردوو حکومەتەکەیش ئەوەندەیان لەبارا نیە چاکو خراپ لەیەکتر جیابکەنەوە.. حکومەتی عوسمانی دیسان وەك ئێران یان خۆی لەپێش خستنی ئەم میللەتە گێل دەکات، وەیا بەچاوێکی نزمەوە سەیری دەکات، هەمیشە کوردستان بەخراپ ناوبراوەو بەسووکی سەیر کراوە، جیاوازی ناکرێت لەنێوان خەڵکانی بێ‌وەیو شەڕانیدا، سەرۆکو بەڕێوەبەرەکانی کوردستان، جا لە رەعیەتەکانی عوسمانی یان ئێرانیو هەر هەموو دانیشتوانی کوردستان خۆیان یەکخستووەو گەیشتوونەتە ئەو بڕیارە کە چیتر لەتوانادا نەماوە لەژێر سایەی ئەو دوو دەوڵەتەدا بژینو، پێویستە شتێك بکەن دەوڵەتە ئەوروپاییەکان، وا لێبکات لەمەسەلەکە وردببنەوەو لەدۆخەکەمان تێ بگەنو بپرسنەوە، ئێمەیش میللەتێکی دابەش کراوین، ئێمە دەمانەوێت بەڕێوەبردنی کاروباری خۆمان بەدەست خۆمانەوە بێت.. ئەو مافانەمان هەبێت کە میللەتانی تر هەیانە، سەبارەت بەخەتابارەکانیش، ئێمە ئامادەین ئەوە بگرینە ئەستۆی خۆمان (بەڵێن ئەدەین) کە ئازارو زیان لەهیچ میللەتێك نەکەوێت.

ئەوەیە ئامانجی ئێمە.. بۆ ئەوەی لەدۆخی کوردستانو وردببینەوەو بپرسنەوەو هیچ خراپەیەك روونەدات، دەنا سەرتاپای کوردستان مەسەلەکان دەخەنە دەست خۆیانەوە، چونکە میللەت لەتوانایدا نەماوە خراپەو چەوساندنەوەی بێ‌وچانی ئەو دوو دەوڵەتە هەڵبگرێت. ل 86-87 نامەی شێخ عوبەیدوڵا بۆ دکتۆر کوچران).

شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵا تێك شکاو وەك دەیان شۆڕشی ترمان ئاشبەتاڵیان لێ کرد، ئەوەی گرنگە بۆ تۆمارکردن نیاز پاکی سەرانی شۆڕشەکەو تێگەیشتنێکی بابەتیانەی ئەوسای مەسەلەی کورد بووە لەلایەن شێخەوە، ئیتر هۆی شکستەکە فاکتەری ناوەکی بووە یان دەرەکی، ئەشێ لەخوێندنەوەی وردی کتێبەکەدا ئەنجام گیربکرێتو باسی ئێرەی ئێمە نیە. بۆ پێناسەکردنی ئەو شۆڕشە تەنیا ئەم پەرەگرافەی کاك نەوشیروان مستەفا، بەسە کە لەپێشەکیە کورتەکەی ئەم کتێبەدا نووسیویەتی:

(شۆڕشی ساڵی 1880 ی کورد بەسەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵای شەمزینی جێگایەکی تایبەتی هەیە لەمێژووی نوێی کوردا، هەر بۆیە هەموو ئەوانەی لەسەر مێژووی نوێی کوردیان نووسیوە، چ کوردو چ بێگانە، لەسەر ئەو شۆڕشانەیان نووسیوەو، زۆربەیان بەسەرەتای دەست پێکردنی قۆناغی نوێیان داناوە لەبزووتنەوەی رزگاری گەلی کوردا، شۆڕشەکە ئەگەرچی لەچەند مانگێ زیاتری نەخایاندوە، بەڵام لەسەردەمی خۆیدا گرنگیەکی ئەوەندە گەورەی هەبووە، تەنگو چەڵەمەیەکی قووڵی لەنێوان "دەرباری قاجاری" لەتارانو "بابی عالی" لەئەستەموولدا خولقاندوەو، حکومەتەکانی بەریتانیاو رووسیا بایەخێکی زۆریان پێداوەو، هەواڵو زانیاری زۆریان لەسەر کۆکردۆتەوەو...).




# "چەکو چیا" یاخود دوورگە لەبیرکراوەکان

ناوی کتێب (چەکو چیا)- رۆمان
*نووسینی: جێمەس ئۆلدرج*
*وەرگێڕانی: نەجیبە ئەحمەد*
*چاپی یەکەم: 1999*

**ئاکۆ کەریم مەعروف**

ئەگەر (طاهر بنجلون) لەرۆمانە بەناوبانگەکەیدا (پیاوە تێکشاوەکە) لە تەنها پەرەگرافێکدا ئازارو مەینەتیەکانی گەلی کوردی خستبێتە روو، ئەوا (جیمەس ئۆلدرج) رۆمان نووسو کەسایەتی ناوداری ئینگلتەرە توانیوێتی لەدووتوێی کتێبێکی گەورەی (406) لاپەڕەیدا کە دابەش کراوە بەسەر (39) بەشدا هەریەک لەو بەشانە زنجیرەی رووداوەکان دەبەستن بەیەکەوە. زۆر بەوریاییو وردەکاری‌یەوە هەوڵی ئەوەی داوە لەزۆر خاڵی حەساسی کێشەی کورد بداتو ئەو گەمە سیاسییە گەورانەی کە لەودیو دیوارە تاریکەکانەوەن نەخشەیان بۆ دەکێشرێت بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان وەک رایەڵێک کە پەیوەندی راستەقینەی هەیە بەهەموو ئەو رووداو و کارەساتە گەورانەی کە چ لەرابردوودوا یاخود لەئێستاو ئایندەشدا بێ لەناو ئەو گەمانەداو دووبارەو چەند بارە دەبنەوە، ئیدی گەلی کورد لەم نێوەندەدا ئەو دوورگە خەمناکەیە کە لەچاوەڕوانی کەشتی‌یەکدا بێ باری ئازادی تێدابێ.

لەراستیدا لێرەدا ناکرێ باسی رووداو کارەساتەکانی ناو چەکو چیا بکەم چونکە پێم وایە رۆمانێك بەگەورەیی و وردەکاریەکانیەوە ئەرکی خوێنەر خۆیەتی بەشوێن یەك یەکی رووداوەکان و هەڵچوونی حاڵەتەکان بکەوێت وە خوێنەری وریاو شارەزا خۆی شوێن پێی کارەکتەرەکان دەکەوێ. جا هەر لەبەر ئەو روونکردنەوەیە بووە پێم باش نەبوو کورتەی رۆمانەکە لەم رانانە کورتەدا بخەمە بەر دیدەی خوێنەران.

نەجیبە ئەحمەد وەرگێڕی رۆمانەکە لەدەستپێکی رۆمانەکەدا دەڵێ "ئۆلدرج لەم رۆمانەدا ئەوەندە شارەزای وردەکارییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردەواریەو ئەوەندە بەمیللەتی **کورد ئاشنایە، خوێنەر هەست** ناکات نووسەرێکی بیانی ئەم رۆمانەی نووسیبێ، چونکە دەستی خستۆتە سەر دۆست و دوژمن و هەرچی ئەو کاولکاری و ماڵوێرانیەی شەڕی براکوژی، کردوویەتیە ناسنامەی کورد، لای گەلانی دوورو نزیك، ئەوەشمان بۆ روون دەکاتەوە کە داهاتوو هەمیشە بۆ رۆڵە نەبەزەکانی گەلە، ئەوانەی لەپێناوی خێروخۆشی وڵات و نەتەوەدا خۆیان بەخت ئەکەن).

ئۆلدرج لە 1918/7/10 لەوڵاتی بەریتانیا لەدایك بووە لەساڵانی 1939-1945 بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیەوە لەزۆربەی بەرەکانی شەڕدا کاری رۆژنامەنووسی هەواڵنێری کردووە. کاریگەری ئەم جەنگە وێرانکاریە بەسەر رۆمان و نووسینەکانیدا رەنگی داوەتەوە تائەوکاتەی جەنگ لەهەر کوێیەك بێ وەك ئەرکی ئەخلاقی نووسین دژایەتی هەموو ئەو کاولکاری و خوێن رشتنانەی کردووە کە میللەتە زل هێزەکان لەبەرامبەر میللەتە داماو و کلۆڵەکاندا لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا نەخشەی خوێناوی بۆ دروست **دەکەن تاوەکو لەو رێگایەوە** لەدەرگای هیچ کەسێك نەدرێ بۆ هاوارێك، بەتەنها دەرگا تاریکەکانی خۆیان نەبێ، هەڵبەت رۆمانێکی بەو جۆرە قەبارە گەورە وزەو توانای زۆری دەوێ لەکاتی وەرگێڕاندا، نەجیبە ئەحمەد توانیویەتی لەئەنجامی ئەزموونی چەندین ساڵەی وەرگێڕانەوە بەو ئەرکە قورسە هەستاوەو ماندوو بوونی پێوە دیارە، نەجیبە ئەحمەد لەکۆی رووداو و بەسەرهاتەکانی ناو رۆمانەکە هەوڵی ئەوەی داوە بەزمانێکی کوردی سادەو ساکار هەروەك ئەوەی گیانی کوردی بکات بەبەردا کارەکەی زۆر بەسەلیقەو وردەکاری گۆڕیوەتە سەر زمانی دایك، بەجۆرێك کە هیچ گرێ و گۆڵەیەك لای خوێنەر دروست نەکات.

لێرەوە دەستخۆشی لە نەجیبە ئەحمەد دەکەم کە وەرگێڕانی رۆمانەکەی هێندە بەچێژە کەوای لێکردم دوای یەك بەیەکی وشەو رستەکان بکەوم تاوەکو بزانم جیمەس ئۆلدرج چیمان پێ دەڵێ و لەناو ئەو دوورگە لەبیرکراوانەدا چ مانایەکی تازەمان بۆ ژیان پێ دەبەخشێت. هەروەها سوپاس بۆ ئۆلدرج کە لە رستەیەکی پڕ لەمانادا پێمان دەڵێ: سەد ساڵە **ئێوە هەروان لەناو هەراو** هوریای تاریکەشەودا دەژین وابڕوات سەد ساڵی تریش هەمان کارەسات دووبارە دەکەنەوە هەروەك چۆن لەکۆماری مهاباد دووبارە بووەوە.




# دواڕۆژی عیراق

**نووسەر: عەبدولوەهاب حەمید رەشید**

*لە بڵاوکراوەکانی: دار المدى للثقافة والنشر*

**چاپی یەکەم سالی** : 1997

**خوێندنەوەی پۆڵا احمد**

بێگومان ئەگەر بمانەوێت دەوڵەتی عێراقی بەباشی بناسین دەبێ بێ ئەم لاو ئەولا لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە عێراق هەڵسەنگێنین کە بە چ قۆناغێکدا تێپەڕیوە لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و سەربازییەوە، هەروەها چ جۆرە دەسەڵاتێك لە عێراقدا کاریگەری و پێشکەوتنەکانی قۆزتۆتەوە و خستوویەتیە خزمەت خۆیەوە عێراقی گەشەسەندن و پێشکەوتن لە رووی کشت و کاڵی و نەوتەوە کە کەم وڵات لە جیهاندا هەبووە بەقەدەر دەوڵەتی عێراقی توانای هەبێ لەسەر پێی خۆی رابوەستێ و بە پێنجەمین دەوڵەت لە دنیادا لە رووی سەربازییەوە بژمێردرێ. لەبەرئەوە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای ئەو بنەماو پێك هاتانە و هەروەها کێشەی کورد چ رۆڵێکی هەبووە شان بەشانی ئەو گۆڕانکارییانە و دەوڵەتی عێراقی چۆن مامەڵەی لەگەڵ کێشەی ئەم نەتەوەیەدا کردووە، لەگەڵ ئەو شارستانیە دێرین و کۆنەی کە عێراقی لەسەر بنیات نراوە کە میزۆپۆتامیا بە لوبی ئەو شارستانیەتە دادەنرێ هەروەك چۆن لێکۆڵەرەوەیەکی سویدی بەناوی (TORE ZETTOR HOLM) تۆری زیتەر هۆڵم دەڵێ:

شارستانیەتی میزۆپۆتامیا سۆمەرییەکان و بابلییەکان تەنها کۆنترین شارستانیەتی مێژوو نەبووە بەڵکو ئێمە خۆمان لەو شارستانیەتەدا دەبینینەوە ئەفسانەکانمان هەتا سیمای نیشتمانی و ئاینەکەشمانی تیا بەدی دەکەین. زۆر لە تێڕوانین و پاشماوەکانی ئەغریقیەکانو جوولەکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم شارستانیەتە پێش 1500 ساڵ لە سەردەمی ئەقلیدس و هۆمیرۆس دا. ئەقلیدسی یەکەم داستانی مێژوویی نوسیووە لێرەوە حیکایەت و چیرۆك و ئەفسانەکان دەرکەوتن. هەر لە شارستانیەتی بابلی و سۆمەرییەکانەوە کە سەرچاوەی چیرۆکەکانی بەهەشت و **چیرۆکی قابیل و هابیل و تۆفان بووە ئەویش لە هەستی ئاینیدا** دەرکەوتووە. سۆمەرییەکان یەکەم کەس بوون کە مرۆڤایەتیان لە چاخی بەردینەوە پێش خست، هەروەها هەر ئەوانیش یەکەم جار مەعدەنیان بەکارهێنا و زمانی نووسینیان داهێنا بەربەست و قەناتیان بۆ کشتوکاڵ دروست کردووە و سەعاتیان دۆزییەوە کە 60 دەقیقەیەو هەر دەقیقەیەکیش 60 سانیەیە. سۆمەریەکان مامۆستای ماتماتیك بوون بۆ عەرەب و ئەفریقیەکان چیرۆکی خۆشەویستی داستانی قارەمانانەیان نوسیوە. هەروەها نامەیەکی خۆشەویستی یان بۆ مرۆڤایەتی جێهێشتووە که بۆ (5) هەزار ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێتەوە و شان بە شانی ئەمە شارستانیەتی عێراقی کۆن یەکەم دەستکەوتی کە ناوداره بە ناوی داستانی "گەلگامیش"ەوە کە بۆ 2000 هەزار ساڵی سۆمەریەکان دەگەڕێتەوە و هەروەها لە رووی شەریعەت و یاساوە شەریعەتی حامورابی بە بناغەو پێشینەی هەموو شەریعەت و یاساکان دادەنرێ کە ئەویش بۆ دانان بووە بە **عەدالەتدا و سەرکەوتن بەسەر** شەڕو فەسادا و پاراستنی بێدەسەڵاتەکان و لاوازەکان بووە لە بەهێز و دەسەڵاتدارەکان. هەروەها معامەلاتی عەقار و حقوقی زەوی بەکرێ گرتن و قەرزدان و سوود وەرگرتن بووە و کاری گەشت و گوزار و کاروباری بازرگانی و کاروباری پارە و پاراستنی موڵکایەتی تایبەتی و مەسەلەی هێزی کرێکار و زەواج و تەلاق و خێزان بووە. یاساکانی حامورابی کاریگەری لەسەر یاسای رۆمی کرد ئەمەش پاکی و راستی یاسایی دەرخستووە کەچی لە عێراقی هاوچەرخدا قازی و یاسا تووشی ساختەکاری و درۆ هاتوون و شایەتی درۆ لە دژی بەرهەڵستکارانی سیاسی ئەدەن.

هەر ئەم لێکۆڵەرەوە سویدییە دەڵێ: دوای ئەوەی سەردانی عێراقم کرد ئەو دەشتە کشتوکاڵییەی کە لەکاتی میزۆپۆتامیادا هەیبووە. هیچی نەماوە ئەمەش پەیوەندی بە رووخانی بەغداوە هەیە کە لەسەردەستی "هۆلاکۆ" ی مەغۆلی بووە ماوەی (7) سەدە لە تاریکایدا ژیان (1258-1932) ئەمە دوای ئەوەی کە **هێرشی عوسمانیەکان دەستی** پێکرد تاوەکو کۆتایی ساڵی (1918) ی خایاند کە عێراق خرایە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکانەوە، ئەوەبوو شەریف حسەین شەریفی مەککەیان کردە مەلیکی عێراق لەدوای ئەوەی پەیماننامەی بەریتانیا و عێراق مۆرکرا لە ساڵی 1922 دا. کە ئەویش دانان بوو بە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە

عـێراقدا هـەر بـەپێی یاسـای هـەڵبژاردن یەکـەم کۆمەڵـەی تەشریعی پێك هات لە ساڵی 1924 دا هـەروەها بـۆ تـەصدیق کردنـی ئـەو رێکەوتنامەیە بەریتانیا ترسـی هـەبوو بۆ لەدەست چوونـی شاری موسڵ گەڕاندنـەوەی بوو لەژێر سایەیدا بۆ نیشتمانی دایك کە عێراقـە هـەروەها جێگـەی کێشـە بـوو لەگـەڵ دەوڵـەتی تورکیـادا بـەڵکو دەکرێ بڵێـین لەژێر رکێفی تورکیابوو لە ساڵی 1925 قبـووڵ کـراو شـاری موسڵ گێڕدرایـەوە سەر عێراق لەگـەڵ ئـەوەی زۆربـەی بـیرە نەوتـەکانی شـاری موسـڵ بـەریتانیا بۆخـۆی سـوودی لـێوەرگرێ، ئەمە لەدوای نیـو سەدە بەپێچەوانـەوە دەسـتی پێکردەوە سەبارەت بـە عێراق دوای ئـەوەی کـە بـەرژەوەندی نیشتمانی چـووە ژێـر رکێفـی بیانییەوە بەهۆی بەردەوام مـل ملانـێی توندوتیـژی جـەنگی ناوخۆ لەنێوان حکومەت و هێزە نەتەوەیی کوردییەکان.

لە هەل و مەرجی سیستەمی سـەرکوت کردنـدا. ئەمـەش وای لە هێزی کوردی کرد کە قبووڵی یارمەتی شای ئێران و ئەمـەریکا بکات. سیستەمی عـێراق کەوتـە نـاو ئـەو تەڵەیـەی کـە رێکەوتنامەی جەزائیر مۆر بکات لە ساڵی 1975 دا بە تـەنازول کردنـی حکومـەتی عـێراقی لـە ئاوی شط العرب بۆ بەرژەوەندی شای ئێران.

بۆئەوەی عێراق مافی ئەوەی هـەبێ کـە دەسـت و پـێی بکەنەوە و بە هـەموو شـێوەیەك دژی هـێزە بەرهەڵسـتکارە کوردیەکان تـارادەی فـەوتان و لەناوچوونیان بەردەوام بێ. کـە لە سـاڵی 1936 عـێراق ئـەم مافـە سـەرکوت کەرانـەی بەدەست هێناوە.

هـەر لـەو سـاڵەدا بـوو کۆدەتای بەکر صدقـی روویدا و لە ساڵی داهاتووشدا کوشـتیان. بەسەرپەرشـتی چـوار سەرکردەکان صلاح الدین صباح و هاورێکانی کە بـەناوی رەشید عالی گەیلانییەوە بوو شۆڕشی راگـەیاند لـە جـەنگی جیـهانی دووەمدا عـێراق بێلایـەن بـوو کشـایەوە و شۆڕشەکەشـی فەشـەلی کـرد بـەهۆی هێرشـی بـەریتانیاوە بـۆ سـەر عـێراق دووبـارە سیاسـەتی کۆلۆنیـالی کردن دەستی پێکردەوە.

لـەدوای شـەڕی جیـهانی دووەمەوە رەشەبای دیموکراتـی زۆر وڵاتانی گرتەوە و زۆر پـارت دروست بوون و گۆڤار و رۆژنامە دەرچوون و بەشـداری ژیـانی سیاسـیان دەکـرد. ئەمـە درێژبـۆوە تـا رێکەوتنامـەی بـەغداد سـاڵی 1955 کـە (عـێراق، تورکیـا، ئـێران، ئەفغانسـتان، بـەریتانیا) وە و دەرئـەنجامی هێرشـە سـێقۆڵیەکەی "جوولەکـەو بەریتانیا و فەرەنسا" بۆ سـەر میسر لـە نەجـەف و موسـڵ و بەغدادا زۆر راپـەڕینی قوتابیـان سەریان هەڵدا.

دەسەڵاتی عورفی لە عێراقدا لە بـەرواری 1956/10/31 – 1957/5/27 هەستان بە دروست کردنێکی هاوپەیمانێتی سیاسـی بەرفراوان کە خۆیـان لەم پارتانەدا دەدییەوە. پـارتی نیشـتمانی دیموکراتـی، پـارتی سـەربەخۆیی حـیزبی شـیوعی عێراق لەگـەڵ حـیزبی بەعسـی عـەرەبی بـە تەنسـیق کـردن لەگەڵ ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لـەژێر نـاوی بـەرەی یـەکێتی نیشتمانی.

هەرچـەندە سـەردەمی کۆمـاری لـە عـێراق زۆر خـاڵی ئیجابی هەبوو کـە وڵاتـی عـێراق سەربەخۆیی سیاسی وەرگرت لە کۆتـایی نفـوز و باڵادەسـتی بەریتانی بەڵام هەموو کاتێك ئەو پرسیارە لەئارادا هەبوو ئـەویش نەبوونی ئەلتەرناتیفێکی گونجاو بـۆ دیموکراتیـەت. کـوردە

هاونیشتمانیەکانی عێراق بەردەوام داوای مافی نەتەوەیی خۆیان کردووە کە لە بیستەکانی ئەم سەدەیەوە بووە کاتێك عێراق ئینتیدابی بەریتانی بووە بەریتانیەکان یەکەم دەوڵەت بوون کە هێزیان لەبەرانبەر کوردەکانی عێراقدا بەکارهێناوە بە فرۆکە گوندەکانیان بۆردومان کردووە لە دوای ئەمە شۆڕشی کوردی دەستی بە شۆڕشی چەکداری کردووە لە ساڵی 1931 – 1932 – 1943 بەڵام لە ساڵی 1958 کۆمارییەکان لاپەڕەیەکی نوێیان لەگەڵ بزوتنەوەی کوردیدا هەڵدایەوە ئەویش ئەوەبوو زیندانە سیاسیە کوردەکانیان بەردا و داوای برایەتی کورد و عەرەبیان کردووە هەروەها لە ساڵی 1961 دا لە 99٪ ی نەوتی عێراقی خۆماڵی کرا بەڵام ئەمەش زۆری نەخایاند ئەم برایەتیەی کورد و عەرەب کاتێك کوردەکان داوای کردنەوەی قوتابخانە و بەشی خۆیان لە نەوتەکە دەکرد شەڕ دەستی پێکردەوە تاوەکو ڕاگەیاندنی بەیاننامەی 11 ی ئازاری ساڵی (1970) هەروەها بە هاتنی و کۆدەتای ساڵی 1968 ی بەعسیەکان کە دەسەڵاتیان گرتە دەست، هەموو حیزبەکانیان پاکتاو کرد ڕێگەی تاکە حیزبی و دیکتاتۆریان بۆ خۆیان هەڵبژارد. ئەوەی دەستی ببردایە بۆ سیاسەت حوکمی خیانەتی بەسەردا دەدرا و ئیعدام دەکرا.

بەم شێوەیە ئەزمەیەکی دەسەڵات کە زیاتر توند و تیژ و بێ رەحمانە هەڵس و کەوتی دەکرد هەموو شتێکی هەر بە سەرکوت کردن چارەسەردەکرد، ئەوە هەر لە بەعسیەکاندا ئەو تایبەتمەندیە هەیە. دیارە هەر بەمەشەوە نەوەستا کوشتن و برین و لەناوچوون ئەتوانین بڵێین لە ساڵی 1980 وە زیاتر توندی بەخۆوە دیوە ئەوەبوو شەڕی کوردستانیان تەنانەت بە چەکی قەدەغەکراو کرد کە کیمیابارانی گەلەکەمان بوو کە زۆرینەی ئەو قوربانیە لە هەڵەبجەی شەهیددا دەبینرا هەر لەم ساتەدا و لەم شەڕە کاول کارییەدا شەڕی ئێران عێراق کە درێژکراوەی ساڵی 1980 بوو بۆ 1988 ئەوەش بۆ خۆی کاول کاریەکی تری بەسەر گەلی عێراقدا هێنا.

ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی فاو ئەوەی دەرخستووە کە عێراق لەچاو ساڵەکانی چلەکاندا و سەردەمی ئێستادا کە خەڵکی عێراق پشت بەخۆی دەبەستێ زیاتر لە حکومەت بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خۆی هەروەها سەبارەت بە ئازاردانی هاوڵاتیان "ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی" لە ساڵی 1985 دەریخستووە کەوا دەسەڵاتی عێراق زیاتر لە "30" جۆر ئازاردان بەکاردەهێنێ لە دژی هاوڵاتیان.

هەر بەم پێیە ئەو ئەزمەیەی کە لە عێراقدا لەسەر دەستی "صەدام" و جەللادەکانی دەستی پێکردبوو کەڵەکە ببوو لە هەردەم و ساتێکدا بوایە چاوەڕێی تەقاندنەوە بوو چونکە توندوتیژی سیاسی بەردەوام بوو سەرکوت کردن و شەڕی ئەهلی و دۆزی کوردی و کۆچ پێکراوان و کۆچ کردووان و بەرهەڵستکاران و پارتە سیاسیەکان پەیوەندیەکانی دراوسێ و گەڕاندنەوە بۆ دواوە ئەمانە عێراقی تووشی قەیرانێکی مەزن کردبوو. شەڕی ئێران – عێراق کە عێراقی خاوەن (192) بلیۆن لە ماوەی 1968 – 1990 ی تووشی لە 10٪ ی قەرزی نەوتی کوێت بووە کە ڕاپۆرتەکان ئەوە دەردەخەن کە عێراق لە ساڵی 1984 دا زیاتر لە 14 ملیار دۆلار تەنها تەقەمەنی کڕیوە کە

ئەمەش نیوەی ئەو بەرهەمە نیشتمانییەیە کە عێراق هەیبوو لە مەوادی خام وەکو نەوت.

هەر لە دوای وەستانی شەڕی ئێران – عێراق، کوێت بڕیاریدا لە لیژنەی ئۆپیک کە بەشە نەوتی خۆی زیاد بکات لەسەر ئەساسی دەرهێنانی بیرە نەوتەکانی (رومێلە) ئەمەش زیانێکی گەورە بوو بۆ عێراق چونکە عێراق لە 90٪ دا پشتی بە نەوت دەبەست زیانی ئەم زیاد کردنەی کوێت سالانە دەگەشتە (7) ملیار دۆلار کە پێویست بوو عێراق قەرز بداتەوە دیارە دابەزینی نەوتی بەدوادا هات.

سەدام ئەم پێشنیارەی کوێتی بە خیانەت و گالتە پێکردنی عێراق لەقەلەم دا. عێراق توشی خنکاندن دەبوو.

هەر لە دوای راگرتنی شەڕی ئێران عێراق ئەمەریکا راگەیاندنەکەی عێراقی بە پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ لەقەلەم دا. چونکە سەدام پێشتر نامەیەکی بۆ ولاتانی عەرەبی ناردبوو لە نامەکەدا وا هاتبوو ئەوەی پێویستە لە کەنداوی عەرەبیدا زال بێ دەولەتی عێراقە نەك ئەمەریکا، دەولەتی میسر زۆر تەنگاو بوو بوو بەم نامەیە چونکە سالانە ملیۆنێ دۆلاری هاریکاری لە ئەمەریکا وەردەگرت. ئەوەبوو سەدام بە بۆنەی یەکەمین سالڕۆژی دامەزراندنی لیژنەی هاریکاری عەرەبی سالی 1990 دا چووە عەمان و پێشوازی لێکرا لەلایەن مەلیك حسەینەوە زۆر بە توندوتیژی قسەی کردبوو وتبووی:

دەبێ رەسیدی نەوتمان کەم بکەینەوە بۆ زیاتر هێز خستنە سەر سیاسەتی ئەمەریکی و ئیتر رێگاو جێگای تر نەماوە بۆ ترسنۆکەکان کە دەلێن ئەمەریکا هێزی جێبەجێکەر و ئەمە تەنها مل دانەواندنە و هیچی دیکە نیە هەر لەوکاتەدا حوسنی موبارەك لە ئاهەنگەکەدا دەبێ و دێتە دەرەوە چونکە بە هێرشێکی دەبینێ بۆخۆی هەرچەندە مەلیك حسەین ئەلێ ئەمە تێنەگەیشتنە لە یەکتری حوسنی موبارەك هەر سووردەبێ و دەگەڕێتەوە ولاتی خۆی هەر لەدوای ئەمە بە دوو هەفتە بەرپرسیارێکی کوێت لە عەممان ئەمەی راگەیاندو وتی:

صەدام تەنها داوای ئەو دوو دوورگەیە لە کوێت ناکاتەوە کە هەیە بەلکو کوێتی بە تەواوی دەوێ ئەمە لەکاتێکدا کە هیچ هێزێکی سەربازی عێراقی لە سنووری کوێتدا نەبوون. دیارە لەئاکامی ئەو سەرکێشیانەی عێراق بۆ داگیرکردنی کوێت لە سالی 1990 دا بۆ زیاتر زۆرپێهێنانی عێراق لیژنەی ئاسایشی نێودەولەتی بڕیاری سەبارەت بە عێراق دەرکرد ئەویش لە بواری قەدەغەکردنی بازرگانی دەرەوە و هێنانی شت و مەك و معامەلە نێودەولەتیەکان و گەشتە ئاسمانیەکان. ئەمە بەردەوام بوو لە دوای شەڕی کەنداو بۆ کشاندنەوەی لە کوێت کە لیژنەی ئاسایشی نێودەولەتی بڕیاری (687) ی دەرکرد بۆ وەلام دانەوەی نظامی عێراقی و راوەستانی شەڕ لەگەل چاودێری کردنی لیژنەی چەکە کۆمەل کوژییەکان لە عێراق. هەروەها سەدام بە داگیرکردنی دەولەتی کویت توانی 20٪ ی نەوتی جیهانی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە هەروەها شان بەشانی قەیرانی کەنداو کە لە داگیرکردنی دەولەتی کوێتەوە هەنگاوی ناوە گەلەکەشمان لە باشووری کوردستان لەتاو دام و دەزگا و زولم و زۆری بەعسیە فاشیەکان کە صدام هەناسەی لەبەر بڕابوو لە ئازاری سالی 1991 دا توانیان راپەڕین

بکەن و سەرجەم دام و دەزگاکانی بەعس تێك بشکێنن. پرسیارێك لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە ئایا لەژێر سایەی بەڕێوەبەرایەتی کوردیدا ئامانجی سەربەستی مافەکانی کورد بەدەست هاتوون، لە ساڵی 1991-1994 راپۆرتێکی رێکخراوی نێودەوڵەتی کە مەیدانییە پێشێل کارییەکانی مافی مرۆڤی کوردی لەژێر دەسەڵات دارانی کورددا دەست نیشان کردووە و هەر ئەو راپۆرتە دەڵێ زۆربەی کوردەکان هەست بەوە دەکەن گەشتونەتە کۆتاییەکی داخراو ... ئەوان رزگارکراون لە وەهمی هاوپەیمانەکان و وەهمی سەرکردەکانیان هەروەها بەرزکردنەوەی شیعاری فیدراڵیەت بەهاریکاری ئەمەریکا بووە ئەمە بەبێ بۆچونمان لەسەر فیدراڵیەت. هەتا ئەو ئاستەی رێکەوتنەکانی نێوان دەسەڵاتی عێراقی و بەرهەڵستکارە کوردەکان بەپێی ئامۆژگاری ئەمەریکا کۆتایی هاتووە.

هەر بەپێی راپۆرتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە تیایدا هاتووە هەرچەندە هێزە خۆرئاواییەکان تەداخولی عێراقیان کردووە رایان گەیاندووە چارەسەرێکی سیاسی بۆ عێراق بدۆزنەوە بەڵام واقع زۆر بەپێچەوانەوە بووە. چونکە زۆربەی بەرهەڵستکارانی عێراقی دەڵێن مانەوەی دەسەڵاتی سەدام لەسەر حوکم پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکاوە لەناوچەکەدا.

یەکێك لە کارمەندەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ:

بەرهەڵستکاری شیمانەیەکی زۆر کەمە لەم هەل و مەرجەدا لەبەرئەوەی خەڵك پێویستە لەسەریان کە بیر بکەنەوە چۆن پێداویستییەکانی ژیانیان چنگ بخەن لەجیاتی تێکۆشان لەپێناوی دیموکراتیەتدا. دیارە ئەو گەمارۆیەی کە خراوەتە سەر عێراق پێشێل کارییەکی **تەواوی مافەکانی گەلی عێراقە، چونکە گەلی عێراق تا ئێستاکە** بەدەست ئەم ئابلۆقە ئابوورییەوە دەناڵێنن. هەر بەهۆی کەم خۆراکییەوە سێ ملیۆن و نیو لە خەڵکی عێراق تووشی مەترسی بوون کە 1580000 منداڵ و 230 هەزار ئافرەتی سك پڕ کە دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی منداڵ ئەمە سەرەڕای **فەسادیەکی زۆر کە بڵاوە، هەر** لە ساڵی 1990 دا (826560) کەس لە بۆرژوازی مام ناوەند بەهۆی دارمانی وەزعی ئابورییەوە تێك شکاون. کەچی یەکێك لە کارمەندەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ:

(ئێمە قاچیان دەشکێنین و دوایی دار شەقیان دەدەینێ)

هەر سەبارەت بە پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ لە عێراقدا لەلایەن دەسەڵاتی عێراقییەوە تووشی بوون هەڕەشەکردن لەو خێزانانەی راگوێزیان کردوون و ئەندامانی خێزانەکانیان بەرەو رووی جۆرەها شکڵ و شێوەی ئازاردانی جەسەدی و جنسی و کوشتن دەبوونەوە ئەو خێزانانەی کە تەسلیم بە دەسەڵات دژی نابن ئەوا منداڵەکانیان دەفراندن کە تەمەنیان 10 – 14 ساڵە.

ئەمە لە راپۆرتەکانی رێکخراوەکانی مافی مرۆڤدا دەردەکەوێت سەرباری شێواندنی گیانی مرۆڤەکان ئەوەی دزیکردبێ یاخود راکردووبێ لە سەربازیکردنی سەدام وەکو برینی گوێچکە یاخود سوتانی بە ئاگر ئەمەش لەژێر یاسای دین دا بەڕێوە **دەچێ هەروەها برینەوەی قاچ ئەگەر پارەی سپکردنی نەبوو**

ئەو کەسە کەیفی خۆیەتی هەر بەبێ سرکردن بۆی دەبڕنەوە. دیارە لە بەرانبەر دەسەڵاتی سەدام هێزە بەرهەڵستکارە کوردی و عەرەبییەکان یەکگرتوو نین و بە پەرش و بڵاوی کاریان کردووە ئەمە لە هاوتای سەدامێکدا کە لە 10٪ ی کۆی چەکی جیهانی کڕیوە و دەریش کەوتووە کە زیاتر لە 208 کۆمپانیای بیانی چەکی کوشندەیان بە سەدام فرۆشتووە وەك کۆمپانیای ئەمریکی و بەریتانی و فەرەنسی و ئیتالی و سویسری و نەمساوی و بەلجیکی و ئیسپانی و ئەرجەنتین و یابان و پۆڵەندا و هۆڵەنداو سوید و هند و بەرازیل و مۆناکۆ.

ئەمەریکاش لە ڕێگەی کۆمپانیا بچووکەکانەوە چەکی بۆ عێراق ناردووە بێگومان چەند پێشنیارێك هەیە کە نووسەر عەبدول وەهاب بۆ پاشەڕۆژی عێراق دیاریکردووە ئەویش وەك وازهێنان لە مەفهوومی تاکە پارت و دەست بە سەراگرتنی دەسەڵات هەروەها قبوول کردنی سەربەستی گشتی و مافەکانی مرۆڤ و باڵادەستی یاسا و فرە لایەنی سیاسی و ڕێکخراوەیی و چاکردنی حیزبی بەعس لە سەرکوت کردنەوە بۆ دیموکراسیەت و لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی دەزگای موخابەرات بەم پێیە پاشەڕۆژی عێراق بەرەو ڕووناکی و ئاسۆیەکی روون بڕوات بەڵام من پێم وایە پاشەڕۆژی عێراق گرێدراوە بە ئێستاوە کە پەیوەستە بە فەشەلی سیستەمەوە، فەردو نوخبە لەژێر سایەی ئەو مەرگەساتەدان کە بەسەر وڵاتی عێراقدا هات و هەروەها هەیکەلی ئەو دەسەڵاتەی عێراق کە لە بناغەدا لەسەر توندوتیژی دامەزراوە پێناچێت کە بتوانرێ چاکسازی تیابکرێ چونکە سەرتاپای ئەو دەسەڵاتەی عێراق بە دام و دەزگاکانیەوە نەخۆش بوون و هەلگری ڤایرۆسی توندوتیژی سیاسی و خوێن مژینن لەبەرئەوە ئالیەتی جێبەجێکردنی ئەو دەسەڵاتە کە بەرەو دیموکراتیەت بچێ لە خودی ئەو دەسەڵاتەدا کارێکی هەروا میکانیکی و ئاسان نییە پێشم وانییە کە بەو ئاکارەدا ئەو دەسەڵاتە بتوانرێ گۆڕانکاری تیا بکرێ گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کوردمان لە سایەیدا مافە نەتەوەییەکانی تیا بەدەست بهێنێ و ئاسایش و پاراستنی تەواو بکەوێتە ناوچەکەوە بەتایبەتی.

# Sardam

**Foreign culture magazine**

No. 6. Dec. 1999

Concessionaire:
**Sherko Bekas**

Editor-in – chief :
**Raoof Begard**

Editing Director :
**Azad Berzinji**

Editorial Staff :
**Rebeen Hardi**
**Shwan Ahmed**

Art production work :
**Kader Meerkhan**




Sardam Printing & Publishing House